



گیران و فرێدانە كوچە تاریك و ئینفرادییەكانی زیندانەوە لەبەر دینداریو ئیسلامەتی نەبووە، بەڵكو تەنها دوو خاڵ لە پشت گیرانی كاك ئەحمەدەوەیە ئەویش :[1]

١- لێپرسراوی حیزبی دیمكراتی كوردستان لە تاران .

٢- لێپرسراوی پەیوەندی نێوان حیزبی دیمكراتی ئێران و توركیا.

ئەو هەموو ڕووبەڕووبونەوەو تەحەمول و دان بەخۆداگرتن و زانیاری نەدركانەی كاك ئەحمەد، كە زیاتر لە(شەش) دانە مانگ بەردەوام دەبێت، لەبەر كوردایەتی و نەتەوەكەی دەبێت، لەبەر ئامانجێكە كە لەپێناویدا سەروماڵی دانا.

[1]) كاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەكەم ، زستانی ١٣٨٦،لا گ گ

# تەوەللودی دووبارەو موفتی زادەی نوێ[٢]

كاك ئەحمەد، دوای ئەوەی دەچێتە زیندان و لە ئینفیرادی توند دەكرێت و دەخرێتە ژێر ئەو هەمووە ئەشكەنجەو ئازارەوە، ئەشكەنجەو ئازارێك كە(د.عەلی شەریعەتی)دەڵێت" لە زیندانی(ساواك)دا هاوارو ناڵەی ئەشكەنجە دراوان بەتایبەتی لە شەودا بەجۆرێك بوو قابیلی تەحەمول نەبوو، شەوانە حاڵێك كە لەو زیندانەدا هەرچی تێدایە دەگاتە سنوری شێت بوون و خۆراگری پەرت دەبێت ....لە زیندانەدا هەموو پەیوەندییەكانی مرۆڤ، لەگەڵ دەرەوەی خۆیدا دەپچڕێت، بەجۆرێك ئەگەر بتەوێت وێنەی ژن ولامندالەكانت بێنیتەوە بەرچاوی خۆت ناتوانیت، یان قەدو باڵای دایكت بێنیتەوە یادت ناتوانیت، تەنانەت ناو و دەربڕینی وشەكانیشیانت بیرناكەوێتەوە...."[١].

موفتی زادە لەناوا حاڵێكداو لەناوا زیندانێكدا بۆ جارێكی دیكەو بۆ هەمیشەیی ئەستێرەی بەختەوەری هەڵدەبێت، وەك مەولەوی تاوگۆزی دەڵێت:

**هەركەس تەوەللود دووبارەش نییەن**

**ئەڵبەت سەعادەت ستارەش نییەن**

لەوێوە دووبارە لەدایك دەبێتەوەو بەوردی لەحاڵ و وەزعی خۆی و میللەتەكەی ڕادەمێنێت و ئەو وانانەی سەرداری مرۆڤایەتی(محمد)(ﷺ ) فێری دەكات ڕای دەچڵەكێنێت، و بۆ دواجار دەیخاتەوە سەر هێڵی فیترەت و هیدایەتی خۆی.

---

[١]) شا.لامعی: حکایت های از زندگی دکتر شریعتی(اجتیماعات اسلامیات-کویریات)، چاپی پێنجەم، ١٣٨٤، تهران .ل ١٦٤

ئەو ڕووداوانەی لەو زیندانەدا بەسەر(کاك ئەحمەد)دا ڕوو دەدەن گۆڕانکارییەکی وا قوڵی لەسەر دروست دەکەن لەکاتی (مەرەخەس)* بوونیدا ئیتر ئەو ئەحمەدەی پێش زیندان نابێت، واتە ئەو ئەحمەدەی پێش زیندان دەگیرێت زۆر جیاوازە لەو ئەحمەدەی دوای ئازاد دەکرێت.

جیاوازی نێوان ئەو دوو ئەحمەدە هێندەی جیاوازی نێوان ئەو دوو سەعیدە دەبێت (سەعید نورسی) پێ دەناسرێتەوە، واتە(سەعیدی کۆن و سەعیدی نوێ)کە خودی(نورسی) لەزۆر شوێنی کتێبەکانی خۆیدا ئاماژەی بۆدەکات، لێرەدایە دەکرێت بۆ(کاك ئەحمەدی)ش هەمان پلەبەندی و دابەشکردن دابنرێت و ناوی ببرێت بە(ئەحمەدی کۆن و ئەحمەدی نوێ).

کاك ئەحمەدی موفتی زادە، دەربارەی ئەو گۆڕانکارییە فیکری و دەروونییەی لەزینداندا بۆی پێشهات و سەرلەبەری زیندەگی گۆڕی، لە شیعرێکدا دەنوسێت:

در آن جایکی درس آموختم          کز آن یك جهان فهم آموختم
شدم زان به وزع جهان آشنا          به صدها رموز نهان آشنا

---

*) مەرەخەس لە زمانی کوردیدا بە مانایی ئازاد بورن دێت، بەلاّم دیارە قوڵی و فراوانی کاك ئەحمەد لە بەکارهێنانی چەمکەکاندا شتێکی چاوەڕوانکراوە، یەکێك لەو وردەکارییانەی کاك ئەحمەد لە بەرکارهێنانی چەمکەکاندا کاری لەسەر کردووە، بریتییەلە بەرکارهێنانی چەمکی (مەرەخەس) لەبەرامبەر چەمکی (ئازادبورن) لە زینداندا، واتە ئەو لە یەکێك لە پەیامە کۆتاییەکانی دوای مەرەخەس بوونی لە زیندا بە هاوەلاّن و ئامادەبووانی دەڵێت، ئێوە وشەی ئازاد بوونم لە زیندان بۆ بەکارمەهێنن، چونکە ئازاد بورن بۆ کەسێك بە کاردێت کە زیندانی بێت، بەلاّم من ڕاستە لەڕووی جەستەییەوە زیندانی بووم لە ناو چوار دیواردا، بەلاّم لە ڕووی رۆحییەوە ئازادی ئازاد بووم!! لەبەرئەوە ئێوە دەکرێت وشەی مەردخەس) بەکاربهێنن، چونکە ئەم وشەی زیاتر بۆ ئەوە بەکاردەهێنرێت کەلە ڕووی جەستەییەوە کەسێك سنوردار بکرێت، بەلاّم ئازادبورن بۆ گیراوێکە کە لە ڕووی رۆحی و جەستەییەوە گیرابێت!!

(ئاماژە بۆ ئەوەش بکەم، لە کتێبی دووەمدا لە باسێکی تایبەتیدا دەربارەی کۆیلەو کۆیلایەتی و جارییە زۆر ورد قسەی لەم بارەیەوە کردووەو ئەوەی ڕونکردۆتەوە،کە زیندانیکردنی جەستەو ئازادکردنی فیکر زۆر گەرەییە، بەلاّم ترسناك و بەلا ئەوەیە مرۆڤ لە ڕووی جستەوە ئازاد بێت و لە ڕووی زیهن و رۆحەوە زیندانیکرابێت....)

بفهمیدم امراض این نسل چیست     فریبندەی مردم سادە کیست

واتە:

لەوێدا وانەیەکی وا فێربووم     لێیەوە، یەك جیهان تێگەیشتن فێربووم.

بەهۆیەوە لە بارودۆخی جیهان ئاشنا بووم،     بەسەدان رەمزی شاراوە ئاشنا بووم.

تێگەیشتم، نەخۆشییەکانی ئەم نەوەیە چییە، هەڵخەڵەتێنەری خەڵکی سادە کێیە.

کاك ئەحمەد، دەربارەی ڕووداوەکانی زیندان دەڵێت"ئەو ئەیامی ئەوەڵە کە لە زیندانی ئینفرادی بووم گۆڕانێك لە دەروندا ڕوویدا، کە خاڵی دەستپێکردن بوو، بڕێك فکرم کردەوە لەڕابردووی خۆم،-پێموایە زۆر مەسەلە هەیە هێشتا پێمخۆش نییە سەریح و ڕۆشن بیگێڕمەوە-. مەجموعەن تەماشام کرد ڕابردوویەکی زۆر خراپ و ئالودەم هەیە، گوناهاتی مونقەتیع و پەراگەندەی زۆر، بەلاَم دوو گوناهی بەردەوامم بوو، کە یەکێکیان ئیقتیصادی(ئابوری) بوو، بە تەئویل دڵی خۆم خۆشکردبوو-خۆم ڕازی کردبوو-، دەرامەتی دەفتەری ئەسنادی ڕەسمیم دەخوارد،- واتە پارەی ئەو نوسینگەیەی خواردووە، کە ئیشەکەی بریتیی بووە لە فرۆشتن و بەکرێدانی خانووبەرە، ئەو لە بەرچەند هۆیەك بە حەلاَڵی نەزانیوە بۆخۆی-، نوسینگەیەکم بەڕێوەدەبر کەهی خزمێکمان بوو، بەڕێوە بردنی بەدەست من بوو*، دڵم بەوە خۆشبوو کە کاری من جیاوازە لە نوسینگەکانی دیکە، من لێرە سەنەدی فزولی نانوسم و نەقصی حساب و پارەی زیادە لەخەڵك وەرناگرم و...ئا بەوجۆرە تەئویلم دەکرد بۆ خۆم، تەماشام کرد و لە زیندان فیکرم کردەوە(باج) لەخەڵکی

*) دیارە کاك ئەحمەد پێش ئەوەی زیندانی بکرێت لە(تاران ) یەکێك لە کارەکانی دیکەی بریتی بووە لەکارکردن لە نوسینگەی ( املاك و ئەسناد)،دیاری بۆ یاران، ل ی ی

وەردەگرم و دەیدەمە دەوڵەت و لەبەرامبەر ئەم باجەدا وەریدەگرم خۆم بەشێك دەخۆم، بە تەئویل دڵی خۆمم بە دەرامەتێکی پیس و خراپ خۆشکردبوو.

لەم لاشەوە شاری(تاران) موحیتێکی ڕووت و پیس و بەرەڵاو فاسدو ...منیش مورەتەب و ڕێك و پێك لەناوشاری تارانا هاتووچۆ، لەگەڵ ژنی ڕووت و بەرەڵا دەکەم!! تەماشام کرد ئەمە دوو سیلسیلە گوناهە جەرەیانی هەیە.

بەڕاستی لەسەرەتاوە شەرمم هات تۆبە بکەم، سەیرمکرد پڕ ڕووییە!!! (تۆبە)-داوای لێخۆشبوون- لەبەرامبەر میقدارێك گوناهەوە دەکرێت، من ئەو هەمووە گوناهەم هەیە هەر بڵێم تۆبەو ئیتر تەواو دەبێت؟!

هەرپێم نەدەکرا بەینێك(دوو، سێ) ڕۆژێکی بەسەراچوو هەروا وورده وورده قورئانم دەخوێند زیاد لەنوێژەکان کە نوێژی عادەتیم ئەنجام دەدا، قورئانم دەخوێند، دەمووت بزانم شەهامەتی تۆبە پەیدا دەکەم.... نەك شەهامەت لەبەرئەوەی نەوەك تۆبەکە ڕانەگرم(تۆبە بشکێنم)! خەتەری مەرگ و زیندەگی ئەمنییەتی نییە، ئینسان لەوێ(زیندان) زۆر جوان دەبێتە موسوڵمانێکی باش، چونکە مەرگ لە دارو دیواری ئەوارێت! ئینسان هەست دەکات دەمرێت. نەوەلا شەهامەتی ئەوە بەو هەموو خەتاوە، چۆن بڵێم خودا ببەخشە؟!

ئاخری جارێکیان بڕیارمداو ڕوومکردە خوای خۆم و ووتم"خوایە بێ ئەدەبیە ئەما دەیڵێم، بەزاتی خۆت، ئەگەر هەر ئێستا جێ گۆڕینەوە بکەین و من ببمە(خوا)و تۆ ببیتە(بەندە)، و بێیتە دەرگام و تۆبە بکەیت دەرت دەکەم، بەڵام خوایە دەزانم تۆ زۆر گەورەیت، تۆ لەمن زۆر بەڕەحم تریت، با ئەگەر من بوومایە وام دەکرد، ئومێدم هەیە دەرم نەکەیت، ئەگەر تۆبە بکەم ... هەرچەندە تۆبە کردنم هیچ منەتی نییە، (چونکە ئەم زیندانە) مەرگ لە دار و دیواری ئەوارێت. لایەك نەماوە





دۆستایەتی لەگەڵ بکەم، جگە لای تۆ، ئەگەر تۆبە نەکەم چیبکەم؟! هێشتا هەر بەڕەحمی و دەزانم لەوانەیە تۆبەم قبوڵ بکەیت، ئەگەر وابێت خوایە تۆبەم.

ئێستا ئەوەی هەر بەموشکیلە مابێتەوە لەلام، مەسەلەی ئەو دەرامەتە حەرامە بوو، بۆیە پێمخۆشبوو ئەوەی وا لەدڵما هەیە بەزمان بیلێم با زۆرتر موعەقەدبێت، با باشتر پابەندبم پێیەوەو بێ وەفایی نەکەم، تۆبە شکێنی نەکەم، عەهد(پەیمان) شکێنی نەکەم، عیبارەتێکی ئاوام ووت لە قەزییەی دەرامەتی حەرامەوە "خوایە پەیمان بێت، ئەگەر ببینم(حمە ژیان) لەبەرچاوم لە برسێتیا دەمرێت، پارەی حەرام نەدەم بەشیری وشك و بیدەمێ، چونکە لەووەختا حدودی تەقریبەن(٨، ٩، ١٠) مانگ بوو، تەقریبەن شیری وشکی دەخوارد، لە هەموو شتێك لە تەعەلوقاتی دنیا خۆشەویست تربوو بۆم"، بەڕاستی هەروایشی کرد، تەواوی تەمەنی(کاك ئەحمەد)، بریتیە لە ڕوویەڕووبوونەوە بۆ نەشکاندنی ئەو پەیمانەی بەخوای خۆیدا، هەر لەم کتێبەی لەبەردەستدایە هەندێك لەو هەڵوێستانە دەخەینە ڕوو، یەکێك لەو کارانەی کە لەم ڕووەوە کردوویەتی، لەگەڵ ئەوەی ئەو پارەیەی دەیبەخشێ حەرام نییە، بەڵام ئەو شتەی بەپارەکە دەیکرێت بەحەرامی دەزانێت، تەنانەت ئامادەنەبووە، ئەگەر(حمە ژیان) بە بەرچاوییەوە گیانی دەرچووبێت ئەو کارە بکات، خۆی دەیگێڕێتەوە لەو وتارەی لە شاری(مەریوان) پێشکەشی دەکات دەربارەی (بەهائییەکان)، لەوێدا باسی دەکات، شەوێکیان(حمە ژیان) زۆر نەخۆش دەبێت، زۆر دەرمانخانە دەگەڕێت بۆئەوەی دەرمانێکی بۆ بکرێت و بەشکوم کەمێك چاك بێت، بەڵام دوای گەڕانێکی زۆر دواتر پێی دەڵێن، کاك ئەحمەد تەنها یەك دەرمان خانە هەیە بەم شەوە کرابێتەوەو ئەو دەرمانەی هەبێت، ئەویش دەرمانخانەی(فلانی جولەکەیە)، بۆیە دەڵێت، ئەگەر(حەمەژیان) بە بەرچاومەوە بمرێت نارۆم ئەو

دەرمانە لەو جولەكەیە بكڕم و بیدەم پێی، چونكە هەر بەو پارەی من دەیدەمێ دەڕوات دەیداتە گوللەو برا(فەلەستین)یەكانمانی پێ شەهید دەكات*.

بۆ ئەم كارە ناكات؟ دیارە كڕینی ئەو دەرمانە لەو پیاوە جولەكە، بەحەرام دەزانێت، دەی كەوابوو ناكرێت حەرام بداتە منداڵەكەی، چونكە پەیمانی بەخودا داوە. ئاوەها پێداگیری لەسەر ئەو پەیمانە كردبوو، وەك خۆی دەڵێت"ئەگەر خۆشەویستترین خۆشەویستی دنیا لەبەینی مەرگ و زیندەگیدا بێتو بەدەرامەتێكی حەرام زیندوو ببێتەوەو ڕزگاری ببێت لە مەرگ توخنی حەرام نەكەوم، تەصمیمێكی ئاوام گرت"[1].

موفتی زادە، هەر لەگەڵ لەدایك بوونەوەی لە زیندانداو تۆبەكردنی بەوجۆرە مەكۆی شەیتانی ناخی لەت وپەت دەكات و لە ڕیشكا هەڵدەكەنێت، هەروەك خۆی لە شیعری (ڕێی ڕاس و دروسی خزمەت)دا[2] دەڵێت:

**دوژمنانی دەر نەوچەی شەیتانن**

**لە بەرانبەرەكەی خۆی بشێوێنن**

**ئەر لە ژور مەكۆی شەیاتین تێكدەی**

**لەسەرت زاڵ و زۆر دار نەمێنن**

**دوژمنانی دەر لەت لە تەنیشت كەن**

**ناتوانن: سەرت پێدانەوێنن**

بەڕاستی كاك ئەحمەد، لە زینداندا بەتەواوی مانا ئەم شیعرەی خۆی جێ بەجێ كردووەو ئەوەی پێی بلێیت، داواكاریی و شوێنگەی شەیتان و نەفسی پەس، لەناخ

---

*) ئەم وتارە لە كتێبی(٢)دا بلاّو كراوەتەوە.

[1]) كاسێتی ئەمانەت

[2]) كاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەكەم ، زستانی ١٣٨٦،لا ٧٤





و دەرونی خۆیدا دەریکردووە، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی(شەش مانگ) زیاتر بەرگەی زەبرو ئازارو نارەحەتییەك بگرێت. کە شەریعەتی ووتەنی"ناوی ئازیز ترین کەسی خۆتت لەبیر بەرێتەوە". ئەو ئەشکەنجانەی دەسەلاّتدارانی(شاه) داویانە، مەگەر دیکتاتۆرێکی وەك(سەدام) بەسەر میللەتی کوردیا هێنابێت، هەر کاك ئەحمەد خۆی لەباسێکدا ئاماژەی بۆ دەکات، کە دەسەلاّتی(شاه)، فلاّنە کەسیان لەسەر کوردایەتی لەناو ڕۆنی داخکراودا سزاداوە، بەلاّم پیاوی وا ئەوشتانە نایترسێنێت، چونکە مەکۆی شەیتانی لەناخیدا هەلّکەندووە، ئیتر دوژمنان، ئەگەر لەت لەتیشیکەن ناتوانن سەری پێدانەوێنن.

بەفیعلی هەتا کۆچی دوایی هیچ کەسێك نەیتوانی لەبەرنامەو عەقیدەو بڕیارەکانی خۆی لایبدات و سەری پێدانەوێنێت و لە بابەتێك ببورێت، جا چ بابەتی دینی بێت یان بابەتی نەتەوەیی، خۆی لە یەکێك لەو چاوپێکەوتنانەی کە لە دوای سەرکەتنی ئینقلابەوە ڕۆژنامەی(کەیهان) لەگەلّیدا ئەنجامی دەدات، دەلّێت"بەهیچ شێوەیەك سەرفی نەزەر لە خودمختاری بۆ کوردناکەین"، دیارە ڕۆژنامەکە ئەم وتەیە دەکاتە(مانشێت)ی سەرەکی چاوپێکەوتنەکە!

ڕووداو و بەسەر هاتەکانی ژیانی کاك ئەحمەدی موفتی زادە، لە زیندانداندا هەر بەردەوام دەبێت و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕووداوی سەیرو سەیر تر ڕوودەدات، بە جۆرێك بۆ خۆیشی جێگەی تێڕامان و سەر سوڕمانە.

"جارێکیان دوای چەند خەوێکی سەیر هەم خۆم و هەم برێك لەو کەسانەی لەزینداندا بوون دەیانبینی، لەخەوما دیسان تەماشادەکەم منداڵێکی نزیکەی(١٢-١٣)ساڵ دەبم، حەزرەتی رسول الله(ﷺ) تەشریفی لەسەر ئەژنۆ دانیشتووە، پەنجەی شایەتومانی دەستی ڕاستی خەریك بوو بەسەر قورئانەکەدا

دەیگێڕا. ئەو لاپەڕەی کە دەکەوتە لای دەستە ڕاستییەوە-منیش زۆر مندالانە هەردوو ئانیشکم نابوویە سەرشانی پێغەمبەر(ﷺ)، لەلای شانی چەپیەوە هەردوو ئانیشکم نابوویە سەرشانی، هەر وەك چۆن مندالْ لەگەلْ باوکی خۆیا دەیکات، ئا بەوشێوە منالانە ئانیشکم نابوویە سەر شانی موبارەکی، دیقەتم دەکردو خەریك بوو دەرسی قورئانی پێدەوتم، خولاسە(زۆربە کورتی)، ڕۆژ بوویەوە زۆر لەم خەوە لەزەتم دەبرد، تا ماوەیەك بەو خەوەوە وەك سەرخۆش مەست بووبووم. ئا بەوجۆرە ئەو خەوەو چەندین خەوی دیکەم بینی، ووتم دەی خوایە شوکر بۆ تۆ من کەی لایەقی ئەوەم هەیە، پێغەمبەر(ﷺ) دەرسی قورئانم پێ بلێت؟! شوکر بۆ تۆ خوایە دیارە تۆبەکەی قبولْ کردووم".

یەکێکی دیکە لەو خەوانەی کاك ئەحمەد لە زیندانی( قزل قلع) دەیبینێت، کە خۆی دەلێت، یەکێکە لە خەوە زۆر گرنگەکان کە دیوومە، ئەو خەوەیە کە ئیمامی شافیعی(سەلامی خوای لێبێت) دەچێتە خەوی و لەخەویدا دەربارەی(عەدالەت) دەرسێکی پێدەلێت، دوای زەمەنێك تێدەپەڕێت بەسەر ئەم خەوە مژدە دەرو فێرکاریانەدا کاك ئەحمەد وورده وورده ژیانی بە تەواوەتی بەرەو گۆڕان دەڕواتو هەر لەوێوە دەستدەکات بەقسەکردن بۆ ئەو زیندانیانەی لە گەلێدان و دەربارەی چەندین بابەتی دینی و دنیایی قسەیان بۆ دەکات و دلنەوایی ئەو زیندانیانە دەداتەوە کە لەڕووی دەروونییەوە بەرەو ڕووخان چوون، لە وێوەیە کاردەکات بۆ چارەسەرکردنی ئەو چینایەتییەی لەهەموو ڕوویەکەوە کۆمەلگای ئێرانیو دونیای ئیسلامی داگیرکردووە. دەستدەکات بە چارەسەرکردنی، ئەو ناکۆکی و جیاوازی و لێك تێنەگەیشتنەی لە نێوان(شیعەو سوننە)دا هەیەو بە ووتەی خۆی، دەسەلاتی شاو تەواوی دەسەلاتەکانی دیکە سودیان لێ بینیوە بۆ نانەوەی ئاژاوە لە نێوان




كۆمەڵگادا. هەوڵەكانی(موفتی زادە) زۆر بوێرانە بووە، لێرەدا دەتوانین ئەوە بڵێین (تەحسین حەمە غەریب) زۆر زیرەكانە توانیویە ئەم پیاوە لەڕووی(چاونەترسی و بوێرییەوە) بخوێنێتەوەو سەركەوتوانە كەشفی ئەولایەنەی(كاك ئەحمەد)ی كردووە، بەدڵنیاییەوە زۆر هەڵوێستی دیكەی(كاك ئەحمەد) هەیە لەڕووی ئازایەتییەوە، ئەگەر ببیستایە لەوە قوڵتر بۆی دەچوون.

"زۆر جەریئانە ویستویەتی ئەو جیاوازییە مەزهەبیە، بەڵكو دوو ئایینییەی نزیكەی(هەزارو چوار سەد) ساڵە لە نێوان شیعەو سوننەدا دروست بووە نەیهێڵێت، لانیكەم خۆی بەوجۆرە ژیاوە،هەروەكو ئامۆژگاری كوڕەكەی دەكات كەئەوانە (شیعە) برای تۆن. لەسەردەمی دەسەڵاتی(شاه)دا، لەگەڵ زۆرێك لەمەرجەع و كەسایەتی شیعەدا لە زینداندا بووە لەوانە، وەكو(بەنی صەدر) و (باهونەر) و ...هتد، كەدوای دەبنە دەسەڵات و كاربەدەستی گەورە لەكۆماری ئیسلامی ئێراندا، كە توانیویەتی ئەو هەستە برایەتییەی ئەم(كاك ئەحمەد)باوەڕی پێیەتی پیشانیان بدات، ئەمەش كارێكی ئاسان نییە"[1]. جگە لەوەی كاك ئەحمەد، هەمیشە دەرگای لەسەرپشت بووە بۆ هەر كەسێك لە شیعە مەزهەبەكان بێت و دانیشێت قسەی لەگەڵدا بكات، چەندین كاسێتی هەیە بە زمانی(فارسی)، گفتوگۆ كردنە لەگەڵ گەنج و ڕۆشنبیرانی شیعەدا لەسەر زۆر بابەتی ئەساسی و فیكری و فەلسەفی قوڵ.

ماجەراكانی ڕۆژانی زیندانی یەكەمی بەو جۆرە بەردەوام دەبێت، تـا ئەوەی لەشەوێكی تاریكی سجنداو لەو ژیانە پڕلە زەحمەتەدا دووبارە خەوێكی پڕ لە نهێنی و ئامۆژگاری و فێربوون دەبینێت"زەمەن گوزەریا، تاچەند شەوێك دوای ئەوە، لە خەوما پێموابوو، لە سەربانی ماڵی قەدیمی خۆمان لە(سنە) وەستاوم، وا دوو ئینسان بەرەو ڕووم دێن، من لەلای گۆشەی باشوری خۆرئاوای سەربانەكەوە وەستا بووم، ئەوانیش لەلای باكوری

---

٢٧) بڕوانە، تحسین حمە غەریب: دوایینەكان،٢٠٠٧ چاپی یەكەم ، ل ١٩٧







خۆرهەلاتی سەریانەکەوە دەهاتن.... هاتن ڕووبەڕووم، بەلاّم وەك حالەتی ئاسایی بەشەر نا، یەکەم هەر دووکیان یەك بالاّ، یەك جۆر جل، یەك ڕەنگ و یەك حالەت، دووەم بەهەنگاو نان نەدەهاتن، بەلکو بەشێوەی ڕۆشتنێکی بێ جولەی سافی، بێ هەنگاو دەهاتن. هاتن و من بە پێوە وەستا بووم و ئەوانیش بەو حالە بەپێوە وەستان، نزیکەی مەتر و نیوێکی مابوو بگەن پێم وەستان بەرامبەرم.

وتیان تەفسیری(**والضحى و الم نشرح**)مان بۆ بلێ، لەم خەوا گرم تێبەربوو دلّم ئەکولاّ، وەخت بوو وەك مەنجەلێك لەحالی تەقینەوەدا، ئاوا بتەقمەوە. بەدلێکی سەیرەوە دەستمکرد بە تەفسیر ووتن. لە شتێك کە دەمزانی لەخەوەکا، بەلاّم بەڕاستی خۆ نەمدەزانی، هەرگیز شتی وام نەزانی بوو!!

کۆمەلێك لەو ئەوزاع و ئەحوالّ و ڕووداوانەی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)و موسولّمانانم هاتەوە بەرچاو کەلە(شێوی ئەبوتالێب) بوون و دوور خرابوونەوە، هەموو ئەوانەم بە تەرتیب زانی، لەگەلّ ئەم دوو سورەتە کە لەکتێبە تەفسیریەکانی خۆماندانین، هەروەها ئەو پەیمانانەی لەقورئاندا هەن. {فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْراً ۞إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْراً }الشرح. وە ئەو لالانەوەو پاڕانەوانەی پێغەمبەر(ﷺ) لەخوای گەورە کە هیدایەتی(عومەری کوڕی خەتاب) بدات، هەموو ئەوانەم دەزانی بەبێ ئەوەی هیچ هەولێك بدەم و بیری لێبکەمەوە هەر لە زهنمدا بوون و دەم وتن، بەجۆرێك ئەو مەعلوماتانەم بۆدەهات و دەمووتن وەك ئەوەی بلێیت(٢و٢ دەکاتە ٤)، کە پێویستی بەفیکر کردنەوە نییە. زۆر بەکورتی، لەخەوەکا بە هەیەجان و کولێکی عەجیبەوە ئەوە وا لەدلّما بوو بەخەیالّ(واقعەن لە دلّما بوو)، بەلاّم لە خەبەریدا نەم بوو لە بارەی ئەم دوو(سورەت)ەوە ووتم.

بەلێ یەك و سوپاسێکیان لێکردم و هەروا، وەکو(نور) بێ خشەو جولە بەرەو دوا گەڕانەوە، کاتێك خەبەرم بوویەوە سەرم سوڕدەما، ئەرێ من کەی تەفسیری ئەم دوو سورەتەم زانیوە؟!!".

ئیتر حاڵەتی ئاگایی پەیدا بوو و تێگەیشتم، كە سوپاس بۆ خوا، ڕەحمەتی ئیلاهی بە وەسیلەی ئەو خەوەوە و ئەو دەرسەی پێغەمبەر(ﷺ) لەقورئان گۆڕیی"[1].

لێرە بە دواوە تێگەیشتنی(كاك ئەحمەدی موفتی زادە) لەقورئان دەگۆڕێت و مامەڵەو هەڵسوكەوتی، لەگەڵ قورئاندا دەبێتە مامەڵەیەكی زانایانەو بە هەموو وجودییەوە كار بۆ جێبەجێ كردنی دەرسە قورئانییەكان دەكات و قورئان دەكاتە سەرچاوەی بەرنامەكانی ژیان و بە وردی و زیرەكی خۆی تەفسیری تایبەتی ئایەت و سورەتەكانی قورئان دەكات، تێگەیشتنی كاك ئەحمەد لە قورئان ئەوەندە ووردو و قوڵ دەبێت، لە یەكێك لە كۆڕەكانیدا دەڵێت، ئەو زانستەی تا ئێستا مرۆڤایەتی پێیگەیشتووە بەپێی ئەوەی لە قورئاندا باسكراوە هیچ نییە!! بەڵكو زۆر شتی دیكە ماوە قورئان باسی دەكات و لە زەمەنێكی دیكەدا مرۆڤەكان پێی دەگەن.

ئەو گۆڕانكارییەی بەسەر ناخی موفتی زادەدا هات و گۆڕانكاری ڕیشەیی تێدا دروستكرد تا ئەو ئاستە دەڕوات، دانیشتنی ئەم موفتی زادە لە زینداندا ئەو موفتی زادەیەی پێش زیندان نییە، بەڵكو ئەم(موفتی زادەیەكی نوێ)یەو خوێندنەوەی قورئانی گۆڕاوە، خۆی دەفەرموێت"لەوە و پێش كە تەماشای قورئانم دەكرد هەروەك كەسێك كە مانای كەلیمەو جوملەی عەرەبی بزانێت لێی حاڵی ئەبووم، بەلاّم لەوەودوا سەیركردنم بۆ قورئان، وەك ئەوە وابوو سەیری مەوجودێكی زیندوو بكەم، سەیری ژیان بكەم، ئاوا سەیری قورئانم دەكرد"[2].

بەم جۆرە قوڵترو وردتریش لەمەی باسمان كرد، چونكە لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ كرد زۆر جەرەیان(ڕووداو)ی دیكە هەیە ڕوویانداوە، كە جگە لە خوای گەورە هەندێكی

---

[1]) كاسێتی ئەمانەت.

[2]) كاسێتی ئەمانەت.

خودی(كاك ئەحمەد)یش نایزانێت و هەندێكیشی تەنها خۆی و خوا دەیزانن و بۆ كەسی باس نەكردووە.

كاك ئەحمەد لە دایك دەبێتەوە و بەتایبەت خوای گەورە دەیخاتەوە سەر ڕێگەی هیدایەت. ڕێگەیەك تا دواساتەكانی تەمەنی خزمەتی كرد، ئەو خەو و دەرسە تایبەتیانەی مامۆستای مرۆڤایەتی(ﷺ) ئاواتێگەیشتنێك بە موفتی زادە دەبەخشێت، وەك خۆی ئاماژەی بۆ دەكات."ئەو دەرسە بەقەدەر عومری(سەد هەزار جار عومر بەقوربانی ئەو (یەك لەحزەیە)* بێت، ئەو لە حزەیە هەموو شتێك بوو بۆمن، ژیانم بەبێ ئەو تاقە دەرسە هەمووی پووچ بوو"[1].

بەم شێوەیە موفتی زادە ژیان لەزیندانی ڕژێمی شاهەنشاهی ئێران و(ساواك)دا دەگوزەرێنێت. تا ئەوەی ئەم خۆڕاگرانە هیچ قسەیەك ناكات و ئەوانیش لەوپەڕی ئازاری جەرگ بڕدا ئازاری دەدەن، بەجۆرێك یەكێك لە(كركراگەكانی) پشتی دەردەچێت، لەبەر ئەوەی ئەوەندە ئازاری دەبێت ڕاستەوخۆ دەیبەنە نەخۆشخانەی (سوپا)و لەوێ چارەسەری بۆدەكەن. دوای ئەو سزادانە لە ئازاردانی بێزار دەبن و لە زیندان ئازاد دەكرێت تەقریبەن لەساڵی (١٣٤٢-١٣٤٣)دا** دەبێت.

---

*) ئەو لەحزەیە، مەبەستی ئەو كاتەیە، كە لەخەودا پێغەمبەری تێدا بینیوەو وانەی تایبەتی پێ وتۆتەوە و شتی فێركردووە.

[1]) كاسێتی ئەمانەت.

**) لەساڵی دەستگیركردن و ئازادكردنیدا تێكەڵەیەك هەیەو، كاك ئەحمەد خۆی دەڵێت كۆتای ساڵی(١٣٤٢) گیرام، بەلام كاك حەسەن دەڵێت"ساڵی(١٣٤١) بووە(دیاری بۆ یاران)، ل(گ گ).




# ژنهێنانی کاك ئەحمەد

کاك ئەحمەدی موفتی زادە، لە ماوەی تەمەنیدا دوو ژنی هێناوە، ژنی یەکەمی ناوی(حەسیبە خانم)بووە، لە سەرەتای لاوێتیدا، کە هێشتا فەقێ بووەو لە گەرمەی گەڕان و عەودالێدا بووە بە دوای زانستدا دەی خوازێ.
لەگەڵ ئەوەی هەر لەسەرەتاوە(وادەردەکەوێت)، کاك ئەحمەد لەگەڵ ئەم ژن هێنانەدا نییەو بەباشی نازانێت لەم بارودۆخەدا ئەو خەریکی خوێندنە ژن بهێنێت، بەلاّم لەبەرئەوەی(حەسیبە خانم) خوشکەزای دایکی کاك ئەحمەدە، واتە(دایکی کاك ئەحمەد و دایکی خێزانەکەی خوشکن)، دایکی دەچێتە داوای و دەیدەنە کاك ئەحمەد، بەلاّم زۆری پێناچێت دەردەکەوێت، بابەتی یەك نین و بۆ یەك نابن دوای ماوەیەك لەیەك جیادەبنەوە، جا لەبەرئەمە کاك ئەحمەد لەو کاتەدا لەعێراق دەرس دەخوێنێت، ئەمەدەکاتە بیانوو و خێزان و خزمانی تێدەگەیەنێت، درێژە دان بەم ژن و مێردییە سودی نییەو ئەو(کاك ئەحمەد) ناتوانێت لەناوا بارودۆخێکدا خێزانی بەختەوەر بکات و بیبات بەڕێوە[1]، چونکە دیدگای موفتی زادە دەربارەی خێزان و خانەوادەو چۆنییەتی بەخێوکردنی منداڵ و پەروەردەکردنی بەجۆرێکە، کەم کەس هەیە ئاوابیر بکاتەوە، یاخود دەتوانین بڵێین هەر نییە، لەو کۆڕەیدا دەربارەی بابەتی خێزان و ژن قسەدەکات کۆمەڵێك بیرورا دەخاتە ڕوو، تا پێش ئەو کەسێکی وانییە-نەك بەرەهایی-بەو جۆرە بڕوانێتە خێزان و قسەی لەسەر بکات، هەندێك مەسەلە دەربارەی ژن و مافەکانیان و ئەرکی پیاو بەرامبەر بەژن و منداڵ باس

---

[1]) کاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەکەم ، زستانی ١٣٨٦، لای ی.





دەكات، تازە بە تازە لەم سەردەمەدا هەندێك كەس قسەی لەسەردەكەن و دەیوروژێنن، لەهەمان كاتدا بەبۆچوونی تازە ناویان دەبەن!

كاك ئەحمەد بەوانەی وا بیردەكەنەوە، كە كاری پیاو تەنها بریتیە لە بەخێوكردن و پارەپەیداكردن و بەیانی زوو چوونە دەرەوە بۆ پوڵ خڕكردنەوەو نیوەشەو گەڕانەوەو زوو خەوتنە، دەڵێت"ئەگەر كاری باوك و دایك تەنها بریتی بێت لە ناندان بەمنداڵ، ئەوە حەیوانیش نان(خۆراك) دەدات بە بێچووەكانی"*، بەڵام ئەو واسەیری دایك و باوك دەكات، بەتایبەتی(دایك) دەوڵەت دروستدەكات، چونكە پەروەردەكردنی منداڵ و پێگەیاندنی، بریتیە لە دروستكردنی دەوڵەت. پەروەردە كردن لەگۆشە نیگای موفتی زادەوە ئەرزشێكی وای هەیە، بە چەندین قۆناغ لە پێش فێركردنەوەیە.وەك مامۆستا ناصری سوبحانی دەڵێت"وەزیفەی ژن لەكۆمەڵگەی بەشەریدا وەك كاری بەرد تاشینە-چۆن كەسێك دێت بۆ دروستكردنی بینایەك سەرەتا بەرد ڕێك دەكات و دەیتاشێت و دواتر كەسێكی تر دێت و ئەو بەردانە لەشوێنی خۆیدا دادەنێت-ژنیش بەهەمانشێوە كاری ڕێككردنی تاكەكانە، واتە دروستكردنی فەرد فەردی ئینسانەكان، چونكە پەروەردەكردنی ئینسان لە قۆناغی جنین و منداڵیدا لەئەستۆی دایكدایە و لەو قۆناغەدا مەسیری دیاری دەبێت، دوایش هەر ڕێگەیەك دەگرێتە بەر هەنگاوی یەكەمی لەو قۆناغەدا هەڵگیراوە، یەعنی دروستكردنی فەرد فەردی ئینسانەكان لەئەستۆی دایكدایە، كە ئەمەش كارێكی وورد و گرنگە[1]، بۆیە كاك ئەحمەدیش بە ژنان دەڵێت، نابێت ئێوەی ژنان تەنها خەریكی ئەوەبن نان دروستكەن و قاپ و قاچاخ و جل بشۆن،

---

*) تەواوی ئەم باسە لە كتێبی(٢)دا بلاَوكراوەتەوە.

[1]) مامۆستا ناصری سوبحانی،تەفسیری سورەتی یونس، چاپی یەكەم، ٢٠٠٩، ل٢٤.

بەڵکو دەبێت برۆن بخوێننەوەو خۆتان رۆشنبیربکەن،ئەم بۆ چوونەشی لەباسی (ئینقلابی فەرهەنگی)دا زۆر بە روونی دەردەکەوێت و باسی دەکات، کاتێك پیاوێك تا بەو گەورەیە بروانێتە مەسەلەی(ژن)و خێزان رۆشنە هەرگیز ئامادە نابێت کۆمەڵێك کێشە هەیە لەنێوان خۆی و خێزانەکانیدا روویدات.

"حەسیبە خـــــانم، دوای جیابوونەوەی لەکاك ئەحمەد شوودەکاتەوەو ســــــاڵـــــی (١٣٨٦ ك.ھ)ی لەشاری(سنە)کۆچی دوایی دەکات،خوای میهرەبان بیبەخشێت"[1] .

ژنی دووەمی ناوی(خەدیجە)ی کچی(حاجی رەحمان ئاغای موهتەدی بۆکان)ە، خوشکی(عەبدوڵا و سەلاحەدینی موهتەدی). دوای ئەوەی کاك ئەحمەد، دەرواتە تاران و لەوێ لە زانکۆی تاران وانە دەڵێتەوە، لەگەڵ بنەماڵەی(موهتەدی) تێکەڵ دەبێت، (سلاحەدینی موهتەدی) لەو چاوپێکەوتنەی گۆڤاری(لڤین) لەگەڵی ئەنجام دراوە دەربارەی رۆڵ و کەسایەتی(کاك ئەحمەد) دەڵێت"من وەختێك بینیم، کە ئەو هات بۆ تاران و بەرگی مەلایەتی لەبەردا بوو، مەلایەکی گەنجی زۆر رۆح سوك و خوێن شیرین، تا بڵێیت بالا بەرز و قسە زان، زۆر زوو لەگەڵ باوکم ئاشنایەتی پەیداکرد، بەرلەوەی لەگەڵ من ئاشنا بێت، هەرچەندە ئەو تەمەنی بۆئەوە دەبوو لەگەڵ مندا ئاشنا بێت، بەلام بەهۆی هات و چۆی ئایینییەوە زۆر هات و چۆی باوکمی دەکردو لەگەڵ باوکم ئاشنابوو، زۆریشی خۆش دەویست... ئەم پەیوەندییە گەرم و گورەکارێکی وایکرد زۆر بچێتە دڵی باوکمەوە، کە خۆی دەیووت بە مامۆستاو باوکی خۆمی دەزانم و باوکیشم ئەوی زۆر خۆشدەویست، هێندەی کورەکانی خۆشی دەویست"[2] .

---

[1]) کاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەکەم ، زستانی ١٣٨٦، لای ی.

[2]) بڕوانە: چاوپێکەوتنی گۆڤاری لڤین لەگەڵ (سەلاحەدینی موهتەدی)ژ. ٨٠ لا ٢٩

جگە لە زیرەكییەكەی خۆی، زمانی شیرینی و خۆش مامەڵەیی كاك ئەحمەد، هەمووی بووبووە مایەی ڕاكێشانی(ئاغای موهتەدی)، خودی(حاجی ڕەحمانی موهتەدی) ئاشنایەتییەكەی زۆری هەبووە لەگەڵ بنەماڵەی موفتی زادە.

كاك حەسەنی ئەمینی، لە پێشەكی دیوانە شیعرییەكەی كاك ئەحمەددا، كەخۆی سەرپەرشتی كردووە و لەساڵی(١٣٨٦) لە (سنە) لەژێر ناوی(دیارییە بۆ یاران)دا چاپی كردووە، دەربارەی پەیوەندی هاوڕێیەتی(موفتی و موهتەدی) دەنوسێت"حاجی ڕەحمان ئاغای-موهتەدی-كەسایەتییەكی زانای ئایینی بووە. كە ئەوكاتە لەگەڵ باوكی كاك ئەحمەد لە تاران لە زانستگا-زانكۆ- مامۆستای فیقهی مەزهەبی ئیمامی شافیعی دەبێت، ڕەفیقی(حاجی ڕەحمان ئاغا) لەگەڵ بابی كاك ئەحمەد و وورپایی و لێهاتوویی كاكە ئەحمەدیش هانی ئەدات بیكاتە زاوای خۆی، ئەم پەیوەندییە پێكدێت"[1]. لەو ڕۆژە بەدوا، كاك ئەحمەد دەبێتە زاوای خۆشەویستی(حاجی ڕەحمانی موهتەدی) و ،(خەدیجە خانم) دەبێتە هاوسەری دڵسۆزو بە ئەمەكی كاك ئەحمەدو ژیانێكی پڕلە خۆشەویستی و دڵسۆزانە پێكەوە دەگوزەرێنن.

خۆشەویستی و وەفای كاك ئەحمەد بۆ دایكی تاقە كوڕەكەی(حمە ژیان)، كە لە ماوەی ژیانیا پێكەوە ئەو كوڕەیان دەبێت، بە ئەندازەیەكە لە زۆرێك لە كۆڕو باسەكانیدا بەنمونەی وەفاداری و خۆڕاگری باسی دەكات، چونكە كاك ئەحمەد هەمیشە وتویەتی ئەو كچی خێزانێكی دەوڵەمەند و خۆش ڕابوێر بووە، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا كەلە(دە) ساڵی كۆتایی ژیانیدا لە بواری ماڵییەوە لەڕادە بەدەر

---

[1]) كاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەكەم ، زستانی ١٣٨٦،لا ی ی





نەدار بووە، ئەو(خەدیجە) هەر بەقەناعەت و بەبێ–ئاه- هەڵکێشانێك لەو پەڕی ئارامیدا ژیان دەگوزەرێنێت.

کاك ئەحمەد، خۆی دەیگێڕێتەوە بەڕاستی دایکی(حەمە ژیان)، وەك من دڵسۆزانە تەحەمولی ئەوفشارە ئیقتیصادییەی دەکرد-کاك ئەحمەد لێرەدا باسی دوای ئازادبوونی زیندانی دەکات،-لەباسەکانی دواتردا لە بارەیەوە نوسراوە-. کارێکی وای نەدەکرد، هەتا دایکی خۆم، کە لەیەك حەوشەدا بەیەکەوە بووین پێی بزانێت، کارێکی نەدەکرد دایك و باوك و براکانی پێی بزانن، ئاوا موسوڵمانانە ڕیعایەتی ئەو ئەمانەتەی دەکرد. جارێکیان–پارەوێك لە حەوشەکا بوو کەدایکم لەوێوە تێپەڕی بوو(حەمە ژیان) لەو وەختا تەمەنی حدودی(٣-٤) ساڵ دەبوو، لەگەڵ دایکی بەحس دەکات دەربارەی(سێوێك) کە چەند ڕۆژە دایکی وەعدەی داوە بۆی بکڕێت– لەبەر بێ پارەیی– نەیتوانیوە بۆی بکڕێت، دایکم وردە وردە گوێ دەگرێت، ئیتر سەیر ئاگر بەردەبێتە دڵی، کە چۆن دەنکە(سێوێك) بۆتە مەسەلەیەکی موهیم! ئەم منداڵە بەچی ئاوات و تامەزرۆییەکەوە باسی دەکات و دایکیشی دڵی پڕ، ئەمما بێ ئەوەی دەری برێت، هەر بەوەعدە وەعدەو بە ئیستیدلالی جۆراو جۆر، دەیەوێ بەڵکو(حمە ژیان)قانع بکات و ئەو ڕۆژیشە ئەو سێوە نەکڕێت[1]، چونکە پارەیان پێنەبووەو نەیانتوانیوە تاکە سێوێکیش بکڕن.

خەدیجە، ئاوا ژنێك بووە لەو حاڵەدا هەموو توانای خۆی دەخاتە کار بۆئەمە منداڵێکی(٣-٤)ساڵ ڕازی کات، بێ ئەوەی هیچ کەسێ بزانێت.

ئەمە نمونەیەکی بچوکە لەسەر وەفاداری موفتی زادە بۆ خەدیجەی خێزانی و خۆشەویستی و صەبری ئەویش بۆ کاك ئەحمەد و ئەو ڕووداوانەی پێش دەهات

١) کاسێتی ئەمانەت .




بۆیان، بێگومان هەتا كۆچی دوایی بەجێ هێشتنی دونیاو تەنیاكردنی موفتی زادە لەناو جەرگەی كێشمەكێش و ڕوو بەڕوو بوونەوەكاندا، و چەندین ڕووداوی دیكەی لەوجۆرە ڕوویداوە، كاك ئەحمەد خۆی باس دەكات، "چەندین ڕۆژ لەسەر یەك تەنها نان و دۆمان خواردووە".-لەسەر ئەم بابەتە لە باسەكانی دواتردا درێژتر لەبارەیەوە قسە دەكەین-.

بەمجۆرە(خەدیجە) دەژی تا ئەوەی لە ساڵی(١٣٥٠ ی ك.ه)[١] كۆچی دوای دەكات و تاكە كوڕەكەی و مێردە بە ئەمەكەكەی بەتەنها بەجێ دەهێڵێت و بۆهەمیشە دەگەڕێتەوە لای خالقی خۆی.

دوای خەدیجە ئیدی(كاك ئەحمەد) ژن ناهێنێتەوە، و لەگەڵ(حمە ژیان)دا ژیان بەسەردەبات و هەرچی خۆشەویستی دایكیشی(خەدیجە) هەیە دەیداتە كوڕەكەی.

٢) كاك حەسەنی ئەمینی: یاد ایام....(چاوپێكەوتن)،گۆڤاری راه ما،ژ.١، بەخشی یەك، لا ٢١.

# گەڕانەوەی كاك ئەحمەد لە( تاران )ەوە بۆ ( سنە )

دوای دەسگیركردن و ئەو هەموو ئازاردان و لە( ئینفیراد)ی توندكردن و خۆڕاگری و هیچ نەدركانی(كاك ئەحمەد)و ڕووبەڕوو بوونەوەی ناڕەحەتیەكانی، لەساڵی(١٣٤٢) لە زیندانی(قزل قلع)ئازاد دەكرێت، لەگەڵ ئەوەی شوێنی كاركردنی هەیەو دەتوانێت وەك(بەڕێوبەری نوسینگەی اسناد املاك) لەتاران كاربكات، بەلاّم ڕاستەوخۆ بڕیار دەدات و دەگەڕێتەوە بۆ زێدی خۆی(سنە)و لەوێ دەستبەكارو چالاكییەكانی دەكات.

سەرەتا باسكرا كە دەستگیر كردنی(موفتی زادە) لەبەر موسولّمانی و سوننی بوونی نەبوو، بەڵكو لەبەر كورد بوون و دیموكرات بوونی بوو، وائێستا جارێكی دیكە لەبەر دلّسۆزی و دلّسوتاوی بۆ میللەتەكەی پایتەخت بەجێ دەهێلّێت و بارگەوبنەی دەگوازێتەوە بۆ(سنە).

كاك ئەحمەد، دەربارەی بەجێ هێشتنی تاران و گەڕانەوەی بۆسنە لە(كاسێتی ئەمانەت)دا بەجۆرە باسی دەكات"زەمان گوزەرا، دوای ئەوەی زانیم ئیشتیبام (هەڵە)كردووە تاران جێگەی من نییە، دەبێت بگەڕێمەوە بۆ سنە و لەوێ لە شوێنی صحیح و پەروەردەی ئیسلامی وەرگرم{وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ}، چونكە من مەسئولییەتم لەبەرامبەر میللەتی مەحروم و بەدبەختی خۆمەوە هەیەو دەبێت لەوێوە دەستپێبكەم، هاتمەوە بۆ(سنە)".

ئەگەر بهێنینە بەرچاوی خۆمان هیچ نەبێت دەتوانین وێنای ئەوەبكەین، كەسێك دوای ئەو هەموو ساڵە لەشاری خۆی دوور بێت و دوور لەكەس و كارو زێدی خۆی





بخرێتە زیندانەوە و دواتر ئازاد بكرێت و بڕیار بدات بگەڕێتەوە ئەو شوێنەی ساڵهایە لێی دوورە، دیارە لەگەڵ گەڕانەوەی وەك ئەوەیە سەرەتابێت بچێتە ئەو شارەوە، جاكەسێكی وەك موفتی زادە، ئەو هەموو گۆڕانە فیكری و ڕۆحیەیی بەسەردا هاتووەو لە سوچە تاریكەكانی زینداندا بڕیاری داوە ئەدای ئەو بەرپرسیارێتییە بكات، كە لەبەرامبەر دین و نەتەوەكەیدا هەیەتی، گومانی تێدانییە گەڕانەوەی بۆ(سنە) بۆ شارێك كەخۆی دەڵێت"شوێنی هیچێكم نەبوو بۆ زیندەگی كردن"، كارێكی پڕ زەحمەت و دەردی سەرییە. زەحمەت تــا ئەو سنورەی نەتوانێت سێوێك بۆ خۆشەویست ترین منداڵی بكڕێت، تــا ئەو حاڵەی نان و دۆو سەوزە دەبێتە خواردنی چەندین ڕۆژەیان!

بەڵام، هەموو ئەوكەسانەی بڕیاری یەكلا بوونەوە دەدەن بۆ پەروەردگارو دینەكەیان، ئەو كەسایەتیانەی خەمی نەتەوەكەیان لەقوشبنەكانی زینداندا بەدەم خەوەوە ڕایان دەچڵەكێنێ، ئەو موفتی زادانەی هەوای ئازاری دین و نەتەوەكەیان لەپایتەختی خۆشگوزەرانی هەڵیان دەكێشێت و بەتاشەبەردەكانی(ئاویار)یان دەدات. كەسێكیش هەیە پاداشتی سەبرو تەحەمول و ئازایەتییەكەیان بداتەوە!

كاك ئەحمەد، كاتێك خۆی باس لەو ڕووداوانە دەكات كە لەكاتی گەڕانەوەی بۆ سنەدا ڕوویداوە، چۆن لەئەوجی فەقیری و نەداریدا خوای گەورە، وەك هەمیشە فریایان دەكەوێت، لەكاتی گێڕانەوەكەیدا هەست بەو هەموو سەرسامی و سەر سوڕمانەی دەكەیت، كە لەبەرامبەر ئەو ڕووداوانەوە هەیەتی، كێشەی(عەبدوڵا خانی موڕادی) و زەوییەكانی ماڵی باوكی(كاك ئەحمەد) یەكێكە لەو ڕووداوە دانسقەو كۆمەكییە بێ پەردەكانی پەروەردگار بۆ(كاك ئەحمەد) لەو كاتەدا، پێش ئەوەی باسی ئەو ڕووداوانە بكەین، گرنگە ئاماژە بەوە بكەین، كاك ئەحمەد لەكاتی





گەڕانەوەی بۆ سنە تەنها لەڕووی ئابوورییەوە زەحتی لەسەر نەبووە، بەڵکو گەورەترین زەحتێك کە زۆر نارەحەتی کردووە ئەو فشارو زۆرە سیاسیەیی دەزگای داپلۆسێنەری(ساواك)ە دەیخەنە سەری-لە بەشەکانی دواتردا باسی ئەمەکراوە-. کەدەبێت کاریان لەگەڵدا بکات، جگەلەوەش لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە بەهەمان شێوە دووچاری فشاردەبێتەوەو خزم و کەس و کار لەزۆر بابەتدا سەرەکۆنەی دەکەن بەتایبەتی لەڕووی هاوکاری کردنی ساواك و حوکومەتی(شاهەنشا)وە، داوای لێدەکەن ئەوەندە گیری نەکات و کارێك بکات کەم کەم هاوکاری حوکومەت بکات، کە ئەمەش هەم لەڕووی ئابورییەوە، هەم لەڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتیشەوە بۆخۆی و بۆ بنەماڵەکەشی بەسودە، بەلاّم خۆ دیارە کەسێکی، وەك(موفتی زادە) ئامادەبێت منداڵەکەی بمرێت و بچوکترین کاری حەرام ئەنجام نەدات، هەرگیز بەکارێکی لەو جۆرە ڕازی نابێت.

گوێگرتن بۆ ڕازە نهێنییەکانی(موفتی زادە) دەبنە گەواهی لەسەر گەورەیی ئەو پیاوە،و فریادڕەسی پەروەردگار لەکاتە نارەحەتەکاندا، خۆی لەکاسێتی(ئەمانەت)دا زۆر بەکورتی و دەربڕینێکەوە پڕ لەنهێنی و سەرسامی باسی پەیدا بوونی شوێنێك دەکات بۆ ڕزق. کەخۆی بەداستانی غیرعادی(نائاسایی) دەیگێڕێتەوە، "کە گەڕامەوە بۆ سنە بەجۆرێکی غیرعادی شوێنێك بۆ ڕزق پەیدا بوو، واقیعەن غیر عادی {وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجاً }الطلاق٢. ئینسانێك شەریك موڵکمان بوو، خوا عەفوی کات لەم ڕۆژانا کوژرا *. کە لە ناوباخەکەی خۆیدا گوللەیان لێدا. دوو(دێ) لەپاڵی یەکدا بوون، یەکێکیان گەورە، یەکێکیان بچوك، باوکم کاتی خۆی دابوویە(عەبدولاّ خانی مورادی)، ئەو ئیجارەیەی دیاریکرا بوو زۆر بوو

*) کاك ئەحمەد لەوێدا مەبەستی ڕۆژانی ئینقلاب و ڕووبەڕووبوونەوەکانە ....

كەمێكی مابوو، ئەو میقدارەی كە مابووی هەموو ساڵێك دەیناردەوە بۆ ماڵی ئێمە.

چەند جار لەلایەن بنەماڵەی ئێمەوە، لە لایەن خوشك و براو دایكەوە داوا كرابوو بائەو ئیجارەیە ئیتر تەواو ببێت، كار گەشتبوویە ئەوەی ئەشرافی موحتەرەمی ناوچەكە كرابوویە واستە ئەو ئیجارە ئیتر باكۆتایی پێ بێت، و ئەو زەوی و زارو موڵكە بداتەوە دەست خۆمان، ئاخر زۆر بوو، ئەو هیچ كات حازر نەبوو بوو-ئەو كارەبكات و دەستهەڵگرێت لە زەوی وزارو موڵكەكان-، بەڵام كاتێك من چوومەوە بۆ سنە، ئەساسەن ئەم كابرا وای دەرك دەكرد، وەك ئەوەی چەند ساڵە بێگاری پێ دەكرێت! بەشێوازێكی وا ووتی"دە ئیتر بەسە من تاكەی عەزێتی ئەم زەوی و زارە بەكۆڵمەوە بێت؟ وا تۆ هاتوویتەوە بۆ سنە ئیتر بیگرە ئەستۆ"، هەر لەبیری نەمابوو كە چۆن داوا كراوە بدرێتەوەو نەیداوەتەوە، ئێستا هاتووەو بەو جۆرە دەڵێت، كە ئیتر من خزمەتی زۆرم كردووەو زەحمەتی زۆرم كێشاوە خۆتان وەریبگرنەوە.

لەبارەی ئابوورییەوە ڕەحمەتی خوای گەورە ئاوا پەیدا بوو، ئاخر زۆر شوێن بۆ ڕەفاهو سەروەتم بوو، هەم نوسینگەكەم لە–تاران–هەم وەعدیان دابووپێم كارم بۆ بكەن لەزانكۆی(حقوقی ئیلاهییات)، ئەگەر كەمێك لەساواك نزیك ببوومایەتەوە كارم ئاسان بوون، جگە لەوانەش ئیمكانی دەرامەت لە تارانا زۆر بوو لەبەر ئەركی دینی خۆم كە–الحمد الله- سەركەوتوو بووم كەتەئمینی دەكرد.

زۆر بەقەناعەتەوە لە خوا بەزیاد بێت بۆ یەكەمجار لەدوای زیندان خۆم پاراست لە دەرامەتی حەرام، یا ئەگەر حەلاڵ بوو موستەلزەمی حەرام بوو، كە دەبوایە بێدەنگیم بكردایە لەبەردەم تاوانەكانی شاهەنشاهییەوە، یان كەمێك هەماهەنگیم

بکردایە لەگەڵ(ساواك)، ئەگەر دەرامەتێکش حەڵاڵ بوایە وەك مامۆستای زانکۆ کاتێك لەبەرامبەر مەرجی ئاواوە بێت حەرام دەبێت. بەڵام کە گەڕامەوە بۆ سنەو کەمێك تەقوام بەکاربرد ئەوە ڕوویدا، هەندێك لەو کەسایەتییە بەڕێزانەی دەخالەتیان لەم کاراکرد بوو(عەبدولا خان) زۆر بە قورسی جوابی کردبوون-پێیان سەیر بوو یانی چی؟! بۆچی(عەبدولا خان) بوویە مرۆڤێکی تر؟ ئەصڵەن بۆ فکری گۆڕا؟! بۆچی قسەو باسی لەبارەی دانەوەی ئەم موڵك و زەوی و زارەوە گۆڕا؟! بەڕاستی پێیان سەیر بوو".

ژیانی کاك ئەحمەد و خێزانی لە ڕووی ئابوورییەوە بەو شێوەیە نارەحەت وگران بوو، بەڵام لەبەرئەوەی خاوەن کە سایەتی و شەهامەت بووە، هەرگیز نەیهێشتووە کەس بزانێت و دەرك بەو فشارە ئابورییە بکات، تا ئەوکاتەی دایکی بەو باس و خواسەی نێوان(حەمە ژیان) و (خەدیجە)ی دایکی دەزانێت لەبارەی (سێو)ە کەوە.

دوابەدوای ئەمە وورده وورده لەپاڵ ئەو نەدارییەدا قسەو قسەڵۆك دوورو نزیك دەستپێدەکات و فشارێکی کۆمەڵایەتی قورس لەپاڵ فشارە ئابوورییەکەدا دروستدەبێت، وەك خۆی دەڵێت"ڕوداوەکان دەستییانپێکرد."بنەماڵەو دۆست و ئاشناو خوێنەوارو نەخوێنەوار هەموو سەردەخەنە سەری، کە ڕەوشی ژیانی خۆی بگۆڕێت و کەمێك مەیل بدات بە(ساواك)و حوکومەت. دیارە زۆرێك لەوانەی قسەیان لەگەڵ کردووە لەبەرخودی(کاك ئەحمەد) بووەو ئەویان خۆشویستووەو بەدەرکی خۆیان وایانزانیوە، ئەگەر ئەو ئەو کارەبکات ژیانی دەگۆڕێت و لەڕووی ئابورییەوە هیچ نەبێت حاڵی باشدەبێت.

خۆی باسی دەکات، ڕۆژی وا هەبووە چەند سەعات دانیشتنکراوەو فشاریان خستۆتە سەری، بەڵام لەبەرئەوەی(موفتی زادە) لەو سەری قسەو باسەکانەوە

هاتۆتەوەو زانیویەتی چی بەڵێن و پەیمانێكی بەخوای گەورە داوەو لەناخی خۆیدا بە تەمای چییە، هەركەس بەپێی تێگەیشتن و دەركی خۆی وەڵامی داوەتەوە كەمێك لەو زەختەی كەم كرۆتەوە.

بەمجۆرە(كاك ئەحمەدی موفتی زادە) بۆ ماوەی چەندین ساڵ لەگەڵ نارەحەتی و فشارەكاندا دەجەنگێت، لەبەرامبەر سەختییەكاندا سەبر دەگرێت. لەماوەی ئەو فشارە ئابووری،و كۆمەلآیەتی و سیاسیەدا دەبێت، موفتی زادە بۆماوەی یەك دوو ساڵێك لە دێكانی (زاخە) و (بەردە ڕەش)ی سەر بەشاری(دیواندەرە) خەریكی كاری كشتوكاڵ دەبێت و دواتر لەگەڵ چەند كەسێكی تر كارگەیەكی هاوبەشی دروستكردنی خانووبەرەو پردو لولەكێشی ئاو(دانانی بۆری ئاو) بەناوی(ئەمانییە) بەڕێوە دەبەن [1].

بەو پێیە بێت، ئەم كارەی سێ بۆ چوار ساڵ پێش ئینقلاب دەستی پێكردووەو تا پێش ئینقلابیش بەردەوام بووە، دەكاتە ساڵەكانی(١٣٥٣ك-ه)، واتە هێشتا وەك(حاكم شەرعی كوردستان) دەسبەكار نەبووە.

---

١) كاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەكەم ، زستانی ١٣٨٦، لا ی ی.



# هەوڵەكانی موفتی زادە پێش دامەزراندنی مەدرەسەی قورئان.

پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوەكرد، هۆكاری سەرەكی گەڕانەوەی موفتی زادە بۆ سنەو تەحەمولكردنی ئەو بارە سەنگینەی ژیان، بەنییەتی خزمەت بەدین و نەتەوە مەحرووم و نەدار و هەژارەكەی بووە.

كاك ئەحمەد، سەرەتای دەستكردن بەكارو چالاكی هەر خۆی بەتەنیا دەبێت، لێرەدا ڕوونكردنەوەیەك دەدەین بۆئەوەی ئیتر لای خوێنەر ڕوون و ئاشكرا بێت، لەم قۆناغەی موفتی زادەدا كار بۆ(دین)، واتە كار بۆ نەتەوەیەكی مەحروم، و كار بۆ ڕزگار كردنی هەموو هەژارانی دونیا لە هەر شوێنێكی ئەم جیهانەدا بن. كاك ئەحمەد لەدوای زیندان بەو ڕۆحییەتەوە كار دەكات و دێتەوە لەناوخودی تاكەكان شۆڕشی گۆڕانكاری دروستدەكات، بۆیە دەتوانین بڵێین ڕیفۆرمەكانی كاك ئەحمەد بەشێوەیەكی تەدریجی لەتاكەوە دەستپێدەكات و لەڕێگەی پێگەیاندنی تاكەوە كۆمەڵگایەكی ساغ و تەندروست لەڕوی ئایینی و نەتەوەییەوە دروست دەكات. گۆڕانكارییەك، كاتێك قسەدەكات و ئەوانەی گوێی بۆ دەگرن، پێش ئەوەی لە شوێنی خۆیان بجوڵێن و كۆڕەكانی بەجێ بهێڵن داواكارییەكانی جێ بەجێ دەكەن و بەكردەوە پێی دەڵێن"كاك ئەحمەد ئەوە بە گوێمان كردیت و ئەوە دەرمانی چارەسەرمان خوارد"، چونكە موفتی زادە، كاتێك لەسەر دەردێكی كۆمەڵگا قسەدەكات، نایە تەنها بە ئاماژەكردن بە دەردەكە یاخود باسكردنی دەرمانی دەردەكەو لەبیركردنی هۆكاری سەرهەڵدان و مێژووی سەرهەڵدانی وازبهێنێت، بەڵكو فەیلەسوف ئاسا، فەیلەسوفێك لەناو خودی خەڵكدادەژی، فەیلەسوفێك لەگەڵ زامەكاندا مامەڵە دەكات و چارەیان دەكات، هەموو لایەنەكانی دەردەكە پیشاندەدات، پاشان باسی چەندین جۆر دەوای جیاواز

دەكات، كە بۆچارەسەری ئەو دەردە بوونیان هەیەو لەناو هەموویشیاندا باشترینیان پێدەڵێت، بەجۆرێك باسیدەكات ئەگەر تامی ئەو دەرمانە وەك ژەهری مار بێت ئەوەی گوێی گرتووە دەیخواتەوەو چارەی خۆی پێدەكات، بۆیە هەموو ئەوانەی لەبارەی(موفتی زادە)وە دەخوێننەوە یان دەنووسن دەبێت زۆر لەمە قوڵتر مامەڵە بكەن، نەیەن لەسنورە تەسكەكاندا خۆیان قەتیس بكەن و نەتوانن شتەكان باشتر ببینن.

كاتێك كاك ئەحمەد، بەتەنها دەستبەكاركردن دەكات، لەپاڵیا دەست بە پەروەردەكردنی چەند تاكێكی لێهاتووی بە تواناد‌ەكات، چونكە پەروەردەكردن لە قـــوتـــابخانەی مـــوفتی زادەدا پـــانتایـــیەكی فـــــراوانی داگـــیر كردووە. كاك ئەحمەدی موفتی زادە، لەساڵی(١٣٤٢) بۆ (١٣٥٠) بەناونیشانی كەسایەتییەكی ئایینی، بەلاّم بە تەنها سەرقاڵی كار و چالاكی بووە، هەڵبەتە زۆر هەوڵی دەدا چەند نەفەرێك پەروەردە بكات، هەر بۆئەم كارەش داوا لە(مامۆستا تاهیری) دەكات،-مامۆستایەكی ئایینی ناودارو ناسراوی ئەو سەردەمەی كوردستانە-. چەند كەسێكی نزیكی خۆی بنێرێت و پەروەردەیان بكات، بەلاّم كاتێكیش بەهۆی هۆكاری دارایییەوە نەیاندەتوانی لەو دەرسانەدا ئامادەبن بە شوێنی كەسی دیكەدا دەگەڕاو دەرسی تایبەتی پێدەوتن و كاری بۆ پەیدادەكردن، بەڵكو چەند نەفەرێك لە دەوری خۆی كۆبكاتەوە و بەبنەما ئەساسییەكانی(كتاب و سوننە) پەروەردەیان بكات. لەو كەسانەی، كاك ئەحمەد سەرەتا كاری لەگەڵ كردوون( سەلاحەدین حسەینی و عەبدولاّ پارسا) بوو، ئەوانە دوو گەنج بوون و(كاك ئەحمەد) زۆر دڵخۆش بووە پێیان و ئومێدەوار بووە لە ئاییندەدا كاریگەری پەروەردەی تایبەتیان كاری خێری هەبێت بۆیان، بەلاّم زۆر بەداخەوە وەك زۆربەی ئەوانی تر كە

(كاك ئەحمەد) زۆر زەحمەتی لەگەڵدا كێشان و دڵی پێیاخۆش بوو، بەڵام لە سەرەتاو لە نیوەی ڕێگەدا بەتەنها بەجێیان هێشت [1].

دیارە هیچ كات ئەم پێشهاتانە لەتمە لەكارو بەرنامەی پیاوێكی ئاوا دووربین و بیرتیژ نادات، بۆیە لەكاری خۆی بەردەوام دەبێت و لەناو شاری سنەدا، بەرنامەی وانەی(هەفتانە) دادەنێت و لە هەفتەیەكدا دوو ڕۆژ دیاری دەكات، ڕۆژێك بۆ ژنان و ڕۆژێك بۆ پیاوان، گەنجی كەم تەمەن هەبوون زۆربەیان بۆ مەسائیلە دینی و پرسیارو وەڵامی سیاسی و كۆمەڵایەتی دەچوونە ئەو(كلاس هەفتگی)ەوە. لە ڕووی ژمارەوە كەم بوون، كاك حەسەنی ئەمینی دەڵێت"لەو كاتەدا هیچ وەخت نەبووە ژوورەكە پڕبێت لە خەڵك، بەڵام زۆرینەی خەڵكی بۆ مەسەلە دینی و فیقهییەكان دەهاتن، چونكە كاك ئەحمەد بەناونیشانی یەك بیریاری دینی بەناوبانگ بوو، بیرو بۆچوونی ئەو لەبارەی بابەتە فیقهییەكانەوە، لەگەڵ ئەوانی دیكە جیاواز بوو، بۆ نمونە لەبابەتەكانی(نكاح و تەلاق و مافی ژن)، بیروڕاو بۆچوونی بەناونیشانی (موجتەهیدو زانایەكی دینی) ڕۆشن فیكرانە، بەئیستدلالی قاتعانەو ڕۆشن و سەریح قسەی دەكرد و حوكمی دەردەكرد.

كاتێك حوكمێكی دەردەكرد و هیچ شتێك لە بەردەمیدا نەبوو ببێتە هۆكارێك بۆ سوككردن یان قورسكردنی ئەو حوكمە، بەڵكو زۆر تێگەشتوانە زانایانە، حەكیمانە بەگەڕانەوە بۆكتاب و سوننە بەڵگەی دەهێنایەوەو خەڵكی هەمووی بەبێ قسە حوكمەكەیان قبوڵ دەكرد"[2].

هەرلەبەرئەم زیرەكی و شارەزا لە هەڵسوكەوت و پەیوەندی دروستكردنەدا بوویە هۆی ئەوەی خەڵكی زیاتر تەعەلوق بگرن پێیەوەو بۆكێشەو گرفتەكانی ڕۆژگار بگەڕێنەوە

---

[1]) كاك حەسەنی ئەمینی: یاد ایام...(چاوپێكەوتن)،گۆڤاری راه ما،ژ.٢، بەخشی یەك ، لا ٢٤-٢٥

[2]) سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٥-٢٦





لایی و پرسیاری لێبکەن، بەمجۆرە وورده وورده ژمارەی کەسەکان زیاد بوو تا گەشتە ئەوەی(مەدرەسەی قورئان) دابمەزرێنێت. هەوڵەکانی موفتی زادە بۆ کۆکردنەوەو پەروەردەکردنی کەسی بەتواناو لێهاتوو بەجۆرێك بەردەوام دەبێت، تا دەگاتە ئەوەی داوا لە(مامۆستا حاجی مەلا عەبدولرەحمان تاهیر)، کە یەکێکە لە مامۆستا دیارو زیرەك و ناسیۆنالیستەکانی ئەو کاتەو کاك ئەحمەد زۆری خۆش ویستووە، لە(بۆکان) چەند فەقییەکی بەتواناو زیرەکی بۆ بدۆزێتەوەو بیاننێرێت بۆ سنەو خۆی سەرپەرشتیان بکات و دەرسیان پێ بڵێتەوە، چونکە وەك وتمان(کاك ئەحمەد) زۆر مەبەستی بووە فەقێ پەروەردە بکات، هەر بۆیە کاتێك فەقێکان دێن بۆلای خۆی خەرجیان دەکێشێت و خانوویان بۆ دەگرێت. (مامۆستا حەسەنی ئەمینی) یەکێکە لەو کەسانەی کە بەوجۆرە بە(کاك ئەحمەد) ئاشنا بووە، لەو بارەیەوە دەگێڕێتەوە"- مامۆستا مەلا عەبدولرەحمانی تاهیری- مامۆستای خۆم بوو لای ئەو ئیجازەی مەلایەتیم وەرگرت بوو، کە دەهات بۆلامان زۆر باسی-کاك ئەحمەد-ی بۆ دەکردین، پیاوێکی وایەو ئاوایەو ئەوەندە ئازایەو ئەوەندە خۆش تەبیعەتە، زۆر تەعریفی دەکرد، ئێمە هێشتا نەمان بینی بوو—علاقەتمان پێ پەیداکردبوو، هەر ئەو عەلاقەتە بوویە هۆی ئەوەی کە باسی ئێمەشی بۆ-کاك ئەحمەد- کردبوو، کە وتبوی—منیش فەقێم هەیە بەمجۆرە-من و فەقێیەکی تری هاوڕێمی ئاشناکردبوو بە-کاك ئەحمەد-، دوای ئەوە-کاك ئەحمەد-داوای لێدەکات، کەلای ئێوە فەقێی باش هەیەو حەزیان لە خوێندن هەیە، پێمخۆشە کارێکی وابکەم و خۆم دەرسیان پێ بڵێم، بۆیە ئەویش ناوی من و ئەو ڕەفیقەمی برد بوو، بەو شێوەیە لەگەڵ-کاك ئەحمەد-یەکمان ناسی و چەندجار دەهاتین بۆ سنەو دەستیدەکرد بەباسی دوورو درێژ، باسی ئەوەی دەکرد دەبێت مرۆڤ لەسەر پێی خۆی بوەستێت و ئاتەم شێوە، کەمەلاکان کاردەکەن شێوەیەکی زۆر باش نییە بۆباسی دینی و کەسی باش نییەو دین زەعیف بووە. ئیتر بەوجۆرە ئێمەی




ساغ كردۆ مەلایەتی و كاری ژیانی لادێ بەجێ بهێڵین و خۆشمان-ووتمان وەڕسین و حەزبەكاری مەلایەتی ناكەین-، ئەویش ووتی-ئەگەر وەڕسن و ڕاسدەكەن مەیكەن-، دەی چۆن نەیكەین و چی بكەین؟ ووتی-من لێرە كارم هەیە، وەرن لێرە لەگەڵ من كار بكەن-، ئەگەر ڕاستدەكەن خۆ ئێوە لە پیاوانی ئەوەڵی ئیسلام گەورە ترنین، حەزرەتی ئەبوبكر(ﷺ) كۆ نەفرۆشی دەكرد، دەچوو بازرگانی خاریجی دەكرد، جلی كۆنی لە(مەككە) دەكڕی و لە(مەدینە) دەیفرۆشتەوە، ئەم باسانەی-كاك ئەحمەد-زۆر كاریگەر بوو، بەجۆرێك قسەی بۆ هەركەس بكردایە، ئەگەر باسەكەش بەوجۆرە نەبوایە، حەتمەن كاری لێدەكردوو حەزی لە گوێ گرتن بوو، لەقسەكردندا زۆر لێهاتوو بوو، ئەوكەسانەی لەنزیكەوە دیوویانە دەزانن، چونكە لەدڵەوە قسەی دەكرد، لە قولاَیی دڵییەوە باوەڕی پێی بوو، ئەوەی بەقسە دەیووت لەتەواوی كردەوەدا بەزەڕە لاینەدەدا.

بەوجۆرە دڵێك ڕازی دڵێك ناڕازی، ووتمان دێینە سنەو مەلایەتی و ئیمامەتی و فەقێیەتی و كاری كشتوكاڵیمان هەمووی بەجێ هێلاَ، كە ئیمكانییەتمان لەوێ زۆر بوو موڵك ومالّی زۆر لە ئیجارەماندا بوو، كاتێك هاتینە سنە ساڵی(١٣٥٥) بوو دوای چەند ڕۆژێك لەكۆچمان بۆ سنە من و-كاك عەزیزی ئەمینی-، لەگەڵ-كاك ئەحمەد- ڕۆشتین تا ئەو خانوویەكمان بەئیجار بۆبگرێت، لەگەڕەكی خۆیانەوە لە(جور ئاباد) گەڕان دەستی پێكرد و پرسیارو وەلاَم بەشوێن خانوودا دەگەڕاین، هەندێك خانوویان نەدەداو هەندێكیان هەیان بوو، بەلاَم پرسیاریان لە ژمارەی خێزان دەكردوو، ئێمەش(هەشت كەس) بوین ڕازی نەدەبوون، تالەكۆتاییدا گەشتینە خانوویەك نزیك مزگەوتی(حەمەحسەین بەفری)، كاتێك-كاك ئەحمەد-جەرەسی دەرگای لێدا ژنێك دەرگای كردەوە، وارێكەوت-كاك ئەحمەد- دەیناسی، كاتێك دەربارەی خانووی كرێ





پرسیاری لێكرد، وەلاّمی دایەوە، كەخانووی چۆلّیان هەیە، بەلاّم دەیفرۆشن و نیازی بەكرێدانیان نییە.

كاتێك-كاك ئەحمەد-گوێی لەمە بوو، یەكسەر ووتی"دەی زۆر باشە دەیكڕین".

ئێمەش پرسیارمان لێكرد ئاخر چۆن دەیكڕی؟"ئێمە خۆ پارەمان پێنییە!

ووتی، ئێستا بلّیّ نرخی چەندە ؟- انشاالله ڕێكدەكەوێت و ئاساندەبێت. خاوەن مالّ ووتی بایی(١١٠) هەزار تمەنە،-كاك ئەحمەد- ووتی دەیكڕم، دەسمان كرد بە ناڕەزایی دەربڕین، و ووتمان"ئێمە پارەمان پێنییە خانوو بكڕین ...".

ووتی، ئێوە چیتان هەیە بیفرۆشن، باقییەكەشی- انشاالله- حەل دەبێت.

ووتمان: تەواوی سەروەتی ئێمە(٢٠هەزار)تمەنە بۆ باقییەكەی چی بكەین؟!

ووتی: ئەوە بهێنن ئەوەشی دەمێنێتەوە-انشاالله- كارێك دەكەین.

ئێمە پارەمان نەبوو، دەشمانزانی-كاك ئەحمەد-چەنێك نەدارو بیّ پارەیە، بەلاّم سەرئەنجام ئەو خانووەكەی كڕی.

كاتێك تەواو بووین و خانووەكەی كڕی، بڕیاریدا تاپۆی خانووەكە بكات بەناوی ئێمەوە، بەلاّم ئێمە ڕازی نەبووین. ووتمان، هیچ قبولّ نییە ئەو خانووە بكرێتە ناوی ئێمەوە و دەبێت بەناوی خۆتانەوە بێت، ئەو زۆر پێداگری دەكرد، كە بەناوی ئێمەوە بێت و داوای دەكرد ناسنامەو شتەكانی پێبدەین، ئەوەنە پێداگری دەكرد ناچار بووم ناسنامەكەی نەدەمیّ و بلّێم ناسنامەكانمان لەلانییە، تا بەوشێوەیە ڕازیمانكردوو وازی هێنا نەیكرد بەناومانەوە.بەوجۆرە لەو خانووەدا جێگیر بووین، خانوویەكی گەورە بوو، كە ژووری زۆری تێدا بوو لەناوخۆمانا دابەشمان كردوو هەموومان لەو خانوەدا ژیانمان دەگوزەراند"[1].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٢بۆ ٢٣

هەوڵدانی موفتی زادە بۆ پەروەردەكردن و پێگەیاندنی قوتابی و پیاوی دوارۆژ، پیاوانێك بتوانن لەبەردەم تاغوتێكی وەكو (شاه)دا بەعەزەمەتەوە بوەستن و هەموو جوهدی خۆیان بخەنە كار بۆئەمە كۆمەڵگا ڕزگاربكەن و لەو ستەم و نادادپەروەرییە، زۆر لەوە زیاتر تێپەڕدەكات، قوتابی لەدێهاتەوە بهێنێتە شارو بیاغخاتە سەركارو دواتر خانوویان بۆ بكرێت، كاردەگاتە ئەوەی فەرشی ژێری خۆی دەفرۆشێت و دەیداتە فەرشێكی دیكەو لەو خانووە تازەی بۆ قوتابیەكانی گرتووە دایدەخات! كاتێكیش پرسیاری لێدەكەن بۆچی كارێكی وایكردووە، كەفەرشی ژێری خۆی فرۆشتووە، فەرشێك ئەوەندە قەدیم و بەنرخ؟

لەوەڵامدا دەفەرمویێت"من ئەوەی كردوومە بەكارێكی خاسم داناوە، چونكە تاكە شتی سەردەمی جاهیلیم، كە تائێستا مابوویەوە، ئەم فەرشە بوو، ئێوە بوونەهۆكارێك بۆئەوەی لەناوی بەرم و دوركەومەوە لێی"[1].

سەرەتاو دەسكردنی بەكارێك بەوجۆرە دەست پێ بكات دیارە كۆتاییەكەی دەبێت بەچی بگات، كەسایەتییەك بەوجۆرە بیربكاتەوەو لەهەنگاوی یەكەمی كارەكەیدا بێت، زۆر ڕوونە تاچی ئەندازەیەك بەشوێن سەروەت و سامان و پلەدا دەگەڕێت.

موفتی زادە، لەسەر ئەم كارانەی بەردەوام دەبێت تا ئەوكاتەی بەرەسمی دەبێتە (حاكم شەرعی كوردستان)و لە وێوە بۆ خزمەتی دین و نەتەوەكەی دەست بەكاردەبێت.

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٤.

# بوونی موفتی زادە بەحاكم شەرعی كوردستان

حاكم شەرعی(دادوەری شەرعی)، پۆستێكی تایبەتی ولاتی(ئێران)ە بە هەندێك كەسایەتی زاناو ناوداری ئایینی ناوچە تایبەتییەكان دەدرێت. ئەو زانایانەی ئەم پۆستەیان دەدرێتێ دەستەلاتێكی تایبەتیان هەیەو كار بۆچارەسەركردنی بابەتە دینی و تاكەكەسیەكان دەكەن، وەك بابەتەكانی—نیكاح-تەلاق-میرات —و یەك لاكردنەوەی ناكۆكیە جۆراوجۆرەكانی نێوان خەلكی، ئەمانە چەند بابەتێكن پەیوەندیان بە(دادگا)وە نییە، هەر كەسێك لەم بوارانەدا كێشەیەكی هەبوایەو پەیوەندی بە دادگاوە بكات، دادگا ڕاستەوخۆ ڕەوانەی لای(حاكم شەرعی) دەكات و ئەو چارەسەری ئەو كێشانە دەكات، هەرچی (موفتی)ە لە ڕووی شارەزایی و دەسەلاتەوە لە(حاكم شەرعی) فراوان ترە، هەر بۆیە(موفتی) بوون لە ڕووی ناونیشانەوە لە(حاكم شەرعی) بەرزترە، چونكە ئەو بابەتانەی دەچن بەردەم (موفتی)و كاری لەسەر دەكات بابەتێكی ووردو فراوان و گشتگیرترن، هەروەها لە ڕووی دەسەلاتیشەوە(موفتی)یەكان هەلّدەستن بە دیاری كردنی(حاكم شەرعی) یەكان، یاخود ئەمان دیاری دەكەن و (وەزارەتی داد)یش قبولّی دەكات. بنەمالّەی (كاك ئەحمەدی موفتی زادە)یش لەكوردستانی ئێران هەم موفتی بوون، هەم حاكم شەرعی.

باوكی كاك ئەحمەد،(مامۆستا مەلا مەحمودی موفتی)هەم موفتی بووەو هەم حاكم شەرعی. بۆ زیاتر ڕوون كردنەوەی ئەم بابەتەو چۆنییەتی بوون بەحاكم شەرعی(كاك ئەحمەد)، گێڕانەوەی(كاك حەسەنی ئەمینی) دەگوازینەوە، كەلەئێستا حاكم

شەرعی سنەیەو ئەمەش دوای ئەوەی(موفتی زادە) دەچێتە(كرمانشاه)بە نامەی ڕاستەوخۆی خودی(كاك ئەحمەد) ئەم دەبێتە حاكم شەرعی سنە، جگە لەوەی تانەوكاتەی (كاك ئەحمەد) حاكم شەرعی بووە(حەسەنی ئەمینی) هەڵسوڕێنەری (دەفتەری حاكم شەرعی) بووە، بەڵام دوای كۆچی(موفتی زادە) لەپایزی (١٣٥٨)دا بۆ(كرماشان)، بەحوكمی دەمی(ووتە)و نوسینی ئەو(كاك حەسەن)و چەند مامۆستایەكی دیكەی تایینی هەر ماوەو یەكێكیان لە جێگەی(كاك ئەحمەد) دەبنە حاكم شەرعی، دواتر لەبەر ئەوەی(كاك ئەحمەد) لە(سنە) نییەو لەخەڵكی ئەوێوە نزیك نییە لەوەڵامی ڕەسمی(وەزارەتی دادی كوردستان)دا سەبارەت بەحاكم شەرعی و گیرۆدەی خەڵك لەو مەسەلەیەدا لەبەرواری (١٣٥٩/١١/٤)ك-ه-(كاك ئەحمەد) نامەیەك دەنوسێت بۆ وەزارەت و ئەركی حاكم شەرعی دەسپێرێتە (كاك حەسەنی ئەمینی)[1].

كاك حەسەنی ئەمینی، دەربارەی بە حاكم شەرعی بوونی(كاك ئەحمەد) لە گۆڤاری(راه ما)دا بەمجۆرە دەدوێت"دوای كۆچی دوای باوكی-كاك ئەحمەد- ئەو براكەی-بەڕەحمەت بێت-حاجی مامۆستا مەلا خالید موفتی- بەرپرسیارێتی كارەكەی گرتەئەستۆ. لەساڵی(١٣٥٥) لەبەر كۆمەڵێك هۆكار دادوەری شەرعی (حاكم شەرعی) بەجێدەهێڵێت، بەڵام تا لەژیاندا مابوو هەر بەموفتی مایەوە، لەوكاتەدابوو كۆمەڵێك لەكاربەدەستانی دادگا كەلە نزیكەوە-كاك ئەحمەد-یان دەناسی و لەتواناو داهێنان و پێشنیارو حاڵی ڕۆشنبیری بە تایبەتی لەبابەت(كۆمەڵایەتی و سیاسی و خێزان)یەكاندا چەندێك شارەزایەو خودی ئەوانیش زۆر سودیان لەبابەتەكانی وەرگرتبوو، جگە لەوەی زۆر خۆشیاندەویست، لەپێشنیاری ئەمانە(دادگا)بڕیار دەدات-كاك ئەحمەد-بە حاكم شەرعی دابمەزرێت.

---

[1]) كاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەكەم ، زستانی ١٣٨٦، لا- ك ك.

زۆر جار پێشنیاری ئەم کارەیان بۆکردبوو، بەڵام-کاك ئەحمەد- لەبەرچەند هۆیەك ئامادە نەبووە وەریبگرێت، یەکێك لەوانە ئەوەبوو، ئەم بەرپرسیارێتیە لە ئەستۆی مامی بوو، هەر بۆیە تا ئەو لەژیاندامابوو وەرگرتنی ئەم کارە بۆ-کاك ئەحمەد- گرانبوو، دووەم لەبەرئەوەی سەرقاڵی بەئیشکردن و بیرکردنەوەی لەبابەتەکان زۆربوو ئیشوکاری گرنگتری لەسەرشان بوو.

وەك ئاماژەمان بۆ کرد چەندەها جار ئەم بابەتەی خراوەتە ڕوو ئەو بەنەخێر وەڵامی داوەتەوە، تا لەکۆتایدا چەند هۆکارێك دەبنە مایەی ئەوەی ئامادەیی خۆی دەربڕێت بۆ وەرگرتنی ئەو ئەرکە، بۆ نمونە: پێیان وتبوو ئەم بەرپرسیارێتییە نەگریتە ئەستۆ ئەوا بەچەند کەسانێکی دیکە دەسپێرێت، کە چەندەها کێشە دەهێننە ئاراوە، یەکێك لەوانە ئەوەیە، بەبێ بەرتیل و پارە ئیش بۆ خەڵك ناکەن، بەڵکو لەبەرامبەر هەر وەڵامێکدا بڕێك پارە لەخەڵکی وەردەگرن، ئەمەش شتێکە لەبەرچاوی ئێوە حەرامەو دەبێتە هۆی ناوزڕاندن و سوك بوونی دین و شەرعییەتی ئیسلام، کە ئەم کارە زیانێکی زۆر خراپە بەتایبەتی لەم ڕۆژانەدا، هەروەها لەلایەکی ترەوە پێشنیارەکانی ئەوکەسانە هەندێك جار زارەکییە، ئەو بڕیارو فتوایانەی دەریدەکەن چارەسەری کێشەکانی ئەمڕۆی خەڵکی ناکەن، لەوە دەچێت خاوەن کێشە شەرعییەکان بەتایبەتی ئەو کێشانەی پەیوەندیان بەجیابوونەوە (تەڵاق) هەیە، خێزان دووچاری سەر لێشێواوی و زیانێکی چارەسەرنەکراو بکەن، بەم پێیە کەسەکان لەیەك جیادەکەنەوەو لە کۆتایدا تێکشکان و لە ناوچوونی خێزانەکانی لێدەکەوێتەوە، ئاشکراشە ئەمە کاریگەری سلبی و زەرەرو و زیانی جۆراو جۆری لێدەکەوێتەوەو باری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا توشی دەردو نەخۆشی دەکات.

ئەم ڕوونکردنەوەیەشم لەبەرئەوەبوو، چونکە هەندێك کەس دەیانەوێت بابەتی حاکم شەرعی-کاك ئەحمەد- لەسەردەمی ڕژێمی پێشوو(شاهەن شاهی) لەناوبەرن

لەكاتێكدا-كاك ئەحمەد- لەپێناو خزمەتكردن بەخەڵكی ئەم كاروبارەی وەرگرت، لەبەر بەرگریكردن لە تێكشكان و لەناوچوونی خێزانەكان و لەبەر پارێزگاریكردن لەناو زڕاندن و سوك بوونی زیاتری شەریعەت و بەشەكانی شەریعەتی ئیسلام و موسوڵمانان، بەڕاستی-كاك ئەحمەد- پێشنیارو بیر و بۆچوونێكی فراوان و ڕۆشنبیرانەی وای هەبوو كە تائێستاش لە بواری خیزاندا دەركەوتنی كێشەی كۆمەڵایەتی بەناوی(تەڵاق) لە تێكشكاندنی و لەناو چونی خێزانەكان بەرگریكردوە.

زۆر جاردەهاتە پێش، -كاك ئەحمەد- چەند ڕۆژو شەو لەگەڵ خێزانێكدا سەرقاڵ دەبوو. ئەوانی ڕێنمایی و ئامۆژگاری دەكرد كە پێكەوە ژیان بەسەربەرن، ئەمەش بۆئەوەی ڕێگریبكات لە تەڵاق و جیابوونەوەی خێزانەكان. هەموو ئەمانەشی بەبێ ڕەچاو كردنی پاداشت و وەرگرتنی یەك ڕیاڵ(پارە) لەكەسێك دەكرد. ئەم بابەتە بۆهەركەسێكی بە ویژدان بابەتێكی فراوان و شایەنی لێكۆڵینەوەیە. لەوكاتەی-كاك ئەحمەد- حاكم شەرعی وەرگرت، چ لەكاتێكدا خۆی سەرپەرشتیاری دەكرد، چ لە كاتێكدا ئەم بەرپرسیارێتییەی لە ئەستۆی من دانا، تائێستا چەندەها هەزار خێزان لە شوێنە گوندنشینەكان لەشێوان و جیابوونەوە ڕزگاریان بووە، واتە لەسەر بنەمای ئەو بڕیارانەی-كاك ئەحمەد- خۆی دەریكردوون و ئەو بڕیارانەی من دەرم كردوون. لە ڕاستیدا بڕیارەكانی منیش هەربەشێوەی بڕیارو فتواكانی-كاك ئەحمەد-ە(خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە).

ئەگەر-كاك ئەحمەد- حاكم شەرعی نەبوایەو ئەو فتواو بڕیارە تازانەی دەگونجان لەگەڵ ویستی كۆمەڵگاو ڕۆژدا، كەلەكتێب و سوننەتدا دەریدەهێنا بەنازایەتی و چاونەترسی دەرینەبڕینایە، ئەگەر ئەوانەی دەهاتن بۆلای ئێمەو سەردانیان دەكردین، نەهاتنایەو بچونایە بۆلای كەسانێكی دیكە، كەلەسەربنەمای فتوای یەكلایەنە فتوایان دەردەكرد، تائێستا بەهەزاران خێزان گیرۆدەی تێكشكان و لەناوچوون دەبوون،

هەروەکو چۆن هەندێکیان وایان لێهات. بەڕاستی لەم بابەتەشدا وەکو زۆرێك لە ئیش و کارەکانی -کاك ئەحمەدی موفتی زادە-، وەکو ڕابەرێکی بەتواناو لێهاتوو دەینێکی زۆری بەسەر خەڵکی کوردستانەوە هەیە، جا لەدوای ئەوەی -کاك ئەحمەد- لەساڵی (١٣٥٥)دا کارو باری حاکم شەرعی وەرگرت. لەبەرئەو بەرپرسیارییە وەزیفەو بەرپرسیارێکی ڕەسمی بوو حاکم ڕێگەی پێدا بوون. تازەلە ساڵی(١٣٥٦)دا حوکومەتی(شاه) زانی دوچاری هەڵەیەکی گەورە بووە، لەبەرئەوە -کاك ئەحمەد- لەکۆنەوە پێشینەی ڕووبەڕوو بوونەوەی هەبووەو ئەم ڕۆژانەی چالاکی سیاسی و ڕووبەڕوو بوونەوەی خۆی لەگەڵ ڕژێم زیاترکردبوو، حوکومەت دەیویست دووبارە -کاك ئەحمەد- قۆڵ بەست بکات، بەلاَم زانییان -کاك ئەحمەد- لەبەر حاکم شەرعی بوونی بێبەشە لەکاری سیاسی، ئەمەش ڕێگرێك بوو بۆ ڕژێم بۆیە دەستیانکرد بە پلانگێڕان، بەلاَم ئەمجارە -کاك ئەحمەد- نەلەبەرپێگەی تایبەتی، بەڵکو لەبەر ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ڕژێم و پوچەڵکردنەوەی پلانەکانیان ئامادەنەبوو دەست لەکاربکێشێتەوەو سەریان بۆ دانەوێنێت، بەڵکو بەووتارو نوسینی نامەی ناڕەزایی ڕووبەڕووی بەرپرسانی دەوڵەت بوویەوە.

بەمشێوەیە تاکۆتایی تەمەنی ڕژێمی شاهەنشاهی و سەرەتای ئینقلاب، کەدەکاتە کۆتای ساڵی(١٣٥٧) بەوەزیفەی حاکم شەرعی مایەوەو دوای وەفاتی مامیشی(موفتی کوردستان)بە ئەو -کاك ئەحمەد-سپێردرا"[١].

*****

[١] کاك حەسەنی ئەمینی: یاد ایام...(چاوپێکەوتن)،گۆڤاری راه ما،ژ.٣، بەخشی یەك ، لا ٢٤-٢٥.

# ڕووبەڕوو بوونەوەی موفتی زادە بەرامبەر ڕژێمی شاه و دەزگای ساواك

قسەكردن دەربارەی ستەم و زوڵم و زاڵمی(ڕژێمی شاهەنشاهی ئێران) و دەزگا داپڵۆسێنەرەكانی(ساواك)ەوە هەرچی بڵێیت و هەرچی بنوسیت، هێشتا هەركەمەو هەقی خۆیت پێنەداوە، بۆیە لێرەدا ئێمە باس لەو زوڵم و ستەمانە ناكەین، ئەو ڕژێمە دیكتاتۆری سەركوتكەرە بەسەر كورد و گەلانی ئێراندا هێناوییەتی، خوێنەر لەم بارەیەوە دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ئەوسەرچاوانەی لەو بوارانەدا نوسراون و باسی حاڵی گەلانی ئێران دەكەن لەو كاتەدا.

كاك ئەحمەد، لەیەكێك لە وتارەكانیدا ناوی كە سایەتییەك دەهێنێت و باسی دەكات، كە چۆن(ساواك) بۆ دان پێدانان تا ئەژنۆكانی دەكەنە ناوڕۆنی گەرمەوە، دەشتوانین خودی سەرهەڵدانی ئینقلاب لەناوگەلانی ئێراندا بەباشترین نمونە وەربگرین، كەهۆكاری سەرەكی ئەو تەقینەوە گەورە جەماوەرییە لەئەنجامی ستەمەكانی دەسەڵاتی(شا و ساواك)ەوە بووە، بەڵام ئەوەی ئێمە لێرەدا دەمانەوێت، ئەگەر بەكورتیش بووە تیشكێكی بخەینە سەر ئەو ڕووبەڕوو بوونەوانەیە(كاك ئەحمەدی موفتی زادە)یە لەماوەی تەمەنیدا، لەگەڵ ڕژێمی شادا ئەنجامی داوە، چونكە ئەوەدەزانین(موفتی زادە) تاكاتی وەفاتی بەدوو قۆناغ لە دەسەڵاتا تێپەڕ بووە، قۆناغی یەكەم دەسەڵاتی شایە، قۆناغی دووەم دەسەڵاتی جمهوری ئیسلامی ئێرانە، خۆی بەتەواوی هێزەوە بۆ قۆناغی دووەم كاریكردو و

دژی تێپەڕاندنی دەسەلاتی شا بوو، بەلاّم بەداخەوە لەهیچکام لەو دوو دەسەلاّتە خۆشی نەدی و تامی زیندان و ئەشکەنجەو ئازاری هەردووکیانی کرد!!

دژایەتی و ڕووبەڕوو بوونەوەکانی(موفتی زادە) دژی دەسەلاّتی شاهی ئێران، لەو کاتەوە دەستی پێکرد لە کوردستانی عێراق گەڕایەوەو هەستی نەتەوایەتی پالّی پێوەنا ببێتە ئەندامی دیموموکرات، لەو چاوپێکەوتنەی ڕۆژنامەی(تهران مصور) لە(١٣٥٨/٤/٣)، لەگەلّیدا ئەنجامی داوە، لەسەرەتای چاوپێکەوتنەکەداو بەچەند دێڕێك(موفتی زادە) دەناسێنێت و دەنوسێت "خوێندنی خۆی لە حوجرەو قوتابخانە ئیسلامییەکانی کوردستای عێراق و ئێران تاپلەی ئیجتیهاد بەردەوام بووەو گەیاندییە کۆتای. لەسالّی(١٣٢٨) چووە ناوکێشمە کێشمە سیاسییەکان و لەسەرەتای بەرگری کردندا بەهاوکاری هاوڕێکانی ڕۆژنامەی دەست نووسی دەرکرد، لەسالّی(٣٠ بۆ٣٢) لە(سنە) ئەم ڕووبەڕوو بوونەوەیی بەردەوامی پێداو لەسالّی (١٣٣٦) چووە(تاران) و بەرنامەی کوردی ڕادیۆی ئێرای ڕێکدەخست و لە زانکۆی تاران لە کۆلێژەکانی(ئیلاهییات و ماف و فەلسەفەو مەزهەبە ئیسلامییەکان)ی وانەی دەوتەوە، دواتر ڕۆژنامەی(کوردستان)ی دەرکردو و لەلایەن(ساواك)ەوە قۆلّ بەستکرا، لە(قزل قلع)ە زیندانیکرا و دوای ئازادکردنی کۆششەکانی خۆی لەکوردستان بەشێوەی وتاردان و بانگەشەکردن، تاوەکو ئێستا بەردەوامی پێدا"[1].

وەك لەسەرەتای ئەم کتێبەشەوە باسکرا بەتەنها خودی دەستگیرکردنی(موفتی زادە) لەسەر کوردایەتی ئەوە دەسەلمێنێت تاچی ئەندازەیەك دژایەتی ڕژێمی شای

[1] گفتوگو با علامه موفتی زاده، روزنامەی (تهران مصور) (٣/٤/ ١٣٥٨ )

ئێرانی کردووە*، لەیەکێك لەباسەکانیدا خۆی دەیگێڕێتەوە، ئەوکاتەی لەڕادیۆی کوردی تاران کاریکردووە، هەواڵیان پێداون(شا) سەردانیان دەکات و هەموو دەکەوێتە خۆی، دەگێڕێتەوە"(شا) گەشت و کەوتە قسەو باس لەگەڵی لەماوەی قسەکردنەکانماندا من هەر دەمووت(من واو من ئەوەو ....)، واتە ووشەی(من)م بەکاردەهێنا، دواتر کە(شا)ڕۆشتەوە ئەوانەی کاریان لەگەڵ دەکردم سەرەکۆنەیان دەکردم، -چۆن لەبەرامبەر(شا)وە دەبێت ووشەی(من) بەکاربهێنیت؟-". بەڵام دیارە غیرەتی(کاك ئەحمەد) هەرگیز ئیجازەی ئەوەی پێنەداوە لەبەرامبەر شاوە بترسێت و نەوێرێت قسەی لەگەڵ بکات.

دژایەتی کردنی(کاك ئەحمەد) بۆ (ساواك) و ئەزییەت وئازاردان و بێ بەشکردنی(ساواك) لەبەرامبەر کارەکانییەوە دەگاتە ئەوئاستەی، لە تاران ڕێگری لێدەکەن، وەك مامۆستای زانکۆ لەوانە ووتنەوە بەردەوام بێت. کاك ئەحمەد لەکاسێتی(ئەمانەت)دا بەمجۆرە باسی هەوڵ و ڕووبەڕوو بوونەوەکانی خۆی دەکات"چەند ساڵ لە-سنە- کارم کرد، موشکیلاتم بۆ پێش دەهات، ئەویش داستانی تولانی هەیە، ئەوچەند ساڵەی سنە دوای ڕووبەڕوو بوونەوەو هەراو بەزمو جەنجاڵی دروستکردن و ئیحساساتی تەبلیغ کردن و هەندێکجار خەریکبوو لەسنەدا شەڕی قورس دروست ببێت، ناشییانە(نەشارەزایانە)، ئاخری نائومێدبووم و بڕیارمدا بڕۆم بۆ تاران، پێم وابوو لەپاڵ زانکۆدا وانە بڵێمەوەو بچمە زانکۆ باشتر

---

*) لێرەدا گرنگە، ئەو تێبینییە بۆ خوێنەران ڕونکەینەوە، هەرکاتێك باس لەهەوڵەکانی(کاك ئەحمەد)ەکەین بۆ نەتەوەکەی، بەمانایی ئەودنایەت ئێمە بێین ئەو کارانەی (موفتی زادە)پێی هەڵساوە بەنەتەوەیی کوردو خوێنەرانی بفرۆشینەوەو بمانەوێت لەوبارەوە نیشانەیەکی تایبەت بدەینەپاڵی، هۆکاری دووبارەکردنەوەی ئەو دەستەواژانە، تەنها لەبەرئەودیە هەموو ئەو هەڵانەی بەرامبەر مێژوو کۆششەکانی ئەم پیاوە کراوە ڕاستی بکەینەوە.....(نووسەر).





دەتوانم كاربكەم، ئەویش چەند ساڵی(تاران و هەوڵ و تەلاشێك كەدەمكرد بۆئەوەی بچمە زانكۆ و موخالەفەتی (ساواك)، ئەمەش باسێكی دوورو درێژەو نەكراو نەكرا، هەرچۆن بووكاری زانكۆ رێككەوت، بەلاّم(ساواك) جلەو گیریكردو و پەكی خست و نەیهێشت".

دیارە دوابەدوای ئەو هەوڵ و ماندوو بوونەی موفتی زادە، لەگەڵ چەند كەسێك كاردەكات و رۆژنامەی(كوردستان) دەردەكەن، پاش ماوەیەك، وەك پێشتر باسكرا لەبەر كوردبوون و دیموكراتی بوونی دەگیرێت، لەگەڵ مەرەخەس بوونیدا(ساواك) داوای لێدەكەن كاریان لەگەڵ بكات، ئەوە روونە هەركات هەر دەزگاو لایەنێك كەسێك دەزگیر بكات راستەوخۆ داوای لێدەكەن واز لەو كارە بهێنێت، كە لەسەری گیراوەو لەگەڵ ئەمان كار بكات، داواكاری(ساواك) لە(موفتی زادە) تاكاتی لەناو چوون و نەمانیان درێژەی دەبێت، بەلاّم خۆڕاگری و ئیمان و ئەو بڕیارانەی بە پەروەردگاری داوە هەرگیز ناهێڵن لەخشتە ببرێت و بەسەر لەقاندنێكیش ڕازی بوون بۆ(ساواك) و دەسەلاّتی شاە دەربڕێت.

كاك ئەحمەد خۆی دەڵێت"ئەگەر كەمێك لە(ساواك) نزیك بوومایەتەوە، ئەوكاتەی لەزیندان ئازادكرام وەعدی كاری زانكۆی(حقوق و ئیلاهییات )یان پێدا بووم"، بەلاّم هەر بەوجۆرەی ووترا تاران بەوهەموو خۆشی و ڕەفاهییەوە جێ دەهێڵێت و ڕوودەكاتەوە(سنە).

عیسا پژمان*، لەیەكێك لە چاوپێكەوتنەكانیدا ئەو شایەتییە بۆ موفتی زادە دەدات، كە چۆن (ساواك) زۆرینە ئەو كەس و لایەنانەی بە پارە كڕیوە كە كاتی

---

*) عیسا پژمان كوری عەبدولا لە ساڵی (١٣٠٣)لە (سنە) لەدایك بووە. لە زانكۆی میللی بەكالۆریۆسی لە یاسادا وەرگرتووە، دوای ئەوەی خزمەتی سەربازی تەواو دەكات پەیوەندی بە (ساواك)ەوە دەكات و تاساڵی

خۆی بەجۆرێك لە جۆرەكانی كەسایەتییەكی دیاریان هەبووە، یان لە دەزگاو ڕۆژنامەیەكدا كاریانكردووە. بە قسەی (پژمان) ئەو ڕۆژنامەی لە تاران دەرچووە بە ناوی (كوردستان)ەوە ئەم دەریكردووە و بۆ مەبەستێكی سیاسی بووەو (دەزگای ساواك) ڕاستەوخۆ پارەی داوەتێ، لەو كاتەشدا(كاك ئەحمەد) كاری لەگەڵ كردون، بەلاّم دەڵێت"ئەحمەدی موفتی زادە پارەی وەرنەگرت، تەنها خەریكی وەرگێڕان و نووسینی بابەت بوو دەربارەی نوێژ و ڕۆژوو، كاتێكیش هەركە زانی لەلایەن ساواكەوە بەڕێوە دەچێت ئیتر هیچی بۆ ڕۆژنامەكە نەنووسی"[1].

شەڕ و زەختی زۆری ساواك و ساواكییەكان بەرامبەر موفتی زادە بەتەواوەتی لە سنەوە دەست پێدەكات. دەزگای ساواك، لەماوەی كاركردنیدا بەجۆرێك پەلوپۆی لەناو خەڵكیدا بلاّوكردۆتەوە، كە هیچ گەڕەكێك لە ئێراندا نەبووە ماڵێك یان چەند ماڵێكی سەر بەساواك نەبووبن و كاریان لەگەڵ ساواكدا نەكردبێت، كاك ئەحمەدی موفتی زادە لەوباسەیدا بۆ دانیشتوانی مزگەوتی(پیر محەمەدی) دەكات ئەوەدەڵێت "لەسەرەتاوە كە چووینە مزگەوت چەند نەفەرێك بووین، پێش ئەوە یەك دوو ساڵێك بوو لەماڵدا ئازایەتییەكیان پەیداكردبوو (مەبەستی ئەو چەند نەفەرەیە وانەیان لاخوێندووە لە ماڵەوە و گوێیان بۆ قسەكانی گرتووە)، هاتن و دادەنیشتن لەوەو دوا ئەوان پێشنیاریان كرد، ئەم بەرنامەیە بابەینە مزگەوتی (سەید مصتەفا) تا ماوەیەك لەو ژمارەی لەماڵەوە دەرسمان دەخوێند كەس نەبوو، بەلاّم

---

(١٣٥٥) لەو پۆستەدا بەردەوام دەبێت. پژمان، سەرۆكی پێشووی نوێنەری ساواك بوو لە عێراق، هەروەها سەرۆكی پێشووی بەڕێوەربەرایەتی ئیتلاعاتی تەواوی ولاّتی -پێش ئینقلابی ئیسلامی- لە ئەستۆدا بووە...(www.ayandeh.nu/bilder/٩٦١٧pejman.)

[1] عیسا پژمان: من شۆڕشم هەڵگیرساند، خۆشم كوژاندمەوە. سامان حاجی كەریم، بەڵگەنامە، ٢٠١٠/٢/٥ پێگەی(www.kurdistanpost.net).





وورده وورده خەڵك ئیزافە بوو، لەوەو دوا تەهدیدێك موستەقیم و غیر موستەقیم لە تەرەف ئائەم دەزگا پلۆسێنەوە واله چوارده قەڕنی ڕابردوو زیاتر توانی خیانەت بكات بەموسوڵمانانی ئەم وڵاتە،-یانی(ساواك)- (سازمانی ئەمنییەت) هەڕەشەكرا لەخەڵك هەندێ لەهاوڕێیان بوون ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ لەڕێگەی كەسانی ترەوە پێیان وتین نەیەینە دەرسەوە ئەم هەڕەشەكارێكی كرد، دوای ئەوەی ژمارە بوویە (٦٠-٧٠)نەفەر لەهەفتەی داهاتوودا كەم بویەوە تەقریبەن هەر بوویەوە بەژمارەكەی سەرەتا، ئەوانەی لەسەرەتاوە بەشەهامەت بوون و نەدەترسان و دەهاتن هەرئەوان بوون، هەر بەردەوام بووین و دڵمان ساردنەبوویەوە(١٥-٢٠) نەفەر بەغیرەت و ئازا پەروەردە ببێ دەتوانێت كۆمەڵگایەك بجوڵێنێت، لەسەری چووین تا دووبارە خەڵك هاتنەوە، ساواك وایكردوو خەڵكی دەیان ووت"حەز دەكەین بێینە ناوبەرنامەكانت، بەڵام ئەترسین، فەرمانبەرین و ژنمان هەیە و مناڵمان هەیە، مەجبورین ئیحتییات بكەین." بەڕاستی ئەم(ساواك)ە دوابڕاوە، وەك دێو سام و هەیبەتی خستبوو بەسەر خەڵكداو ئەم شایعاتە لەناو خەڵكا بوو، لەكۆندا وا باوبوو لەهەر شوێنێكدا چەند موسوڵمان كۆببنەوە دەیانووت حەتمەن یەكێكیان خۆشەویستی خوایە، لەسەردەمی ساواكدا وای لێهاتبوو لەساڵی(١٣٣٢)، كە كودەتاكراو ئەمریكا شای هێنایەوە و لقێك لەم دەزگای(CIA)ی خۆی لە ئێراندا دامەزراند بەناوی(سازمانی ئەمنییەت)، كەپێیدەڵێت (ساواك) لەمەولا ئەو عیبارەتە گۆڕابوو، موسوڵمانان وا بیریاندەكردەوە، ئەگەر لەشوێنێكدا چەند نەفەر كۆببنەوە حەتمەن یەكێكیان(ساواك)ییە، ئەمە ئاوای لێهاتبوو، هەتا لەناو ماڵی خۆیاندا چەند نەفەر خانەوادە، ژن و پیاو دادەنیشتن، یان منداڵیان لەگەڵدا بوو براو خوشكیان لەگەڵدا

بوو زاتیان نەبوو(نەیاندەوێرا) دەردە دڵی خۆیان بڵێن، زاتیان نەبوو پڕ بەدڵ ئاخێك هەڵکێشن بەدەست زوڵمەوە، ئەگەر دەڕۆشتن بەدەزگاو دائیرەکاندا نارەحەت دەبوون و ئازاردەدران و دەبران لەسەر پەیکەرەکان گوڵ بارانبکەن، دەگەڕانەوە ماڵەوە ئارەزوی ئەوەیان هەبوو بیان توانیایە بەدڵ بیژن(ئاخ)، زاتی ئەمەیان نەبوو ئاخێك بەدڵ هەڵکێشن، لەبەرئەوەی وا باوبوو هەر(دوو،سێ) نەفەر بەیەکەوە دابنیشن شەیتانێکی تێدایە، ساواکییەکی تێدایە"[1].

پاش ئەوەی موفتی زادە، لە تارانەوە دەگەڕێتەوە شاری سنەو توشی ئەونەداری و هەژارییە دەبێت لە ڕووی ئابورییەوە ساواك سەردەکاتە گیانی، و ئەو حاڵەی موفتی زادە بەهەند وەردەگرێت و وابیردەکەنەوە دەتوانن لەم نەدارییەدا بیگرن و بیکەنە داردەستی خۆیان، ئەمە جگە لەوەی کەسە نزیکەکانی خۆی زۆری بۆدەهێنن و داوایلێدەکەن ئەگەر بەکەمترین هاوکاریش بووە هاوکاری ساواك و دەستەڵاتی شاە بکات، بەڵام دیارە پیاوی گەورەو دڵ زیندوو هەرگیز بەشتی بچوکی ماددی ناخەڵەتێت و چۆکدانادات و تەسلیم نابێت، کاك ئەحمەد ئەوکات دڵی ساغ بوو، (عەبدوڵای کوڕی مەسعود)دەربارەی دڵی ساغ و نەخۆش دەفەرموێت"ئێوە دەبینن کافر لەشی لەهەموو کەس ساخترە، بەڵام دڵی زۆر نەخۆشە، دەبینن ئیماندار دڵی لەهەموو کەس ساخترە، و بەڵام لەشی نەخۆشە، سوێند بەخوا، ئەگەر بێت و دڵتان نەخۆش بێت، بەڵام لەشتان ساخ بێت ئەوە لەلای خوا زۆر بێنرخترە لە خلێنکە"[2]. ڕاستە کاك ئەحمەد، لەڕووی مادییەوە لاشەی نەخۆش بوو، ئەمما دڵێکی هێندە ساغی هەبوو لەبەرامبەر هەزار ساڵ نەداریدا

---

[1]) کاسێتی ژمارە (٧)،سخنرانی در مسجد(پیر محەمەد)(٨٠)،A.

[2]) ابن قیم الجوزیە , ئاوێتەی دڵ ( الفوائد), و .فەرمان عزیز نەجار ٢٠٠٨، لا ٢٩٤.

خۆی ڕادەگرت. دەربارەی چۆنییەتی ڕووبەڕوو بوونەوەی داواكانی ساواك و هەندێك لە خزمانییەوە بەجۆرە باس دەكات"لەتاو ئەو جۆرە لەژیان، كە من و خێزانەكەم هەمان بوو جێگەی قبوڵ نەبوو، دوای ئاشكرا بوونی ئەوەی ئێمە بەوجۆرە ژیان دەگوزەرێنین ماجەرا شروع بوو، فشاری بنەماڵەو دۆست و ئاشنا دەنگی دایەوە دەبێت ڕەوشم بگۆڕم، خوێنەوار و نەخوێنەوار هەمیشە سەریاندەكردە جەرگم، ڕۆژی واهەبوو چەند جەلەسەی چەند سەعاتی باسدەكراو زۆریان لێ دەكردم، چەند ساڵ بەوجۆرە بووم، منیش هەر كەس بەپێی دەرك و تێگەیشتنی خۆی وەڵامم دەدایەوەو بڕێكم هەر لە ملدەكردەوە....... ئیتر قەزیەكە تەواو ئاشكرابوو، كۆمەڵێك كەس هەر لەناسراوانی خۆمان پەیوەندیان لەگەڵ( ساواك) هەبوو، كەسانێكیش هەبوون پەیوەندیان بەساواكەوە نەبوو، بەڵام ساواك پەیوەندی لەگەڵ دروستكردبوون و چووبون بۆ لایان، ئەمانە هەمووی دەنێردران بۆلای من تا ناچارم بكەن نزیك ببمەوە لە(ساواك) باسەكە دوورو درێژە ....ئەوكاتە هەر ئەوەندە پێم ناخۆش بوو، باشە ئەمانە بۆچی ئاوا كاتم لێدەگرن؟ بۆ دەبێت مێشكم مەشغوڵ ببێت بەشتی واوە؟!!

ئەم قسەو باسانە ئیتر كاریگەرییەكی نەبوو لەڕۆحی مندا، بەڵام دووجار وورده وورده خەریك بوو شتەكان كاربكەن لە دڵم. جارێكیان خەریك بوو یەك لایی ببێتەوە، لەلایەكەوە باری ئابوریم كەم بوو زیندەگیەكەم سەخت بوو، دیارە نەفسیش قبوڵی هەیە، لەلایەكی تریشەوە فشاری خانەوادەو تایفە كەبەڵگەیان دەهێنایەوە ئەهلی عیلمیان-مەبەست ئەوەیە كەسی شارەزایان لەبواری دینیدا زۆربووەو دەلیلی دینیان بۆهێناوەتەوە، كەئاساییە دەكرێت هاوكاری ساواك بكات- زۆربوو بە ئایات و ئەحادیس قسەیان دەكردو زۆر بەدڵەوە بوون، دەی دەی ئەمانە

كاریدەكرد. وورده وورده هەر وەك ئەو ڕووداوانەی لە دەفتەری ئیسنادی تاران ڕوویان دا*، كەدەفتەر(نوسینگە) كەم داگیركردبوو بە تەئویل حەلاڵم كردبوو بۆ خۆم، خەریك بوو زیهنم وورده وورده موتەمائیل بێت بەتەئویل، كەمەسەلەن قەیچێكا بامن هیچ قەولێك نەدەم و كاربكەن، مەجموعەن(چوار) مەسەلە مەترەح بوو بوو لەنێوان من و ساواكدا، دوانی سلبی و دوانی ئیجابی.

سلبیەكان ئەوە بوون، من لەگەڵ هیچ حیزب و گروپێكی موخالیفی حوكومەت هاوكاری نەكەم، بانگەشەی دژی حوكومەت نەكەم.

ئیجابیەكان ئەوە بوون، یەكجار قسە لەبارەی پارێزگاری لە(شاه) بكەم، هەروەها هاوكاری ساواك بكەم.

لە زهنی خۆما دەمووت قەیناكا ئەو دووانە ناكەم. نەقسە لەبارەی پارێزگاری لەشاوە دەكەم، چونكە ئەگەر هات و دفاعم لە(شاه)كرد ئەمە غەڵەتێكەو بۆ خۆشم ئیتر ناتوانم تەئویلی بۆ بدۆزمەوە بیكەمە شتێكی مەشروع(شەرعی)، دەزانم دوژمنی ئیسلامەو هەركارێك دەیكات فڕوفێڵەو قابیلی تەئویل نییە، هەروەها هاوكاری لەگەڵ(ساواك) ناكەم، وەلێ مەسەلەن لەگەڵ هیچ گروپ و حیزبێك ناتوانم هاوكاریبكەم، چی ئەوان بڵێن و چی نەیڵێن-حاڵی بووم لەكاری گروپ و حیزبەكان چۆنە-، دەربارەی جوڵەو بانگەشەی خۆشم دژی حوكومەت ئەوەش شتێكی ترەو نایكەم، خۆ بیڵێم و نەیڵێم هیچ كاریگەرییەكی نابێت، ئەگەر بیانەوێت كارێك لەرامبەری منەوە ئەنجام بدەن، چی بیڵێم و چی نەیڵێم ئەوان كاری خۆیان هەردەكەن، ئەگەر وابێت قەیدی چییە با من تۆزێ شل ببمەوە، لەگەڵیان تۆزێك ڕەفاه و خۆشی و ئاسایش بژیم ...جا وەعدەكانیان سەیربوو، دەیان ووت،

---

*)ئەم باسەش پێشتر ڕوونكراوەتەوە، كەمەسەلەی دەفتەری چی یە.

وەزارەت، پوڵی بێحیساب، هەر چییەکت دەوێت بۆ خۆت و خێزانت، بۆ بنەماڵەو دۆستەکانت ئامادەیە...... سەیر بوو!!! ئەوانەشی دەیاننارد هەربەوە هەڵیاندەناو دەیانووت(ئەوانەی کەدەهاتن بۆ لای)، تۆ(کاك ئەحمەد)دەبیتە هۆکاری ئەوەی کێشەی هەموومان چارەسەر ببێت.

وورده وورده زهنم موتەمائیل دەبوو، کەبەشەوقەوە گوێ ڕاگرم، دەشم ووت، خۆ قسەکانیان خراپ نین لەدڵی خۆشمەوە تۆزێك شت دروست دەبوو، کاکە دووجار ئەم حاڵەتەم بەسەردا هات، هەر جارەی چەند ڕۆژێك درێژەی دەکێشا، ئەوچەند ڕۆژەی ئەم حاڵەتە وجودی هەبوو، لەلایەکەوە ئیمان و تەوبەو ڕاگرتنی ئەو تەوبەیە، لەلایەکی دیکەشەوە نەفسانییەت و پەیوەندی بەخۆش بوونی ژیانم و خەتەری شکاندنی تەوبە،و ئازارێکی دەدام بەڕاستی وەسف ناکرێت!!، هیچ کاتێك، هیچ شەڕێکی دونیایی ئەحواڵی ئاوا دروست ناکات کە من هەم بوو، بۆئەوەی بۆتان ڕۆشن بێت فشاری دەرونیم چەندێك بوو، لەوکاتانەدا کە ئەو دوو حاڵەم بەسەردا هات، سەرم داخ دەبوو(گەرم دەبوو) گڕی لێ بەرز دەبوویەوە، لەدوری چەند سانتیم مەترێکەوە دەستم لە پشتی سەرمەوە ڕادەگرت هەستم بە گەرمای سەرم دەکرد، کەدەیدا لەدەستم. جگە لەو دووجارە ئیتر ئەو حاڵەم نەدیوەتەوە، تەنها ئەو دووجارە ئەو حاڵەم بەسەردا هات، بووە جار جار سەرم داغ بووەو هاتۆتە ئێش، بەڵام نەبەوجۆرە لە دووری چەند سانتی مەترێکەوە گەرما بدات لە دەستم!! ئەو جارەی مەبەستمە لێرەدا باسی بکەم، چوو بووین بۆ سەرە خۆشی کەسێك کە وەفاتی کرد بوو لەدێیەك لەناوچەی(دیواندەرە) بەناوی(کەوڵە)، دوای عەسرێك بوو لەناو ئوتوبوس(پاص)کەدا، لەپێشەوە دانیشت بووم لەلای شۆفێرەکەدا لەسەر کورسییەکی بچکۆلەی چوار قاچ، گەشتینە پێچ و قەمچێك لە نێوان(حسێن ئاواو

سنە)، خەو گرتبوومی و بەرەو خۆریش ئەهاتین، پێچی زۆری تێدا بوو، سات، سات خەوم لێدەکەوت و سەیارەکە پێچی دەکردەوە، یان خۆر دەیدا لە ناوچاوم خەبەرم دەبوویەوە، جارێکیان ئاخرین چرکە بوو داچلەکام و ئیتر خەو نەیبردمەوە، (لە خەوەکەدا) پێموابوو ئەوەتام لەکێوێکی بەرزداو خەریکم بەرەو خواردێم، چاوم لێوەبوو دەشتێکی پانی فراوان لەدوورەوە لەتەرەفی قیبلەوە، کەمنیش خەریك بووم بەرەو قیبلە دەچوم دوونەفەر دانیشتبوون، یەکێکیان پێغەمبەر بوو(ﷺ)، ئەوی تریان حەزرەتی عومەر(ﷺ)، زۆر دوور بوون ئەوەم دەزانی، شێوازی دانیشتنەکەیان بەو جۆرە بوو، پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو باکوری خۆرئاوا لەسەر ئەژنۆکانی لە دوری تەقریبەن یەك مەتر زۆر تر یان کەمتر، حەزرەتی عومەریش دیسان لەسەر ئەژنۆ لە بەرامبەرییەوە.

هێشتا هیچ باسێك لە نێوانیاندا نییە، بەڵام خۆشم نازانم چییە؟! لەدڵەوە دەزانم پێغەمبەر(ﷺ) ئامۆژگارییەکی حەزرەتی عومەر(ﷺ) دەفەرموێت ...کەس پێی نەوتم ئەوە پێغەمبەرە(ﷺ)، ئەوەش حەزرەتی عومەرە و باسێك لەنێوانیاندا هەیە، هیچ، هەروا وەك عیلمی خەونی زانیم، زۆریش دوربوو، شەوقێکی زۆر دای لەسەرم ووتم باڕابکەم تا باسەکەی نەفەرمووە بگەم خزمەتی و بەگوێی خۆم بیبیستم بزانم چی دەفەرمووێت؟

ڕامکرد بەخێراییەکی زۆر عەجیب، هیچ هەر بێدەنگ بوو هیچی نەفەرموو... نزیك بوومەوەو هاتە قسەو بیستم (یا عومەر ما رایا بیەتی زمانی)، واتە ( ) ڕستەکە تەواو نەبوو سەیارە پێچی کردەوەو خۆردایە ناوچاوم و خەبەرم بوویەوە. لەسەرەتاوە داغ و حەسرەت زهنیم بوویە داخێکی یەکجار گەورە لەدڵما. دوای ئەوە گەشتینەوە شاری سنە و چوومە ماڵەوەو وورده وورده حاڵەتی ئەو داغ و

حەسرەتە ڕەوییەوەو زهنم ڕۆشن بوویەوە و كەوتمە فكر، ئاخر مەسەلەكە چی بوو، هاتەوە بیرم و مەتڵەبەكە گەشتە زهنم، مەتڵەبەكە ئەوە بوو، كاتێك دونیا ئاساییەو زوڵم و هێز و فشارێكی نەبێت مرۆڤ باری تەقوا بگرێت هونەرێكی تێدا نییە، كاتێك زوڵم زۆر بێت و دەسەڵات پەیدا بكات و حەق لە هیچ لایەكەوە نەتوانێت سەر بەرز بكاتەوەو، لەگەڵ فشارێكی ئاوا تەقواو ئیمان دەكەوێتە دەرەوە، كەوتەوە بیرم كە مەتڵەبەكە لە عەینی كاتدا پێم گەیشت، كە پێغەمبەر گیان چی دەفەرموێت، ئا ئەوا مەتڵەبەكە هاتەوە بیرم و كەمێك لەناو كتێبی حەدیس گەڕام بزانم باسێكی وا هەیە، ئەمجار لە قورئان سودم وەرگرت، قورئان و سوننەت بۆ هیدایەت و ڕێنمونی ئینسان تەواوكەری یەكترن، بۆ بابەتێك ئەگەر لە سوننەت باش حاڵیت نەبێت بگەڕێیتەوە بۆ قورئان تێدەگەیت.

سەیرمكرد لەجێیەكدا قورئان بەحسێك دەفەرمووێت، كاتێك باران دەبارێت شیوو دۆڵ جیاواز و هەركام بەئەندازەی زەرفییەتی خۆیان لافاو هەڵدەگرن و كەف و كوڵێكی پڕ عەزەمەت دەكەوێتە سەر ئەولافاوەو، كە قیافەی ئاو دائەشارێت و هیچ دیارنییە، جگەلە كفوكوڵ و پێت وایە ئاونییە، بەلاّم وورده وورده زەمان دەگوزەرێت سیستەمی ئەم جیهانە وایە، سروشتی ئەم جیهانە وا دانراوە هەر شتێك لەگەڵی جۆر بوو نەواحەقەو بەكارهاتووە ....دەفەرموێت(قورئان) ئاو سازگارە لەگەڵ ژیاندا، ئاو دەمێنێتەوە، بەلاّم ئەو كەف و كوڵە لەناو دەچێ...لە بابەتەكانی دواتریشا دووبارە باسی لەو(كورە)دەكات (فلزات)ی تێدا دەتوێننەوە، ئەوكاتەی فلزەكە دەتوێتەوە ئەو كەفەی دەكەوێتە سەرەوە ئەوە خەوش و خاڵی فلزەكەیە، و فلزەكە خۆی دیارنییە. ئەمە دوو نمونەیە بۆ ئەحواڵی كۆمەڵایەتی و خودی حەق و باتڵ هەندێ كات هەیە لەناو كۆمەڵگادا، باتڵ دەكەوێتە ڕوو حەق

موتڵەقەن دیارنییە، بەڵام سروشت و فیترەتی ئینسان، وەك سروشت و فیترەتی دونیا وایە. لەو بابەتەی پەیوەندی بە سیستەمی گەردونییەوە هەیە، ئائەو چەمكە سازگارە لەگەڵ سروشتی ژیاندا، لەگەڵ سروشتی مەوجوداتی گیاندارانداً ئەوەحەقەو دەمێنێتەوە، ئەوەی دیكە بەفیڕۆ دەچێت سازگار نییە لەگەڵیداو لەناو دەچێت.

بابەتەكانی كۆمەڵگاش هەر بەو جۆرەیە...سەیردەكەم ئەم ئەوزاع و ئەحواڵەش كەمنی تێدام هەروایە، ئەوەی حەق و ڕاستیە دیارنییە، و ناحەق زاڵەو هەر خۆی حسابە، جائەوە حسابە ئیمان هەیە، ئێستا لە پێشترم تەوبەكەم كەوتەوە بیر، ئایا خەریك نیم بەجۆرێك لە جۆرەكان لەبەرامبەر(ساواك)ەوە ئیسلام نەڵێم و تەبلیغی خۆم نەكەم؟

دوای ئەوەی ئەم خەوەم دی شوكر بۆ خوای گەورە تەواو بوو، جارێكی تر ئەو قسەو باسانە سەری نەكردەوە، ئەوجارەش خەریك بوو توشی تەوبە شكاندنبم، ئاوا ڕەحمەتی ئیلاهی گەشتە فریام و نەجاتی دام"[1].

كاك ئەحمەد، لە ژیانی خۆیدا نەك هەرئەوەی هاوكاری شاو ساواك ناكات، بەڵكو لەسوككردن و هێرشكردن و ڕیسوا كردنیان وچانناداد. بۆ لابردنی كەف و كوڵی باتڵ كەحەقی داپۆشی بوو، وەك دەریا شەپۆل دەدات و ئەوەی لەگەڵ دین و ئینسانددا نایكرێت لە ناوەڕاستی دەریاوە دەیخستە سەر شەپۆلی وتەكانی و دەیدان بە تاوێرە بەردەكانی قەراغی كۆمەڵگاداو ووردو خاشی دەكردن، ئەو تەنها كاری بۆ ئەوە نەكردووە میللەتی كوردی ستەمدیدە لەدەست و پێوەندی شا ڕزگار بكات،

---

[1]) كاسێتی ئەمانەت

بەڵكو بەتەواوی قەناعەتیەوە كاری بۆ هەڵكەندنی كلتورو فەرهەنگی حوكومەتی (شاه)ی كردووە*.

كاك ئەحمەد، لە وتارە بەناوبانگەكەی(بۆكان)یدا، بەجۆرێك قسە بەشاو دارو دەستەكەی دەڵێت بە(فیرعەون)ناویان دەبات لەبەشێكی قسەكانیدا دەڵێت"ئێران زۆر سەری نابەلەغاوەوە، زۆر پاڵی نابەخەڵكەوە، دەستیكرد بەهەموو خودسەرییە، هەروەك فیرعەونە مەشهورەكانی مێژوو، فیرعەون دەیووت"هیچ گەورەیەك شك نابەم بۆ ئێوە جگە لە خۆم، هیچ كەسێك مافی یاسادانانی نییە بۆ ئێوە جگە لە خۆم". دەستیكرد بەوەی ئیهانە بەمەرجەعییە دینییەكان بكات، هات مێژووی كۆچكردنی(محەمەدی كوڕی عەبدولاّ(ﷺ) خەت بەسەرداكێشاو مێژووی(كۆرشی) گۆڕبەگۆڕی زیندووكردەوە، شوكر بۆ خوا شكستیان خوارد. پێیان وایە(چواردە قەرنە) هەوڵ دەدرێت ئەو میللەتە موسوڵمانەی ئێران بگەڕێننەوە بۆ مێژووی نەنگی شاهەنشای بەر لەئیسلام، پێیان وابوو تازە میللەت مردووە دەكرێت ناوی(محەمەد) لابرێت و ناوی(كۆرش) زیندوو بكرێتەوە ... زۆر گەوج بوون وایانزانی میللەت مردووە، بەڵێ ئەوان گەوج بوون، بەلاّم بەقازانجی ئێمە تەواوبوو. ڕەنگ بوو، ئەگەر ئەوەندە زیادە ڕەوییان نەكردایە لەبێنەدەبیدا میللەت ئەو تەكانەی نەخواردایە"[1].

هەروەها لەكۆڕێكدا، كەباسی ئابووری ئیسلامی و گرنگی پشتگیری ئینقلابی ئیسلامی و ئەو زیانانەدەكات حوكومەتی شاهەن شای لەمیللەتی ئێران بەگشتی و میللەتی كورد بەتایبەتی داوەو بووەتە هۆكاری دواكەوتنی ئابووری لە

---

* دەتوانرێت ئەم بابەتە لەكتێبی(٢)دا، بەناونیشانی (ئینقلابی فەرهەنگی )ەوە بخوێنرێتەوە.

[1]) كاسێتی ژمارە(٦)، سخنرانی بۆكان، (٤٥)B.

كوردستانداو خراپ كردنی گوزەرانی خەڵكی لادێ نشین، ئەویش بەهۆی ئەوەی لەوكاتەی خەڵكی لادێكان پێویستە هەستن بەجێ بەجێ كردنی كارەكانی خۆیان، وەك ئەوەی لەوەرزی(بەهار)دا تۆوەكانیان بنێژن، یان لە وەرزەكانی دیكەدا، كەپێویستە دروێنەی بەروبوومەكانیان بكەنو شەنو كەوی گەنمو جۆكان بكەن، حوكومەتی شاهەنشای لەرێگەی جەندرمەكانییەوە هەڵدەكوتێتە سەرخەڵكی لادێكان و بەبیانووی، ئەوەی فلانە كەس تۆ دەعوات لەسەرقەیدكراوەو فلانە جوتیار تۆ لەلایەن دادگاوە بانكراوی، ئەوانیش دەست لەكارەكانیان هەڵدەگرن و دەڕۆنە دادگاو لەوێ یان دادوەر ئامادە نییە، یان دەزگا تەعتیلە(پشووە)، یان هەر درۆیەك لەوكاتەدا دەیكەن، بۆئەوەی ئەوكەسانە بێزاربكەن و لەكارەكانیانبكەن، و ئیش و كارەكانیان بۆ چەند ڕۆژێك دوادەخەن، ئەمەش دەبێتەهۆی ئەوەی ئەوجوتیارانە لەئیش و كاری كشتوكاڵی دوابخەن، دوای باسكردنی ووردی ئەم كێشانە، كەدەسەڵاتی شا ناویەتیەوە، دێتە سەرئەوە، یەكێك لەو تاوانانەی ڕژێمی تاغوتی( شا) بەرامبەر میللەتی كورد ئەنجامی داوە، بریتیە لەقەدەغە كردنی زمانی كوردی"خوای گەورە لەبارەی ئینسانەوە ئاوایێگەی گرنگییەك باسدەكات(الرَّحْمَنُ*عَلَّمَ الْقُرْآنَ* خَلَقَ الْإِنسَانَ*عَلَّمَهُ الْبَيَانَ). ڕاستەوخۆ دوای دروستكردنی مرۆڤەكان، مەسەلەی قسەكردن و زمان دەچێتە ناوەوە، بۆنمونە هەناسەدان بۆ هەرگیاندارێك، چۆن گیاندار ئەوەڵێن گرنگی ژیانی هەناسەدانە، بۆمرۆڤیش ئەوەڵێن ئەرزش بەناوی مرۆڤەوە بۆی مەترەحە، بریتیە لە(زمان و لەقسەكردن). حوكومەتگەلی تاغوتی(بەواتای قورئانی، یانی ئەوەی كە(بت) دروستدەكەن، تاغوت، یانی ئەوەی بەئارەزوی خۆی هەندێك شت دەباتە پلەی گرنگی و هەندێك شت دەهێنێتە خوارەوە. ئەمە تایبەتمەندیانە لەهەرچی لاوەیە

هەر زوڵم دەكەن). حوكومەتی شاهەنشاهی ئێران بەدرێژایی مێژووی خۆی یەكێك لەو زوڵمە عەجیب و غەریبانەی كردویەتی، ئەمەبوو میللەتیان لەومافە سەرەتاییەیی خۆی مەحرومكردووە، مرۆڤ مافی خۆیەتی زمانی ئازادبێت.

بلێ دەوڵەتی ئێران چی زەرەرێك دەكەیت، ئەگەر میللەتی كورد زمانی ئازادبێت بەزمانی خۆی قسە بكات؟!. ئاخر یاخوا بەقەدەر كورد لەناوچاوت دەربێ، ئەگەر كورد بەزمانی خۆی كتێب بنوسێت، بەزمانی خۆی ڕۆژنامە چاپ بكات، بەزمانی خۆی گۆڤار چاپ بكات، تۆ چیت لێدێت؟

لەڕاستیدا كەس نازانێت بۆ وادەكات، تەنها سروشتی زوڵم وایە. زاڵم لەبەرئەوەی سروشتی وایە زوڵمدەكات ئەگینا بپرسە لێی بۆچی دەیكەیت؟ سەیردەكەیت خۆیشی نازانێت بۆچی وادەكات سودێكی نییە. "هەموو میللەتێك لە ئێرانداجگە لەمیللەتی(فارس) لەم مافە بێبەشكراون، كەشتێكە وەك هەناسەدان بۆیان، سەیركەن میللەتی كورد لەسەر ئەم مافەی خۆی لەكەیەكەوە باج دەدات و زوڵمی لێدەكرێت!!! تەنها لەبەرئەوەی داوادەكات بەزمانی خۆیی و بەئازادی قسە بكات. لەعێراق، لەئێران، لەتوركیا، لەسوریادا، لەهەرچی جێگەیەك بێبەشكراوە".

ئاشكرایە تۆمەت و درۆهەڵبەستن بۆ ئەوكەسایەتیانەی لەكاتێك لەكاتەكانی مێژوودا سەركردایەتی بزوتنەوەیەكیان كردبێت و لەسەردەمی خۆیاندا كەسایەتییەكی دیاربن و پێگەو مەقامی دیاری كۆمەڵایەتی و سیاسیان هەبووبێت، هەر بووەو بەپێی شوێن و كاتەكانیش بەردەوام دەبێت. كاك ئەحمەدیش لەو درۆ و تۆمەتانە بێبەش نەبووە و لێرەو لەوێ، چی لەسەردەمی خۆیدا، چ لەدوای وەفاتی خۆی، كۆمەڵێك بەوەتاوانباریانكردووە، لەسەردەمی شاداو ئەوكاتەی لەتاران بووە و ڕۆژنامەی(كوردستان)یان دەركردووە لەنوسینێكدا

پشتگیری لە(شاه) و دەزگای(ساواك) كردووە، ئەگەر كەمێك مەنتیقیانە مامەڵە لەگەڵ باسێكی بەوجۆرەدابكەین لەكۆتایدا بەوەڵامی عاقڵانەی بڕواپێكراو دەگەین، چونكە زۆر بابەت و ڕووداو هەیە لەمێژوودا، یان لەسەردەمی ئێستادا، ئەگەر عاقڵانەو مەنتیقیانە بیری لێبكرێتەوە بەبێ ئەوەی پێویست بەگەڕانەوە بێت بۆ مێژووی ئەو باس و ڕووداوە بەوەڵام دەگەیت، هەر ئەوەی(ئان بیرت)ی كۆمەڵناس لەساڵی(١٩٣٢)دا دەربارەی، ژمارەی ژنهێنانی پێغەمبەر(ﷺ) دەنوسێت" كاتێك تەماشا دەكەیت پێغەمبەری ئیسلام، لەتەمەنی(٢٤) ساڵیدا یەكەمین خێزان پێكەوەدەنێت و(خەدیجە) مارەدەكات و تاتەمەنی(٤٥) ساڵی لەگەڵی دەبێت زۆر ناعاقڵانەیە، ئەگەر بوترێت پیاوێكی وا لەتەمەنێكدا، كەهیچ ئارەزوویەكی جنسی نامێنێت بڵێیت" ژنەكانی دیكەی لەبەرئارەزوی جنسی هێناوە "[١]، ئەگەر ووردبینەوە بەوەدەگەین ئەم كەسایەتیە لەڕێگەی بیركردنەوەیەكی ووردو قوڵەوە بەئاوا نەتیجەیەك گەیشتووە، زۆرێك لەباسەكانی دیكە بەمجۆرەیە. باسی پەیوەندی(موفتی زادە) و (دەزگای ساواك و دەسەڵاتی شاه)، بەهەمان هاوكێشە بەهاوسەنگییەكی عاقڵانە دەگەیت.

(حەسەنی ئەمینی)ش لەگۆڤاری(راه ما)دا ئاماژە بەوە دەدات موفتی زادەیەك هەر لە تەمەنی(١٠-١٢)ساڵیەوە كەسایەتیەكی دیاری هەبوویێت و جیهانبینییەكی تایبەتی ئیسلامیانەی هەبوویێت و لەبەرامبەر هەموو كەسێكەوە هەستی بەبەرپرسیارێتی كردبێت، تەنانەت لەبەرامبەر ئاژەڵەكانیشەوە هەستی بەبەرپرسیاری كردبێت ئێستابێت لەدەسەڵاتێكی ئاوازاڵم دیفاع بكات، دەسەڵاتێك خۆی بەدەستیان چەندجار عەزاب و دەردی سەری چەشتبێت، جگە لەوە(كاك ئەحمەد)

---

[١] www.saiedi.com/vb/showthread.php?

لەچاوپێکەوتنێکدا کەڕۆژنامەی(ئیتلاعات) لەگەڵیدا سازیداوە لەو بارەیەوە بەم شێوەیە وەڵامی پرسیارەکە دەداتەوە:

" *ڕۆژنامەی ئیتلاعات:* ئێوە تاوانبار کراون بە هاوکاری(ساواك)ی هەڵوەشاوەو ڕۆژنامەی(کوردستان)تان چاپ کردووە بۆ پاڵپشتی لە ڕژێمی شا، چەند ژمارەیەك لەو ڕۆژنامەیە لەبەردەستدایە، لەم بارەیەوە چ ڕوونکردنەوەیەکتان هەیە؟

*ئەحمەدی موفتی زادە:* ئەگەر ئێوە ڕۆژنامەی(کوردستان)تان خوێندبێتەوە، یان کەسێك بۆی وەرگێڕابنە سەرزمانی فارسی، ئەوا بۆتان دەردەکەوێت، کەنوسراوەکانی ناوئەو ڕۆژنامەیە خۆیان بەڵگەیەکن دژی ئەو تۆمەتانە. کاتێك بۆیەکەمجار ڕۆژنامەکە چاپکرا، بەندە لەڕوونکردنەوەیەکمدا دەربارەی ئەوەی هەندێك کەس چەند نەزانانە ئەوکارەیان کردووە. بڵاوکراوەیەکی تێرو تەسەلیان، لەگەڵ پاش بەندێك لەڕۆژنامەی(کوردستان) بڵاوکردبوویەوە، گوایە بەندە بەشان و باڵی(شا)دا خوێندوومەو هاوکاری(ساواك)م کردووە، لەیەکێك لەبابەتەکاندا وێنەی منیان بڵاوکردبوویەوە، ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ ئەرشیفی ڕۆژنامەی کوردستان بۆتان دەردەکەوێت پێگەو هەڵوێستی من دژ بەوتۆمەتانە چەند و چۆن بووە"[1].

هەر دەربارەی هەڵوێستی کاك ئەحمەدی موفتی زادە بەرامبەر دەزگای ساواك و ڕژێمی شاهەنشاوە، (کاك حەسەنی ئەمینی) نمونەیەك دەگێڕێتەوە، کەخۆی لەکاتی ڕوودانیدا لەگەڵ کاك ئەحمەد بووە.

"لەسەرەتای دروستبوونی(مەکتەب قورئان) ڕۆژێك لەماڵی-کاك ئەحمەد- خەریکی گواستنەوەی کەلوپەلی یەکێك لە ژوورەکان بووین، کەلوپەلی ناو ژوورەکەمان هێنایە حەوشەکەوە داماننان لەسەر ڕەفەی کتێبەکان شتێکم بەرچاو کەوت لەوەو پێش هیچ

---

[1]) ڕەزا خوسرەوی: چاوپێکەوتن لەگەڵ عەلامە موفتی زادە، ڕۆژنامەی (ئیتلاعات، ١٣٥٨/٣/٢٧ هـ. ش، بەهزادی خۆشحاڵی: عـەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو کوردستان، روزهای بحران ٤.

بایەخێکمان پێنەدابوو. دوو ڕۆژ دواتر یەکێك لەبرادەرانی -کاك ئەحمەد- کارەبا چی بوو، هات تا کارەبای ماڵەکەی بۆ چاك بکات، لەبیرمە لەوکاتەدا کارەباچییەکە -ترانستی کارەبا-خۆری پێویست بوو،

کاك ئەحمەد وتی: مەبەستی ئەو شتەیە.

ئێمەش ئەوشتەماندا بەکارەبا چییەکە، ئەو یەکسەر زانی ئەو شتە(ترانس) نییەو مادەی تەقینەوەیە(T.N.T)یە واتە ڕژێم لەڕێگەی کەسێکی خۆیەوە ئەو(T.N.T)ەی لەماڵی کاك ئەحمەد دانابوو.

بەگەیشتنی ئەم باسە بە-کاك ئەحمەد-، ووتی: دەبێت پەیوەندی بکەین بەو لایەنانەی پەیوەندیان بەمکارانەوە هەیە، چونکە زۆر ترسناکەو لەهەر جێگەیەکدا بێت لەوەدەچێت زەرەر لەکەسێك بدات، لەبەرئەوە دەبێت پوچەڵبکرێتەوە، ئێمەش نەماندەزانی پوچەڵی بکەینەوە،-کاك ئەحمەد- ناچار بوو پەیوەندی بکات بە هێزەکانی(ئاسایش)ەوە.

لەبیرمە خۆی تەلەفۆنی کرد بۆساواك، ووتی لەماڵەکەمدا(تی،ئێن،تی)یان داناوە، ئەوانیش لە ڕێگەی تایبەتی و ئاسایشی خۆیانەوە لەویان پرسی: لە چ کەسێك گومانت هەیە؟

کاك ئەحمەدیش ووتی: یەکەم لەکەسەکانی ئێوە.

بەهەرحاڵ دوای تێپەڕ بوونی ماوەیەك بەسەر تەلەفۆنەکەدا هاتنە ماڵەوە، چەند کەسێك بوون، یەکێکیان لە ئاسایشەوەو یەکێکیان بەرپرسی شارەوانی بوو، کە پێموابێت(جیگری سەرۆکی شارەوانی کوردستان) بوو، لەگەڵ چەندکەسێکی تری لێپرسراو.

من و چەند هاوڕێیەکی ئەوکاتەی-کاك ئەحمەد- بووین، هەر بەگەیشتنی هێزەکانی ئاسایش، برادەرانی تر ڕۆشتن و من و-کاك ئەحمەد- ماینەوە.

هاتنەناو حەوشەکەوە چاوەڕێ بوون-کاك ئەحمەد- بەپیریانەوە بڕوات، بەڵام ئەو لەژوورەکەی خۆی دانیشتبوو بەمنی ووت"بڕۆ پێیان بڵێ، بێنە ژوورەوە تابزانم ئیشیان چی یە؟"

ئەوانیش لەسەرخۆ هاتنە حەوشەکەوەو، تا هیچ نەبێت لێرەشدا بەخێرهاتنیان بکات، بەلاّم ئەو هەرنەڕۆیشت، لەدوایدا ڕۆیشتنە لای و دوای سەلام و ئەحواڵ پرسین-کاك ئەحمەد- بابەتەکەی بۆ باسکردن و ئەوانیش ئەو پرسیارەیان دووبارە کردەوە:

کاك ئەحمەد ئێوە گومانتان لە کێ هەیە؟

ئەویش وەلاّمی دانەوە: لەپێش هەموویەوە گومانم لە فەرمانگەی ئاسایش(ساواك) هەیە، لەدوایدا لەهەندێك بەرپرس و مەلاو شێخەکانی ناوچەکە.

ووتیان: چۆن؟!

-چونکە بێجگە لەمانە، کەس لەگەڵ مندا دوژمن نییەو هەڵسوکەوتی من تەنها لەگەڵ بەرژەوەندی ئەمانەدا نییە، ئەگینا خەڵکی لەگەڵ بەرنامەکەی مندا هاودەنگن.

بەرپرسی ساواك، واتە( ئاسایش) لەتوڕەیدا نەیدەزانی چی بڵێت و چی بکات .

ووتی: کاك موفتی زادە، خەریکە هەڵەدەکەیت، ئێمە ئەگەر بمانەوێت لەهیچ کەس ناترسین و بەئاشکرا دەیکەین، چونکە ئێمە بۆ ئەنجامدانی هەرکارێك لە سەرۆکی وولاتەوە-سەرۆك وەزیران-مۆڵەتمان پێدراوە، لەوەدەچێت لە لایەنگرانی خۆتەوە ئەم کارەکرابێت ....

لە بیرمە کاك ئەحمەد، زۆر بە توڕەییەوە بە پچڕ پچڕ ووتی: سەرۆك وەزیریش غەڵەتی کرد بەمن بڵێت هەڵەدەکەیت، تۆ لەمن دەپرسیت لەکێ گومانت هەیە، بەتەمای بە درۆ وەلاّمت بدەمەوە؟! من نامەوێ درۆ بکەم و ئێستاش هەر دەڵێم لە(ساواك).





بڕوابكەن ئەو حاڵەتە لەوكاتەدا بەشێوەیەك بوو باسكردنی نارەحەتە، واتە ئەو كەش و هەوایە بەجۆرێك بوو، ئەوكەسە بەرپرسانەی لەوێ بوون سەرسامی بەتەواوی لەدەم و چاویاندا دیار بوو. (سبحان الله) ئەوان لەوپەڕی دەسەڵاتی دونیایدا خاوەنی پلەوپایەو مەصلەحەت، بەرامبەر بەكەسێك تەنها و دەستخاڵی، بەلاَم پڕچەك بەچەكی ئیمان وا پەشۆكابوون كەبەڕاستی باسكردن و وێنەكردنی ئەو حاڵەتە نارەحەتە.

بەهەرحاڵ مەجبور بوون داوای لێبوردن بكەن، بەلاَم لە تەحەمولیاندا نەماو داوایان لە-كاك ئەحمەد- كرد بۆ لێكۆڵینەوەی زیاتر بڕوات بۆ دەزگای ساواك.

كاتێك جەماعەتی ساواك ڕۆشتن، برادەران، كەلەپشت پەنجەرەو ژوورەكاندا خۆیان حەشاردا بوو گوێیان لە هەموو قسەو باسەكان بوو، هاتنە دەرەوەو دەستیان بەقسە كردنكرد بەرامبەر-كاك ئەحمەد-دڵسۆزی بۆ كاك ئەحمەد، كە بۆچی بەو شێوەیە وەلاَمت دانەوە؟

تۆ تەنها پەیوەندیت بەخۆتەوە نییە، تۆ سەرمایەی یەك نەتەوەیت! ئێستا ئەگەر شتێكت لێ بهاتایە ئەم خەڵكە دەبێت چی بكات؟

كاك ئەحمەدیش وەلاَمی دانەوەو ووتی: ئایا زەمانەتێك هەیە، ئەگەر ڕاستیەك لەبەرخاتری مانەوەم لەناوخەڵكیدا بۆ خزمەتكردن لە داهاتوودا نكۆڵی بكەم، لەوەبەدواوە زیندوو بمێنم؟

ئایائێوە زەمانەتی گیانی من دەكەن بۆ داهاتوو لەناوئێوەدا زیندووبم؟

ئەوانیش لەوەلاَمدا ووتیان :بێگومان...نا...ناتوانین زەمانەتی هیچ شتێك بكەین.

ووتی: كەواتە ڕێگری من مەبن و لۆمەم مەكەم، من چۆن بتوانم بابەتێك بەڕاستی دەزانم، و دڵنیام بەیانی خوای گەورە لەبارەیەوە لێپرسینەوەم لەگەڵدا دەكات، نكۆڵی لێبكەم تاكێشە نەیەتە ڕێم؟! لە كاتێدا ئاگاداری سەعاتی داهاتووی خۆم نیم زیندوو دەبم یان نا.

دوای ئەو گفتوگۆ کردنە-کاك ئەحمەد- لەماڵەوە دەرچوو تا بڕوات قسە لەگەڵ بەرپرسانی ساواك بکات.

ئێمەش هەواڵمان نارد بۆ هەموو هاوڕێکانی و هەموویان هاتن، بیێ لەوەش لەمانگی(ڕەمەزان)دا بووین، هەمووی پەرێشان بوو،-کاك ئەحمەد-چی بەسەربێت، چونکە دەمانزانی ئەو ڕەفتارەی-کاك ئەحمەد- نواندی بەرامبەر ساواك بەئاسانی ناتوانێت بگەڕێتەوە، بەڵام دوای سەعاتێك، چی-کاك ئەحمەد- هاتەوە، هەموومان سەرمان سوڕدەما ئاوا گەڕایەوە!

کاتێك مەسەلەکەمان لێپرسی، چۆن ئاوا ڕزگارت بوو؟

بەمشێوەیە بۆی گێڕاینەوە"کاتێك گەیشتمە بەردەم دەزگای(ساواك) پەشیمان بوونەوە من بەرن بۆ ئەوێ، چونکە دەیانزانی بابەتەکە گەورەدەبێت و بەزەرەری ئەوان تەواودەبێت، لەبەرئەوە منیان برد بۆ شارەوانی بابەتەکەیان خستە ئەستۆی شارەوانی و، لەهەمان شوێن، کە چاوەڕێی کاکی سەرۆکم دەکرد، بینیم هەندێك فەرمانبەر بەڕۆژو نین و شتدەخۆن، (ئاخر لەکاتی ڕژێمی(شاه)دا بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی سزای ئەوکەسانەیان دەدا بەڕۆژوو نەدەبوون).

کاك ئەحمەد، هەر سەرۆکی فەرمانگەکە دەبینێت خێرا ڕەخنەی لێدەگرێت:

کاك سەرۆك! تەریق نابنەوە لەمانگی ڕەمەزاندا خەریکی شتخواردنن، پاشان(شاهەنشاه) بەئیسلام پارێزی دەخوێننەوە؟ بۆ ڕووکەش و خۆدەرخستن، گوایە بەرنامەی ئیسلام پیادەدەکەن، خەڵکی داماو دەستگیردەکەن بەتاوانی ڕۆژوو نەگرتن، لەولاشەوە فەرمانبەرانی خۆتان لەبەرچاوی موراجعەکانەوە خواردن دەخۆن!

سەرۆکی داماو، وەکو فەرمانبەرانی(ساواك) دەستەپارچە دەبێت و دەستدەکات بەداوای لێبوردنکردن کە:

كاك موفتی زادە! خوا شاهیدە، هەرچەندە من بۆ خۆم(برینی گەدەم) هەیە ناتوانم ڕۆژوو بگرم،بەڵام بەتوندی دژی خواردنم لەم كاتەداو ئەو كەسانە ئاگاداردەكەمەوە.

بەهۆی كەرەمی خوای گەورەوە، بەوشێوەیە-كاك ئەحمەد- ئەوان تاوانبار دەكات و ئەسڵی بابەتەكە دەبێتە هەڵەی فەرمانبەرانی حوكومی، بەم شێوەیە دوای چەند پرسیارو وەڵامێك،-كاك ئەحمەد- دەردەچێت و دەگەڕێتەوە ماڵەوە"[1].

هەرچەند لەبارەی ئازایەتی و چاونەترسی و ڕووبەڕووبوونەوەكانی موفتی زادەوە بوترێت، هێشتا زۆر كەم ووتراوە، ئەو نەك تەنها لە دەسەڵاتی شاه و ستەمەكانی ساواك نەدەترسا، ئەو كاتانەی لە زیندانی دەسەڵاتی(جمهوری ئیسلامی ئێران)یشدا بووە هەر بەو چاونەترسیە مامەڵەی كردووە، دەگێڕتەوە"هەر شتێك خوای گەورە بە مرۆڤی بەخشی بێت نیعمەتێكی گەورەیە، بەڵام من لە یەكێك لە نیعمەتەكانی خوای گەورە بێبەریم! ئەویش ترسە لە مرۆڤ! كەواتە بەبێهۆ خۆتان ماندوومەكەن من لە هەڕەشە ناترسم، بەڕاستی هەمووشیان دەزانن ئەم قسەیەم سابت كردووە"[2].

دیارە كاتێك لە زینداندا بووە، یاخود ئەو كاتانەش لە دەرەوەی زینداندا بووە ڕووبەڕووی زۆر هەڕەشە بووەتەوەو بەهەمور جۆرێك، بەهەموو زمان و ڕێگەیەك هەڕەشەی لێكراوەو ویستراوە بیترسێنن و لە هەڵوێست و بڕیارە مەردانەكانی بەرامبەر بە دین و نەتەوەكەی پەشیمان بێتەوە، بەڵام پیاوێك ئەوە بیركردنەوەی بێت دیارە هەرگیز پەشیمان بوونەوەی نابێت ....

---

[1]) كاك حەسەنی نەمینی: یاد ایام....(چاوپێكەوتن)،گۆڤاری راه ما،ژ٢، بەخشی یەك، لا ٢٤

[2]) كاسێتی دوای (ئازاد بوونی لە زیندان).



# دامەزراندنی مەدرەسەی قورئان

لەسەرەتادا باس لەوە کرا، کاك ئەحمەد لە ساڵی(١٣٤٢-١٣٤٣) دەستی کرد بە چالاکی ئایینی و دوای وەرگرتنی ئەزموون لە ساڵانی ڕابردووی تەمەنی ئاراستە و هەوڵەکانی لە پێناو ئاین و نەتەوەدا گۆڕانی بەسەردا هات و ڕێچکەیەکی نوێی لە کارکردن گرتەبەر، موفتی زادە برەوی بە جوڵانەکەی دا و تا ساڵی(١٣٥٥) بەجۆرێك لە جۆرەکان بە تەنها خۆی کاریدەکرد، دوا بەدوای ئەوە، هەندێ قوتابی و فەقێی لە دەوری خۆی کۆکردەوە، وا ئێستا خەریکە هەوڵی فراوانتر دەدات و بەنیازی دروستکردنی مەدرەسەیەکە بۆ پێگەیاندن و تێگەیاندنی تاکەکانی کۆمەڵگا، و دەیەوێت لەم ڕێگەیەوە بەتەواوی لەئامانجەکانی نزیك بێتەوەو ئەو تاکانەی بۆ دروستکردنی کۆمەڵگایەکی لەش ساغی بەهیمەتی بەغیرەت پێویستە ئامادەی بکات.

دوای ئەوەی کاك ئەحمەد، تاساڵی( ١٣٥٥) بەتەنیا کار دەکات و لە ڕێگەی مەراسیمە گشتیەکانی وەك(مەولود) و (زەماوەند)ەکان و دانیشتنەکانی مزگەوت‌و ماڵان دەست دەکات بەڕوون کردنەوەی ئیسلامی ڕاستەقینە بۆ خەڵك‌و ئاگادار کردنەوەی خەڵکی لە زوڵم و ستەمی حوکومەت و درۆ و دەلەسەی زۆربەی پیاوە ئایینییەکان، کە ئایینیان کردبوویە هۆکاری مانەوەو مامەڵە، لەگەڵ دەسەڵاتی شادا بەتایبەتی لە شارەکانی(سنە و مەریوان) و دەوروبەریدا، بەمەش ڕای گشتی زۆربەی خەڵکیان بەرەو خۆی ڕاکێشابوو لەم ماوەیەدا کاك ئەحمەد گرنگیدا بە وتاری کۆمەڵایەتی و فیکری دەداو دەستیکرد بە کردنەوەی پۆلی تایبەت لە ماڵی خۆیان و دانانی کات بۆ وانەوتنەوە بەکوڕان و کچانی گەنج، بەمەش تا دەهات لایەنگرو ئامەزرۆی بۆ قسەکانی زیاتر دەبوو.

هەر لەو سەرەتای کارکردنەیەوە هەوڵەکان و ووتار و کۆڕەکانی کاك ئەحمەد، دەنگدانەوەیەکی بەرچاوی دەبێت و لەشارەکانی"(سەقز، بۆکان و مەریوان، پاوە،

جوانڕۆ، كرماشان، كامێران) هەندێ كەسایەتی ئازادی خواز و زانایانی دینی شارەزا لە ئیسلام و دەردی گەلەكەیان دەبنە هۆگری كاك ئەحمەد و بڕێكیان دێنە شاری سنە تاوەكو بەیارمەتی ئەوان پێگەیەكی بتەوی ئایینی و ئازادی خوازی دا بمەزرێنن"[1].

بۆیەكخستن و ڕێكخستنی ووتارو كۆڕەكان و فراوانكردنی بواری پرسیارو وەڵام و ڕێككردنی باری لاری سەنگینی كۆمەڵگای كوردی، لەهاوینی ساڵی(١٣٥٦كۆچی هەتاوی)، كاك ئەحمەد بەهاوكاری ژمارەیەك لەهاوڕێ و مامۆستایانی دڵسۆزو نزیكی بڕیاری كردنەوەی مەدرەسەیەكی قورئان لە(مەریوان)دەدەن.

دەربارەی چۆنییەتی بونیادنانی مەدرەسەی قورئان، مامۆستا(حەسەنی ئەمینی) لەگۆڤاری (راه ما)دا بەمجۆرە باسیدەكات"كردنەوەی ژمارەیەك پۆل لەماڵی-كاك ئەحمەد-خۆیی و ئامادە بوونی كۆمەڵێك گەنج لەوێ، كە هەندێكیان لە قەزاو ناحیەكانی دەورووبەری سنەوە دەهاتن، چونكە ماڵی-كاك ئەحمەد- بەڕووی هەموو كەسێكدا كراوە بوو، لەڕاستیدا دەرگای ماڵیان هیچ كات دانەخراوە، بەشەویس هەركەس بیویستایە دەچووە ژوورەوە! بەتایبەتی ئەو خۆێندكارانەی لەشارەكانی دیكەوە هاتبوون بۆ خوێندن، جاری وا هەبووە درەنگانێكی شەو خۆیاندەكرد بەماڵداو دوای ماوەیەك لە قسەوباس تابەیانی هەرلەوێ دەمانەوە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی-كاك ئەحمەد- زیاتر بەناوچەكانی دیكەبناسرێت و خەڵكی بەفیكرو كارەكانی ئاشنا بێن، ئەمەجگە لەوهەموو ووتارانەی لەگوندو شارەكاندا لەكاتی مەراسیم و بۆنە تایبەتەكاندا دەیخوێندەوە، كەژمارەیەك وتاری تائێستاش هەر بەناوبانگن وخەڵكی باسیان دەكات، وەك ووتاری (مزگەوتی جامیعەی مەریوان)، یان ئەو ووتارەی بە بۆنەی وەفاتی(سوارەی ئێلخان زادە)وە پێشكەشی كرد، تائێستاش ڕاپۆرتی ئەو ووتارە هەرماوە، كەتێیدا چۆن ڕەخنە دەگرێت، هەروەها وتاری(گوندی نگل و دارمیران)و چەندین ووتارو كۆڕی دیكە،

---

[1]) كاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەكەم ، زستانی ١٣٨٦، لا ل ل

کەهەر ئەم وتارانە بوونە هۆی خۆشەویستیەکی زۆری خەڵك بۆ ئەو وادەرکەوت مامۆستایەکی بەتواناو کەسێکی هیدایەت دەرە".

بۆیە، دوا بەدوای ئەم هەوڵ و کارانەی داوای لێدەکەن لەئێستە بەدواوەو شوێنێك بۆ فێرکرن دابمەزرێنێت ڕاستەوخۆ لەژێرچاودێری خۆیدا بێت، تالەلایەکەوە بەفێرکردن و پەروەردەکردنی گەنجانەوە خەریك بێت، لەلایەکی ترەوە پردێك بێت بۆ گەیاندنی داواکاری‌و بەرنامەکانی بەخەڵکی، بۆ ئەم کارەش دوای ئەوەی خەڵکی(مەریوان) دەسپێشخەری دەکەن و شوێن ئامادە دەکەن و کرێی خانوو شتەکان دەدەن، داوا لە-کاك ئەحمەد- دەکەن و بەوشێوەیە، لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوڕێیانی شاری (مەریوان)، کە ژمارەیان لە (٦-٧)کەس زیاتر نەبوون (مەدرەسەی قورئان) دامەزرا.

ئەم چەند نەفەرەی بەناونیشان و بەڕێوەبەرو مامۆستای(مەدرەسە) کاریاندەکرد و لە دامەزرێنەرانی(مەدرەسەی قورئان) بوون، پێکهاتبوون لە: (عیزت حلاق-بورهانی قانعی فەرد، محەمەدی ئەمینی ، ڕەحمان حەیدەری، مەلا سید جەلال، ئەحمەدی کەمال ئەحمەدی و عەلی ڕەحمانی ..."[1].

"بەجۆرە کارو بەرنامەکەمان دەستی پێکرد، پاش ماوەیەك وورده وورده مەدرەسەی قورئان ئەو وانانەی دەوترانەوە دەنگی دایەوەو ناوبانگی پەیداکردو خەڵکی پێیانخۆش بوو، بەرنامەکانی(مەدرەسەی قورئانی مەریوان) بەجۆرێك ناوبانگی پەیداکرد خەڵکی لەشارەکانی دیکەوە دەهاتن، و لەوانەکاندا ئامادە دەبوون و هەنێ جار کاك ئەحمەد خۆیشی ئامادە دەبوو، ئەمانەش بووە هۆی ئەوەی ئەو کەسانەی پەیوەندی نزیکیان، لەگەڵ کاك ئەحمەد هەبوو داوای لێبکەن، لەشاری سنەش بەشێوەی(مەریوان) مەدرەسەیەکی قورئانی دابمەزرێنێت. کاك ئەحمەدیش ووتی"ئەگەر ئێوەش، وەکو خەڵکی مەریوان پێداویستی ماددی بگرنە ئەستۆ(بسم الله)(والحمد الله) دەست پێدەکەین

---

[1]) کاك حەسەنی ئەمینی: یاد ایام....(چاوپێکەوتن)،گۆڤاری راه ما،ژ.٣٠، بەخشی سێ .

بەمجۆرە کارەکە ئەنجامدرا"[1]. بەوشێوەیەو بەهیمەتی-کاك ئەحمەد- و یارانی دوای(٥-٦)مانگ لە دامەزراندنی مەدرەسەی مەریوان لەشاری سنەش مەدرەسەی دووەمی قورئان کرایەوەو لە شەقامی(فرح) ئێستا ناوی(شوهەدا) ماڵێکیان گرت و بەرنامە دەستپێکرد"[2].

وەك ئەوەی(ئەمینی)باسیدەکات یەکێك لەخاڵە بەهێزەکانی خێرا فراوان بوون و بڵاو بوونەوەی مەدرەسەی قورئان و پێشوازی لێکردنی لەلایەن خەڵکەوە، ئاوەڵا بوونی هەمیشەی(مەدرەسەی قورئان) بووە بەرووی هەموو فیکرەو کەسێکدا.

"ئەوکاتەی مەدرەسە دامەزرا لەمەریواندا بە جۆرێك لەجۆرەکان سەرپۆشدان بەسەردا عەیب بوو زەمانی شا بوو، ئەو سەرپۆشی قەدەغە کردبوو-ئەوەی عەیب نەبوو بێ لیباسی بوو-، لەبەرئەوە(کچ)ی گەنج دەهاتنە مەدرەسەوە، بەڵام هەر قبوڵماندەکردو ناوماندەنوسی، ئەمە مەسەلەیەك نییە و بڕیارە بگۆڕێت، ئەگەر هەر لەسەرەتاوە کچێکی باش بێت ئیتر بۆچی دێت بۆلای ئێمە؟ بەو جۆرە جل و بەرگ و قیافەوە دەهات و دوای ماوەیەك دەگۆڕاو دەبوویە مرۆڤێکی دیکە، هەشبوو دەهات و دەڕۆشت و نەدەگەڕایەوە، لە(مەدرەسەی قورئان)دا خەڵکمان لەگەڵدابووە دیکرات و کۆمەڵە بووە، دەهات بەشداری دەکرد، ئەمانیش بڕێکیان دەمانەوەو لەگەڵمان بەردەوام دەبوون بڕێکیشیان دەڕۆشتن و نەدەگەڕانەوە"[3].

بەمشێوەیە(مەدرەسەی قورئان) فراوان بوو، لەساڵەکانی دواترداو لەماوەی گەرمەی(ئینقلاب)دا لەشارەکانی سەقز و بۆکان ) مەدرەسە کرایەوە"[4].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشو.

[2]) چاوپێکەوتنی بڵاونەکراوەی نوسەر لەگەڵ ( کاك حەسەنی ئەمینی )بەرپرسی مەکتەب قورئانی کوردستان – سنە -٢٠٠٨

[3]) سەرچاوەی پێشوو.

[4]) کاك ئەحمەدی موفتی زادە، دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەکەم، زستانی ١٣٨٦، ل- ل ل .

کارو چالاکی لقەکانی(مەدرەسەی قورئان) لەشارو شارۆچکەکان، لەڕۆژانی ئینقلابی ئیسلامی ئێراندا لەئاگادار کردنەوەو بەرچاو ڕوونکردنەوەی خەڵکی دەربارەی ئەو هەموو زوڵم و ستەمەی لەبەرکورد بوونیان، یان لەبەر موسوڵمان بوونیان لێیان دەکرێت هەوڵێکی بەرچاوی هەبوو. ووتارو کۆڕەکانی موفتی زادە دەربارەی نەتەوەو حوکومەتی ئیسلامی پلەو پایەی مرۆڤەکان لەدەسەڵاتی ئیسلامیدا گرنگترین ڕۆڵی هەبووە لەکۆکردنەوەی یەك ڕیزی و یەك دەنگ کردنی تاکەکانی کۆمەڵگا بەتایبەت کۆمەڵگای کوردی.

"لەکاتی ئینقلابی خەڵکی ئێراندا(کاك ئەحمەد) بوو بەڕەهبەری بزوتنەوەی کوردستان و هەماهەنگ لەگەڵ ئێراندا و لەپەنا(مەدرەسەی قورئان)دا، ئەغڵەبەن هەفتەی جارێ خۆپیشاندانی سازدەدا و لەگەڵ موسوڵمانەکاندا، کە ئێستا تەصویرو ووتارو دروشمەکان هەرماون، دەڕژانە سەرجادەکان و هەموو ئەوانەی بەناوی حیزبی چەپ و عیلمانییەوە کاریاندەکرد دەهاتن تێکەڵ بە ئێمە دەبوون و لەپەنای ئێمە کاریاندەکرد"[1].

بەوجۆرە کاری(مەدرەسەی قورئان)بەردەوام دەبێت، تا ئەو کاتەی ئەو ستەمە گەورە لە موفتی زادە دەکرێت و لەبەر(میللەت)ەکەی زێدی خۆی بەجێ دەهێڵێت و دەڕواتە(کرمانشاه)-لە باسەکانی دواتردا بەوردی ئەو هۆکارانە ڕونکراونەتەوە-.

پاش کۆچی کاك ئەحمەد، لەگەڵ کۆمەڵێك لەهاوڕێیانی بۆ (کرمانشاه)، لەبەرئەوەی ئەو بەفیعلی کاری بۆ هۆشیار کردنەوەی نەتەوەیەك کردووە دوای دوو ڕۆژ لە نیشتەجێ بوونی لە(کرمانشاه) و ناڕەحەتی ئەو بارەی لەسەرشانی بووە، دادەنیشن و سەبارەت بەژیانەوە و دەستپێکردنەوەی کارو تێکۆشانەکانیان سەبارەت بە(مەدرەسەی قورئان) قسەبکەن و بڕیاری خۆیان بدەن، لە کۆتایدا دەگەینە ئەوەی ناوی(مەدرەسەی قورئان)

---

[1] چاوپێکەوتنی بلاَونەکراوەی نوسەر لەگەڵ( کاك حەسەنی ئەمینی )بەرپرسی مەکتەب قورئانی کوردستان – سنە -٢٠٠٨.

بگۆڕن بۆ(مەكتەب قورئان)و بەڵێنیش درا توندترو بەبڕواترو گەرمتر لەڕابردوو هەوڵ و كاركردن درێژە پێ بدەن"[1].

لەبارەی جیاوازی نێوان مەدرەسەی قورئان و مەكتەب قورئانەوە، كاك ئەحمەد دەڵێ، "مەكتەب فراوانترو گەورەترە بەمەش تەواوی موسوڵمانان دەتوانن ببنە ئەندامی ئەوێ"[2].

بەمجۆرە لە ساڵی(١٣٥٩)دا ناوی(مەدرەسەی قورئان) لە(كرمانشاه)گۆڕا بە (مەكتەب قورئان) و كاروچالاكی لەبری ئەوەی خەفەبێت و بكوژێتەوە بەگوڕو تینێكی دیكەوە سەری هەڵدایەوە و بابەتە ئایینی و نەتەوەییەكان كەوتنە قۆناغێكی دیكەوە.

---

[1]) كاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەكەم، زستانی ١٣٨٦، ل ن ن.

[2]) كاك حەسەنی ئەمینی: یاد ایام....(چاوپێكەوتن)،گۆڤاری راه ما،ژ.٣ بەخشی سێ.

# دروستكردنی شورای مركزی سنت "شمس"

پاش ئەوەی كاك ئەحمەد، لە زێدی خۆی سنە، لەگەڵ هاوەڵانی كۆچ دەكات بۆ كرمانشان، وەك باسكرا لەوێ بە تەواوی نیازو مەرامی حوكومەتی بۆ ڕوون دەبێتەوەو ڕۆژ بە ڕۆژ دەسەڵاتی ئێران لەو وەعد و بەڵێنانەی بەمیللەتی كوردو ئەهلی سوننەی دابوو پەشیمان دەبێتەوە، و لەلایەكی دیكەوە خەریكی كۆكردنەوەو دەسەڵاتدان و بەنوێنەر كردنی كۆمەڵێك مەلاو كەسی سوننی سەربەخۆیەتی و دەیەوێت ئەمان بەناونیشانی نوێنەری(سوننە) بەرێتە پەرلەمان، و"كاك ئەحمەد بیستبووی، كە حوكومەت خەریكە لەناوچە جیاوازەكان كۆمەڵێك كەس بەناوی شورایەك بۆ ئەهلی سوننە دروستدەكات، ئەگەر ئەوانە قوڵ بكرێت ئیتر دەبێت دوایی بۆهەركارو داواكارییەك لەگەڵ ئەوان قسە بكرێت، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی لەگەڵ كۆمەڵێك ڕووبەڕوو بێتەوەو قسەبكەیت كەلەخۆتن، كۆمەڵێك بوونەتە شوراو قسەیان دەخوات كەلیاقەتیان نییەو توانایی(نا) وتینیان نییە لەبەرامبەر دەسەڵاتداراندا، بۆیە كاك ئەحمەد، هەرئەمەی زانی زۆر زیرەكانە بیر لەدروستكردنی شورایەكی هەڵبژێراوی ئەهلی سوننە كردەوە"[1].

دروستكردنی شورای(شەمس)، یەكێكی ترە لەهەوڵە بەردەوامەكانی موفتی زادە بۆیەیەك دەنگكردنی داواكاریەكانی میللەتی كورد بەتایبەتی و ئەهلی(سوننە) بەگشتی، بۆیە دەبینی ئەوكۆڕەی لە(تاران) گیرابە بەژداری زاناو دڵسۆزانی هەموو ناوچەكانی ئێران بوو، تاوەكو لەم ڕێگەیەوە سەبارەت بە مافەكانی ئەو خەڵكە

[1] چاوپێكەوتنی بلاَّونەكراوەی نوسەر لەگەڵ( كاك حەسەنی ئەمینی )بەرپرسی مەكتەب قورئانی كوردستان – سنە -٢٠٠٨.

بدوێن و ڕێگەی چارەسەریان بۆ بدۆزنەوە"[1]. پاش بڕیاردانو خۆیەكلاكردنەوەی كاك ئەحمەد بۆ ئەم بابەتەتوانی لە(١٣٦٠/١/١٣/١٢) واتە ١٢-١٣/مانگی-خاكەلێوە-(فروردین) لەتاران لەناوجەرگەی دەسەلاتی حوكومەتی ئێران، لەگەڵ خوالێخۆش بوو(مەولەوی عبدالعزیز مەلا زادە) ڕابەری خەڵكی سوننەی ناوچەی(سیستان و بلوچستان)، واتە بەسەرپەرشتی هەردوو ڕابەری ڕۆحی ئەهلی سوننە(كاك ئەحمەدی موفتی زادە )، ڕابەری ئەهلی سوننەی هەموو ناوچەی كورد زوبان و(مەولەوی عبدالعزیز) ڕابەری( سیستان و بلوچستان)، زاناو ناوداری ئەهلی سوننە كۆیكاتەوە، دوای قسەو باسێكی زۆر دەربارەی حاڵو وەزعی ئەوكاتەی ئێران و ڕووبەڕوو بوونەوەی دەسەلاتی ئێران، لەگەڵ بابەتەكاندا مافی نەتەوەو ئەهلی سوننەو دوای دوو شەو ڕۆژ دانیشتن شورایەك بەناوی(شورای مركزی سنت) كە كورت كراوەی دەكاتە (ش-م-س )واتە (شمس) پێكبهێنێت بۆ شوێن كەوتنی ئەو مافانە"[2].

"بەڕاستی، ئەگەر دەرفەتی پێبدرایە ئەم شورایە بەكرداری دەبوویە شەمسێك و ئەهلی سوننەو تەواوی ئەو ناحەقیانەی بەرامبەریان دەكرێت ڕزگاریان دەبوو، چونكە ئەم شورایە لەگەڵ ئەو هەموو دژایەتی كردن و بەربەستانەی لەبەرامبەریدا دانرا، كەچی لەزەمەنێكی زۆر كەمدا ناوی بەتەواوی ئێراندا بلاْوبوویەوە، زۆر زوو كەوتە سەرزاری ئەو خەڵكەو بویەجێگەی ئومێدیان"[3].

---

[1]) كاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەكەم، زستانی ١٣٨٦، ل- ن ن

[2]) سەرچاوەی پێشوو.

[3]) كاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەكەم، زستانی ١٣٨٦، ل-ن ن .

وەك باسكرا دوای ئامادەبوونی نوێنەری ناوچەكانی ئێران، وەك بەندەر عەباس و سیستان و بلوجستان و كوردستان ...)بەڕابەرایەتی كاك ئەحمەد و مەولەوی عبدالعزیز دروستكرا، كە ئەندامانی بالاّی شورا لە(٩) نەفەر پێك هاتبوون، واتە خودی شورا(١١) كەس بوون، بەلاّم هیچكامیان لە(كاك ئەحمەد و مەولەوی عبدالعزیز) نەبوونەتە ئەندامی بالاّی شوراكە، كاك حەسەنی ئەمینی لە ژمارە(١٠)ی گۆڤاری(راه ما) دەڵێت" لە بیرمە ئەندامانی بالاّی شورای(شەمش) (٩)كەس بوون، كە لەهەمو ناوچە جیاوازەكانەوە هاتبوون، ئەوەی لەبیرم مابێت بریتی بوون لە:

١- خوالێخۆش بوو شەهید كاك ناصری سوبحانی .

٢- مامۆستا مەلا عەبدولاّ محەمەد( ئیمام جومعەی سەقز) لەكۆتایی تەمەنیدا بوویە نوێنەری مەجلیس(خبرگان).

٣- خوالێخۆش بوو مەلا صالح كە بەدەستی چەكدارەكان شەهید كرا.

٤- خوالێخۆش بوو(شێخ عبدالعزیز) ئیمام جومعەی پێشووی قەسری شیرین.

٥- مەولەوی عبد الحمید، كە ئێستا ئیمام جومعەی شاری(زاهیدان و بەڕێوەبەری حەوزەی دار العلوم)ی ئەوشارەیە.

٦- خوالێخۆش بوو شەهید مەولەوی عەبدلەلیكی مەلا زادە، كوڕی خوا لێخۆش بوو مەولەوی عبدالعزیز كە لە (١٤/ئەسفەند ١٣٧٤لە (كراچی)لە (پاكستان ) بەدەستی دوژمنانی ئەهلی سوننە شەهید بوو.

٧- خوالێخۆش بوو(مەولەوی سید فاضل)كە لەئەهلی سوننەی شاری (مەشهەد)و مامۆستای ناوچەكە بوو.

٨- خوا لێخۆش بوو (مەولەوی اللەیار) ئیمام جومعەی شاری بیرجند.

بەمشێوەیە کاك ئەحمەد، توانی ئەوهەموو زاناو بلیمەتانەی ئەهلی سوننەی ناوچە جیاوازەکانی ئێران لە ژێر یەك چەتردا کۆیکاتەوەو ناوی چەترەکەش بنێت(شورای شەمس).

لێرەدا جێگەی خۆیەتی ئاماژەیەك بەو هەموو ڕێگری کۆسپانە بکەین، کە دەستەلاتدارانی ئێران بۆ سەرنەگرتنی ئەم شورایە داویانە، چونکە دەبێت ئاگاداری ئەوەبین لەو کاتەدا سەرانی ئێران بە هەموو هێزێکەوە لەبەرامبەر تەواوی چالاکیو هەولەکانی کوردا وەستابوونەوەو ڕێگەیان نەدەدا هیچ جولانەوەو قسەیەك بکرێت. عەبدولا عەبدولعەزیزی عەبدی لە کتێبی ژیانامەی زانای گەورەی کوردستان- مامۆستا ناصری سوبحانی- دەنوسێت"لەو هەل و مەرجەدا هەلچونێکی دژە ڕاگەیاندن لەلایەن دەزگا و بەرپرسەکانی قوم و تارانەوە دژی هەموو چالاکییە کوردی و سونییەکان بەگشتی لەئارادا بوو، بۆیە کاك ئەحمەدی موفتی زادە بەڕەسمی بانگهێشتی بەرپرسانی وەزارەتی ناوخۆیکرد بۆ بەشداری کۆنگرە و، داواشیکرد هەموو کۆبوونەوەکان بەئاشکرا دەگیرێن و بۆ دەزگاکانی حوکمەت هەیە هەمووی تۆماربکەن، دواتر لەگەل شالاوی ئەو دژە ڕاگەیاندنەی(کە وتمان لەئارادابوو) ڕاستییەکانی کۆنگرە نەشێوێنرێن. بێگومان هەر بەوجۆرەبوو کاك ئەحمەد و هەموو سەرکردە سونییەکان پێشبینیان کرد، ڕۆژی دواتر بەرپرسانی دەولەت، دەزگاکانی ڕاگەیاندنیان گەرمکرد دژی ئەو کۆنگرەیەو نازناوی شورای(طائف)*یان بەسەردا سەپاند...بەهەرحال دەزگا ڕەسمییەکانی ڕاگەیاندن

*) ئەم کۆنگرەی شورای شەمس، کە لەتاران گیرابوو هاوکات بوو لەگەل ئەو کۆنگرە بەناوبانگەی لەسعودییە گیرابوو بەناوی کۆنگرەی (طائف)، سەرانی ئێران دەیانگوت ئەم کۆنگرەی تاران پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەو کۆنگرەی سعودییەوە هەیە، کەمەش دوربوو لەڕاستییەوەو بۆ تێکدانی یەکریزی و سەرکەوتنی کۆنگرەکەبوو.





هەموو بەشدارانیان تۆمەتبارکرد بەوەی دژی شۆڕشن و پیاوی بێگانەن و بەناوی ئەهلی سوننەتەوە دەیانەوێت دژی شۆڕش و دەسەلأت پیلان بگێڕن"[1]. کاریگەری درۆو دەلەسەی دەزگاکانی ڕاگەیاندن و ترسی بەردەوامی سەران و ئاخوندەکان لەو کۆنگرەیە دەگاتە ئاستێك ئەم ڕاستییە لەخودی(ئیمامی خومەینی) دەشێوێنن و هەدەف و ئەرکەکانی کۆنگرەی بەپێچەوانەوە پێدەگەیەنن، بۆیە دەبینیت لەوتارێکدا، کەڕاستەوخۆ لەتەفزیۆنەوە پەخشکراوە هێرشی توند دەکاتە سەر بەشداربووانی کۆنگرە"تۆمەتباریان دەکات بە دژایەتی ئینقلاب و پیلانگێڕ و نۆکەری بێگانە".[2]

دوای بلأو بوونەوەی ئەو هەموو درۆ و وتارو نوسینە ناڕاستانە دژی کۆنگرە، کاك ئەحمەد وەك کاری هەمیشەی ئاگاداری بلأودەکاتەوە و ڕایدەگەیەنێت کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنوسی گرێدەدات و وەلأمی پرسیاری هەموو کەناڵ و میدیاکان دەداتەوە، بەلأم حوکمەت ئەو مافەشی پێنەدا و دەزگای(ئیتلاعات) ئەو کۆنگرە ڕۆژنامەنووسییەی قەدەغەکرد".[3]

لەناو بارو دۆخێکی ئاوا دژوارو پڕ کێشمەکێش و پیلانگێڕاندا کۆنگرەی یەکەمی(شمس) دوای سێ ڕۆژ کۆبونەوەو گفتوگۆکردن کۆتایی هاتو لە ڕۆژی ۱۹۸۱/٤/۳دا بەلاغی کۆتایی گۆنگرە لە(١٦) خاڵدا نوسراو بلاوکرایە، خوێنەر دەتوانێت لەبەشی پاشکۆدا تەواوی ئەو خاڵانە بخوێنێتەوە.

---

[1]) بڕوانە:عەبدولا عەبدولعەزیز عەبدی، ژیانامەی زانای گەورەی کوردستان-مامۆستا ناصری سوبحانی-، چاپی یەکەم، ل۹۰-۹۱

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ۹۲

[3]) بڕوانە:عەبدولا عەبدولعەزیز عەبدی، ژیانامەی زانای گەورەی کوردستان-مامۆستا ناصری سوبحانی-، چاپی یەکەم، ل۹۲

# ساڵرۆژی شورای( شەمس ) ڕۆژی دەستگیرکردن

پاش تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر دامەزراندنی شورای مەرکەزی سوننە لە تارانی پایتەخت، بەرپرسانی شورا بڕیاریاندا لە(١٣/١٢)ی فروردینی(١٣٦١)دا یادی ئەو ڕۆژە بکەنەوەو بڕیارو پەیمان دووبارە بکەنەوە، بەڵام ئەمجارەیان لەکرماشان نەك لەتاران، چونکە لەگەڵ ئەوەی تاران جێگەیەکی ئەمن و لەبارنەبوو، خودی‌کاك ئەحمەدیش لەکرماشان دادەنیشت، بەڵام لەبەر بارودۆخی بەرپرسانی شورا و وەزعی سیاسی کە نەگونجاو بوو لەوکاتەدا، بۆیەکاك ئەحمەد بڕیاردەدات ساڵیادی شورا دوابخرێت، چونکە حوکومەت چاودێری توند دەکات و ئەمە دەکەنە هۆکاری ئەوەی ئێمە بوینەتە مایەیی دروستکردنی جیاوازی نێوان سوننەو شیعە، لەبەر ئەم هۆیانە دواخرا بۆ(١٥/١٤)ی (مردادی)* هەمان ساڵ لەکرماشان لەماڵی کاك ئەحمەد خۆیدا"[١].

دوای ئەو ماوەیەلە چاوەڕێی (کاك ئەحمەد)دەڵێت"ئیتر پێویست ناکات لەمە زیاترکات بەفیڕۆبدەین دەبێت ئەم مەراسیمە هەربگێڕرێت، بۆئەوەی وەڵامی هەموو ئەودرۆ و دەلەسەو قسە هەڵبەستراوانە بدەینەوە، کەلەم ماوەیەدا دەربارەی ئەم شوراو ئەندامانی ئەنجام دراوە"[٢]. بۆیە بەومەبەستە لە(١٤) مانگدا ساڵیادی دروست بوونی(شورای شەمس) دەستپێدەکات و دووبارە نوێنەران هەموویان

---

*) واتە پێنج مانگ دواتر لەکاتی خۆی بەسترا.

[١]) دەربارەی کاك ئەحمەدی موفتی زادە .wwww. Esmaeelyeh.blogfa.com/post-١٠٠ aspx

[٢]) کاك حەسەنی ئەمینی: یاد ایام....(چاوپێکەوتن)،گۆڤاری راه ما،ژ.١، بەخشی یەك،ل ٤٧.

کۆدەبنەوە، (کاك ئەحمەد) بۆماوەی دوو شەو ڕۆژ لەقسەکردن و ڕوونکردنەوەی ئەو بارودۆخەی گەلانی ئێران و ئەهلی سوننەی تێکەوتووە بەردەوام دەبێت. (کاك حەسەن) دەڵێت"ئەو ڕۆژانە-کاك ئەحمەد- قسەی زۆر توندیکرد، ئێستاش ئەوکاسێتانەی هەیە کەئەو ڕۆژانە تۆمارکراوە، ئەوەندە توندقسەدەکات بەنیسبەت حوکومەتەوە، نزیکەی(حەوت)دانە سەعات لەسەر حوکومەت و دەسەڵات قسە دەکات و هەڵەکانیان باس دەکات، چونکە حوکومەت زۆر بێ وەفاییکرد بە نیسبەت ئەهلی سوننەوە، وتمان ئەم شورایە بۆئەوەیە داواکارییەکانی خۆمانی لە ڕێگەیەوە بگەیەنینە دەسەڵات، ئەمەش لەدەستوری وڵاتدا چەسپاوە، بەڵام ئەوان زۆر هەڵە تێگەیشتن و دەستیانکرد بەدژایەتی و درۆ هەڵبەستن بۆ شوراو لە ڕێگەی ڕاگەیاندنەکانەوە بە پڕوپاگەندەو هەواڵی درۆ شورایان لەکەدارکردوو بە تاوانی دژی ئینقلاب هەموو ئەوانەی لە شورادا بەژدارییان کردبوو تۆمەتبارکران و خودی شورای شەمسیان ناونا(شورای طائف)"[1].

ئەوڕەخنەو گازندانەی-کاك ئەحمەد- لەدەستەڵات و حوکمەتی گرت هێندەی تر بارودۆخەکەی گرشتکرد، هەربۆیە ڕۆژی(پانزەی گەلاوێژ)لە نوێژی هەینی لەمزگەوتی گەورەی (ئیمامی شافعی) شاری کرماشاندا-کەمامۆستای شەهید (مەلا محەمەدی ڕەبیعی لێبوو-دوو کەس لەئەندامانی مەکتەب قورئان، کە بەیاننامەی کۆتایی دانیشتنەکەیان پێ بوو دەستگیرکران"[2]. ئیتر لەو ڕۆژەوە گرتن و زیندانیکردن و ئەشکەنجەدانی ئەندامانی(مەکتەب قورئان) دەستی پێکرد.

---

[1]) مامۆستا ناصری سوبحانی ، شەهیدی بیروڕا ، مامۆستا ناصری سوبحانی ، کتێبی یەکەم چاپی یەکەم. سلێمانی، ٢٠٠٦، لا ٧٧-٧٨ .

[2]) کاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەکەم ، زستانی ١٣٨٦، ل. س- س

سەرەتای دەستگیرکردن و زیندانیکردنی ئەندامانی مەکتەب قورئان لەخوارەوە دەستپێدەکات بەرەو سەر، واتە لە ئەندامانی پلە کەمەکانەوە دەستپێدەکات، ئەمەش جۆرێکە لە سیاسەت کە حوکومەتی ئێران بەکاریهێناوە بۆ بێدەنگکردنی، (کاك ئەحمەد)، چونکە وای زانیوە، ئەگەر ئەندامانی مەکتەب قورئان بگیرێت بەوجۆرە دەتوانێت(کاك ئەحمەد) بێدەنگ بکات و لە ڕەخنەگرتنو داواکارییەکانی دەستهەڵگرێت و ببێتە گوێ ڕایەڵی ئەوان، (ئەمینی) دەڵێ"حوکومەت حەزی نەدەکرد ئەم بابەتە گەورە تر ببێت، لەخوارەوە پێیداهات بۆ سەرەوە، بەڵکو ئەندامە نزمەکان بگیرێت و سەرەوەش، وەك-کاك ئەحمەد- بێدەنگ ببێت، هەموو ئەم کارانەی بۆ ئەوەدەکرد، (موفتی زادە) لەگەڵیان بسازێی و بکێشێتەوە دواوە، چونکە دەیزانی گەورە دەبێت، کاتێك ڕابەری ئەهلی سوننە بگیرێت. ئێستاش هەرپاك نابێتەوە، واقیعەن پەڵەیەکی ڕەشە بەناوچاوانی حوکومەتەوە و هەر دەمێنێتەوەو خۆیشیان ئەمەدەزانن"[1].

بەو شێوەیە(کاك ئەحمەد) دەسبەرداری هەوڵ و داواکارییەکانی نابێت و دەستەڵاتی ئێرانیش لەگرتن و زیندانیکردن ناوەستێت.

دوای قۆڵبەستکردنی ئەو دوو ئەندامە لە(١٥ی گەلاوێژ)دا لە کرماشان، چوار ڕۆژ دوای ئەوە لە(١٩)ی مانگدا لە(کامیاران) زیاتر لە(١٠) ئەندامی دیکەدەگیرێت و دەخرێنە بەندیخانەوە، لە(٢٦)ی هەمان مانگدا(٢٦-٥-١٣٦١) ژمارەیەك

---

[1]) چاوپێکەوتنی بلاّونەکراوەی نوسەر لەگەڵ ( کاك حەسەنی ئەمینی )بەرپرسی مەکتەب قورئانی کوردستان – سنە -٢٠٠٨.

لەبەڕێوەبەران و ئەندامانی مەكتەب قورئانی شاری(سنە) قۆڵبەست دەكرێن، كە(كاك حەسەنی ئەمینی و شەهید فاروقی فەرساد)یش لەناویاندا دەبن"[1].

گرتن و لێدان و زیندانیكردنی ئەندامەكانی شوررای شەمس بەردەوام دەبێت، بەجۆرێك یەكێك لەهاوەڵانی(موفتی زادە) لەو ڕۆژانەدا گیرابوو خرابوویە زیندانەوە دەگێڕێتەوە"لە گۆشەیەكی زیندانەكەدا بەتەنها دایان نابووم و نەیاندەهێڵا كەس ببینێت و كەسیشم نەدەبینی، لەپڕدا كەسێكیان هێنا لەساحەی زیندانەكەدا بە(سێ ، چوار) كەسەوە زۆریان لێدا لەپڕ بەدەنگی بەرزو بە(فارسی) هاواریكرد ووتی"ئەو-كاك ئەحمەد- ڕابەری منەو بەدەستخۆم نییەو خۆشم دەوێت، مەگەر خۆش ویستنی ڕابەرەكەت تاوانە؟!" لەو كاتەدا نەمناسییەوە، بەڵام دواتر دیم دەست نوێژی دەگرت، یەكێك بوو لە ئەندامانی مەكتەب"[2].

لەگەڵ ئەو بارە خراپەی بەسەر كاك ئەحمەد و هاوەڵەكانیدا هاتبوو كاك ئەحمەد بۆیەك لەحزەش لە داواكانی سازش ناكات و بەبەردەوامی بەیاننامە دەردەكات و دژی ئەوكارەی حوكومەت دەستی داوەتێ قسە دەكات و هۆشداریان دەداتێ .

وەك كاك حەسەنی ئەمینی باسیدەكات، لەو بارودۆخەشدا مەكتەب هەر لە گەشەسەندن و بەهێز بووندا بوو"من بە(١٥) ساڵ زیندانی حوكومدرام، بەڵام دوای(سێ) ساڵ و چەند مانگێك ئازاد كرام، لەو كاتەدا وەك ئەوەی خوای گەورە دابەشی كردبێت برێكمان لە سوچەكانی زیندانە تاریكەكاندا زیندانی كرابووین، و برێكمان لەدەرەوە سەرقاڵی كاركردن بوون بۆ برەودان بەكارەكانی مەكتەب،

---

[1]) كاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەكەم ، زستانی ١٣٨٦، ل. س س.

[2]) لە هاوەڵێكی(كاك ئەحمەد)ەوە وەرگیراوە، كەلەوكاتەدا لەبەر ئەندامبوونی لە مەكتەب قورئاندا دەستگیركراوە.

ئەوانەی لەدەرەوە بوون لەكەسانی چالاك بوون و كارەكان پەكیان نەدەكەوت و هەمیشە خەریكی كاركردن بوون، سەرقاڵی بەیاننامە دەركردن و پەیوەندیكردن بەموسوڵمانانی دنیاوە و گواستنەوەی ئەو وەزعەی موسوڵمانانی ئەهلی سوننە بەگشتی و (مەكتەب قورئان) بەتایبەتی تێیكەوتووە، یانی دەنگی ئێمە بەهەر جێگەیە ئیسلامی تێدایە گەیشتووە، ئێستاش ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەماون، كەلەو سەردەمەدا بۆ پارێزگاریكردن لەئێمە شتیان نوسیووە، هەرئەوەش كاریگەری هەبووە لەسەرئەوەی ئێمە ئازادبووین، دوای ئەوەی بڕێكمان كەئەندامی شورابووین، وەك(شەهید فاروق فەرساد) ئازاد بووین و هاتینە دەرەوە و دەسمانبەكار كردەوە و مەكتەب ئەوەندەی تر قەوی بوویەوە"[1].

دوای ئەوەی حوكومەتی ئێرانی تازە دروست بوو بەهاوكاری میللەتی كورد، دەستدەكاتە قۆڵبەست كردنی ئەندامانی مەكتەب قورئان و بەوجۆرە لەخوارەوە بۆ سەرەوە دەستپێدەكات و كاك ئەحمەدیش هەر بەردەوام دەبێت لەكارو چالاكییەكانی، سەرەنجام لە(١٣٦١/٦/٨)دا دوای دوو هەفتە بەگیرانەكانی سنە، (كاك ئەحمەد)یش لەتاران لەماڵی خوشكی خێزانی(بابا مەردۆخی ڕۆحانی )-خوا لەهەموویان خۆش بێت-دەسگیر دەكرێت و دەخرێتە زیندانی هاودینان و هاوسەنگەرانی !!

هەر لەو ساڵ و سەردەمەدا ژمارەیەكی دیكە لە ئەندامانی مەكتەب قورئان لەشارەكانی (كرماشان، جوانڕۆ، پاوە، دیواندەرە، مەریوان، سەقز، بۆكان، دێگولان، قروە) دەگیرێن و لە بەندتوند دەكرێن، (كاك ئەحمەد)یش بۆ ماوەی دە ساڵ لەبەندیخانەكانی(كۆمیتەی موشتەرەك، قزڵ حەسار، ئەوین)و چەندین

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشو.

بەندیخانەی نادیارو نەناسراو! وەك گەڕەکی(فەرمانییە) لەتاران خرایە ژێر ئەشکەنجەو ئازارێکی نامرۆڤانەوە.

بۆماوەی دووساڵ، واتە بۆماوەی زیاتر لە(٧٢٠) ڕۆژ بەبێ ڕاگەیاندنی تاوانی یاسایی بۆ خۆی، یان کەسێکی دیکە!! بەبێ حوکوم لەزینداندا بووا!! پاشان (پێنج)دانەساڵ حوکومی زیندانی بەسەردا سەپێنرا، کەچی دوای(پێنج) ساڵە یاساییە ناعادیلانەکە، (پێنج) ساڵی دیکە بەبێ حوکومی یاسایی هەر لەزینداندا هێڵرایەوە!!؟"[1].

حەوت ساڵی سەرەتای زیندانی تاساڵی(١٣٦٨ك.ھ) بەبێ هیچ چاوپێکەوتن و(ملاقات)ێك بوو"[2]، واتە بۆماوەی زیاتر لە(دووهەزار و پێنج سەدوو بیست ڕۆژ) لەژووره تاکە کەسیە شێدار و ساردو و سڕی زستان و گەرما و بێ ئاوی هاویندا ئازاری چەشتووە بێ ئەوەی تەنانەت کوڕەکەشی یان کەسێك لەیارانی بتوانن ببینن و هیچ نەبێت دەربارەی ئەحواڵی یارانی، لەبارەی کارە بەردەوامەکانی (مەکتەب قورئانەوە) ئاگاداری بکەنەوە و ئەویش ئاهێك بێتەوە بەبەریدا. ئاخر خۆشەویستی(کاك ئەحمەد) بۆ میللەتی بێ خاوەنی زوڵم لێکراوی کورد، تا ئەوئەندازەیەیە (دە) ساڵ و چەند مانگێك لە زیندان توندی دەکات، دوای زیندانیش کە ئازاد دەکرێت لە لوتکەی ناڕەحەتی و نەخۆشی و ئێش و ئازاردا، هەرخەمی نەتەوەکەیەتی و بیر لەچارەی ئەو دەردانە دەکاتەوە کە ڕووی تێکردووە، لەو حاڵەشیدا بەجۆرێك باسی خۆشەویستی خۆی بۆ کوردستان و(ئاویاری سنە) دەکات، زۆر کەمن ئەوانەی بتوانن لەو پەڕی لەش ساغیاندا بەوجۆرە لاواننەوەو

---

[1]) کاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەکەم ، زستانی ١٣٨٦، لا س س.

[2]) لەبارەی ژیانی کاك ئەحمەدەوە www.esmaeelyeh.blogfa.com/post-١٠٠. aspx

خۆشەویستی خۆیان دەربڕن، هەروەها خۆیە بەرپرس زانینی لەبەرامبەر نەتەوەو دینەكەی لەبەرامبەر خواوە، دەیخاتە حاڵەتێك لەتاو(گریان) نەتوانێت قسە بكات.

هەرچی لەبارەی نەتەوەیی و هەوڵە دینییەكانی ئەو پیاوە بوترێت، هێشتا نەتوانراوە حەقی خۆی بدرێتێ، چونكە ئەوە واقیعە، واقیعیش جۆرێكە ئێمەی مرۆڤ هەرگیز ناتوانین لەیەك كاتدا لەچەن زاویەیەكەوە سەیری بكەین، بۆیە دەبینیت كاتێك كەسێك قسە لەسەر بابەتێكی واقعی دەكات تەنها زاویەیەكی دەبینێت و چەندین زاویەی تر فەرامۆشدەكات، مەگەر كەسە بلیمەتەكان بتوانن لەیەك كاتدا چەند لایەنێكی واقیع ببینن، كە ئەوانیش دواجار هەر زاوییەیەكی دەمێنێت قسەی لەسەربكەن، هەر ئەمەشە وادەكات ئەوانەی لەسەر زاناو پیاوێكی، وەك (كاك ئەحمەدی موفتی زادە) بەبێ بەرپرسانە شت دەنوسن و خیانەت بە قەڵەم و خۆیانو نەتەوەكەشیان دەكەن سنور ببەزێنن و قسەكانیان جێگەی ئیعتبارنەبێت.

پاش تەحەمول كردنی ئەوهەموو ئازارە شەدید و وەحشەتناكە، ئازارو ئەشكەنجەیەك -كە زمان و قەڵەم لەوەسف و باسكردنیان بێتواناو شەرمەزارە، وەك ووتمان دوای زیاتر لە(١٠)ساڵ، لەبەر لەڕادەبەدەر لەناخۆشی جێگە، نەبوونی پێداویستی ژیان، تاریكی ناوزیندان، نەبونی خۆرەتاو، ئەشكەنجەو ئازاری كەم وێنەی جەستەیی و ڕۆحی، -مەگەر وێنەكانی دوای زیندانی، كەلەكۆتای ئەم كتێبەدا بلاّو كراوەتەوە، گوزارشتی لێبدەن- لەساڵەكانی كۆتایی زینداندا زۆر بەتوندی بێهێزو لاوازبوو، تووشی زۆر نەخۆشی ببوو، دوای ئەوەی چەند ئێسكێكی (پشت ملی) دەشكێنن، تامردنی هەر چاك نەبوویەوە و ڕەنجی كێشا، ناخۆشتر لە هەمووی دوچاری نەخۆشی شێرپەنجە(سرتان)بوو، پاش ئەم هەموو زەجرو ئازارو

نەخۆشیە لەڕۆژی(١٣٧١/٥/١٩)ك.هـ دا لە بەندیخانە دەیهێننەدەرەوە"[١]. چونكە دەزانن چاك بوونەوەی ئەستەمە، بۆئەوەی نەبێتە یەكێك لەپاڵەوان و خۆڕاگرەكانی ناو زیندان بەوجۆرە (مەرەخەس)ی دەكەن"[٢]، بەڵام زۆری پێنەچوو دوای بەندیخانە بەناچاری چووە نەخۆشخانەو، پاش ماوەیەك لەنەخۆشخانەی(ئاسیای تاران) لە(١٣٧١/١١/٢٠)، دوای تەنها(شەش) مانگ لەهاتنە دەرەوەی لە بەندینخانە دڵە پڕكوڵ و ئەوینەكەی بۆ(ئایین و نەتەوە) بەشخورا و ستەملێكراوەكەی لەلێدان و خەخواردن كەوتوو، چوو بۆلای خولقێنەرەكەی و ئازیزان و یارانی دانیشتووی(سارا)*ی پڕ لەخۆشی نێوان دوو دنیا، دوو جۆرە ژیان.

ڕۆژی دوایی، تەرمە پیرۆزەكەی هێنرایەوە بۆ شاری(سنە)ی خۆشەویستی،- ئەوشارەی دوای دەرچوونی لەبەر ڕوونەدانی براكوژی و ئاژاوە، بۆجارێكی دیكە بەزیندوویی نەیبینییەوە، ئەو لە(١٣٥٨) بەزیندووی(سنە)ی بەجێ هێشت، بەڵام

---

[١]) كاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەكەم ، زستانی ١٣٨٦

[٢]) چاوپێكەوتنی بلاّونەكراوەی نوسەر لەگەڵ ( كاك حەسەنی ئەمینی )بەرپرسی مەكتەب قورئانی كوردستان – سنە -٢٠٠٨.

*) كاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری

ڕێگەی سەرراس

| | |
|---|---|
| یاران جەمن لەو سەحرایە | چ سەحـــرایێ لەباس نایە |
| هاوتای نییە لەم دنیایە | خاوەنی بانگێشتن خـــوایە |
| ئازیز وەخۆ كەوە ئادەی | كـرژو كـۆڵ خۆتی بۆ بادەی |
| ڕێگەی سەرراس بگرە هادەی | لەهێلی ڕاس و چەپ لادەی |
| لەهیچ مەڵبەندێ نەگرسی | لـە درك و دالاّن نـەترسـی |
| نەنكێنی: ڕێگاكەم دورە | مـــردن، ئـاخـرین سـنورە |
| بۆوەێ عەقڵی سوارە، سورە: | هەروەك لەم ژور بۆ ئەو ژورە |
| لەوێ میوانی خواگیانی | لـەخـزمـەت پـێغـەمـبـەرانـی |
| جێگەی ئاوا هەر وچانی | حـەمـو دنیا بـەقـوربـانـی |

(١٢)ساڵ لەئازارو ئەشكەنجە بەمردووی جەستەو زیندوویی رۆحی هەمیشەیی گەڕایەوە باوەشی ئەو(ئاویار)ەی، كەخودا دەزانێت چەندجار لە زینداندا لەگەرمەی خەودا ڕاچڵەكی بێت و بیر لێكردبێتەوە، ئەوشارەی(موفتی زادە) بۆی بوویە چەتری كۆكەرەوەی هەموو بیرو بۆچونە جیاوازەكان و ئەوانیش بەنەزانی و كاڵ فامی خۆیان دژی وەستانەوە، وا ئێستا بۆی گەڕایەوە، ئەو سنەی ئامادەبوو لەپێناویدا بۆ ئەبەد نەیبینێت، بەلاّم خوێنی كوردێك لەسەر شەقامەكانی بەدەستی كورد نەڕژێت!! "هەرچەندە لە لایەن دەزگا حوكومی و ئەمنییەكانی ئەوسەردەمەی كوردستانەوە بۆ بەرگری لەپێشوازی و ڕێزلێنان لەتەرمی ئەو موجاهیدە شەهیدە گیان بەختكەرە، بەلاّم خەڵكی ناوچە جۆراو جۆرەكانی كوردستانی ئێران بەپێشوازی لێكردن و شكۆیەكی شیاو و كەم وێنەوە لەگۆڕستانی(شێخ ئەحمەد باقر) بەخاكیان سپارد"[١].

---

[١]) كاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاریێ بۆ یاران، چاپی یەكەم، زستانی ١٣٨٦،ل. س س- ع ع.

# كاك ئەحمەدی موفتی زادە و كۆچكردنی بۆ كرماشان

لەم باسەدا، كەبریتیەلە جێهێشتنی شاری(سنە) لەلایەن یەكێك لەڕابەرانی(كورد) لەسەردەمی ئینقلابی ئێرانیدا و كۆچكردنی بۆشاری(كرماشان ) دەمانەوێ لەبارەی چەند بابەتێكەوە قسە بكەین كە لەكۆتایدا كۆی بابەتەكە دەكاتە ئەو هۆكارانەی وای كرد یەكێك لەسەر كردەكانی ئینقلاب زێدی خۆی بەجێ بهێڵێت و تا لەدونیا دەرچونی نەتوانێت بۆیەك دەقیقەیش سەردانی بكاتەوە.

قسەكردن لەبارەی كۆچی(موفتی زادە)و هاوەڵانی بۆ كرماشان یەكێكە لەو بابەتانەی، كە زۆربەی كات جێگەی مشتومڕ بووە، هەروەها زۆر لەناحەزان و حەق نەویستان كردویانەتە دەستكەلای دەستیان و لەڕێگەیەوە لەبارەی(ڕابەری ڕۆحی ئەهلی سوننە)و نوێنەری ڕاستەقینەی كوردەكانی سنوری دەسەڵاتی ئێرانەوە ناڕەوایانە هێرش بكەن، بەڵگەشمان بۆ ئەوەی(موفتی زادە) نوێنەری ڕاستەقینەی كوردەكان بووە، ئەو بابەتەیە لەڕۆژنامەی(كیهان)دا بلاۆكراوەتەوە بەم جۆرە نووسیویەتی"كوردەكان ناڕەزاییان دەربری بەرامبەر بەو بەرنامەیەی(دوو) شەو لەمەوپێش پێشكەشكرا كەتێیدا(دوو)كەس بەنوێنەری كوردەكان ناسێنران‌و چاوپێكەوتنیان لەگەڵدا ئەنجامدرا، كوردەكان ئەم بەشداربوانەیان بەنوێنەری خۆیان نەدەزانی، بەبۆچونی ئەو هاوڵاتیانەی بۆهەواڵەكانی(دەنگ وڕەنگی ئینقیلاب) تەلەفۆنیان دەكرد ڕایانگەیاندو دەیان ووت"-ئەحمەدی موفتی زادە-نوێنەری ڕاستەقینەی خەڵكی كوردستانە ....."[1].

---

[1]) بەهزادی خۆشحاڵی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو كوردستان، روزهای بحران ٤.

بۆیە لەم باسەماندا ئێمەلەسەرەتاوە باسێكی ئەو هەولانەی موفتی زادە دەكەین، كەبۆ دروست نەبوونی تەفرەقە و بێ سەروبەری و بەیەك دەنگردنی داواكانی كورد داوییەتی، هەروەها لەڕێگەی ئەو سەرچاوانەی لەبەردەستدان ئەو دەست پێشخەریانەی كاك ئەحمەد باسدەكەین، كە بۆ سەقامگیری و ئارام بونەوەی كوردستان داوییە، لەكۆتایی بەشەكەشدا سەرچاوەكان، كەبریتین لەچاوپێكەوتنە ڕۆژنامەوانییەكان، وەك خۆی بلاو دەكەینەوە، ئەمە جگە لەوەی وەلامی خودی موفتی زادە دەربارەی ئەم بابەتە باسدەكەین. بەهەموو ئەمانەوە دەگەینە ئەوەی، (كاك ئەحمەدی موفتی زادە) بەڕاستی بەدڵ ویستویەتی ئازادی و ئارامی بۆ كوردستان دەستەبەربكات، هەروەك چۆن(مامۆستا هەژار موكریانی) لە كتێبی (چێشتی مجێور)دا لەبارەی كاك ئەحمەدەوە دەنوسێت" لە هەرای ئازادیخوازی كوردستانی دوای ئینقلانبی ئیسلامیدا. زۆركەس لەكوردەكانی(سابلاغ، سنە) خراپەی (ئەحمەدی موفتی زادە)یان دەگوت، بەلام كەلەگەڵی ئاشنابووم. زانیم لەغەرەزێكی نەزانانەوە خراپەی دەڵێن، گوناهی هەر ئەوە بوو كە موسوڵمانی بەڕاستییە و ئەم بڕوایەیش بۆ كۆمۆنیستان و زۆر لەلاوانی ئەمڕۆمان قوتناچێ، موفتی زادە بەدڵ ویستی ئازادی بۆ كوردستان بستێنێ. زۆریش ماندوو بووە، كە قەولی ئازادی كوردستانی پێدەدەن. خۆی كەبێ درۆ و دڵ پاكبووە، لای وابوو قەوڵ دەرەكانیش دڵ پاكن، وائێستا كە ئەم پەڕاوانە دەنوسم-كاك ئەحمەد-لەزیندانیدایەو زۆر سزا دەدرێت زۆر لەهاوكارانی كەزۆر بەیان تازەلاوان لە سوچی زیندانیدا توندكراون و هیچیان لەپەیڕەوی پاشتگەزنابنەوە و لەسەر بڕوای خۆیان سورن. لەوساوە خۆم ڕوبەروو-كاك ئەحمەد-م دیوە و سەفەرم بۆ(شیمال) لەگەڵی

كردووە، زۆر بەردڵم كەوتوە، لام وایە بەمردویش هەزاران كۆمۆنیستی نەزانی دەبێ بەقوربانی بكرێ"[1].

پێش سەركەوتنی گەلانی ئێران بەگشتی و كوردەكان بەتایبەتی لەئینقیلابی ساڵی(١٣٥٧ك.ه) بەسەر دەسەڵاتی دكتاتۆری (شاهەنشاهی) ئێراندا كاك ئەحمەد یەكێك بوو لە دیارترین كەسایەتیە دیارەكانی ناوچەی كوردنشین، ئەگەر نەڵێین تاكەكەس بووە، چونكە وەك خۆی لەچەند شوێنێكدا ئاماژەی بۆدەكات لە شاری(سنە)دا تاكە كەسی دیاربووە دەستیكردووە بەوەی(شەرواڵ و جلی كوردی) لەبەربكات و خەڵكی هانبدات بۆئەوەی لەشوێنە گشتیەكاندا جلی كوردی بپۆشن، بەزمانی كوردی قسەبكەن لەبەرامبەر هیچ كەسێكەوە خۆیان بەكەم نەزانن و گرنگی بەفەرهەنگی خۆیان بدەن، چونكە لەدیدی موفتی زادەوە زمانی قسەكردن و جل و بەرگ گرنگیەكی تەواوی هەیە بۆ سەربەخۆبوونی نەتەوەیەك، ئەوەتا لە چاوپێكەوتنێكدا، لەگەڵ رۆژنامەی(كیهان)دا زۆر راشكاوانە ئاماژە بەوە دەكات "سەربەخۆیی مافی سروشتی و ئاسایی كوردستانە،و كوردستان داوای مافی خۆیكردووە لەئێرانیدا تەنها زمانی فارسی زمانی فەرمییە، بەڵام بێجگەلە خەڵكی فارسی زمان خەڵكی تریش لە ئێراندا هەیە لەوانە كورد، میللەتی گەورەی ئێران لەئەنجامی كۆمەڵی ئەم میللەتانە پێكهاتووە. لەسەردەمی دەستوری شاهەنشای زۆرداردا خەڵكی بێجگە لە زمانی فارسی لەمافی سروشتی و ئیسلامی كەزمان و فەرهەنگی خۆیان بوو بێ بەشكرا بوون، ئێستا لەم لوتكەی ئازادییەدا كوردستان

---

[1] مامۆستا هەژار: چێشتی مجێور،نوسیار، ماجد مەردەۆخ رۆحانی، چاپی سێیەم، ٢٠٠٩، ناوەندی چاپ و بلاَوكراوەی كتێبی میهرگان، ل٥٠٩.

داوای ئەو مافە سروشتییەی خۆیدەکات کە خوا پێدراوە"[١]، هەروەها موفتی زادە لەسەردەمی خودی دەستەلاتی(شا)دا لەکەسە هەرە دیارو چاونەترسەکان بووە بۆ بەئاگا هێنانەوەی نەتەوەیی کوردو وتاری تایبەتی پێشکەشکردووە و خەڵکی لەو زوڵم و زۆرە ئاگادار کردوتەوە، کەڕژێمی(شا) دەرهەق بەوان ئەنجامیدەدات، لەوکاتەدا کەڕژێم هێشتا دەسەلاتی لەلوتکەی تواناییدا بووە.

کاك ئەحمەد، بەبێ دوودڵی ڕەخنەی خۆی ئاڕاستەکردن لەکاتی وروژانی خەڵکی ئێراندا، لەچەندین کۆڕدا ڕاستەوخۆ قسە بە(ئاغای ئەزهاری)، -کە(سەرۆك وەزیران)ی ئەوکاتەی ئێران بووە-دەڵێت و بەناحاڵی و ناسیاسی ناویدەهێنێت و خەڵکی هاندەدات مانبگرن و دژی دەسەڵات خۆپیشاندان ئەنجامبدەن."هیچ کەس ناتوانێت لەفەرمانگە دەرتانبکات، یان موچەتان لێببڕێت"، چونکە دیارە(ڕژێمی شا) بەوە هەڕەشەی لەخەڵکی کوردستان کردووە، ئەگەر مانگرتن و خۆپیشاندان ئەنجام بدەن لەفەرمانگە دەریاندەکەن و موچەیان نادەنێ.

هەوڵەکانی موفتی زادە بۆ ڕۆشنبیرکردنی گەنجان و ئاگادار کردنەوەیان لە کلتوری خۆیان و هاندانیان بۆ پارێزگاریکردنی لە فەرهەنگە دەوڵەمەندەکەیان لەو باسانەیە کەدەکرێت لەدوتێی توێژینەوەی سەربەخۆدا کاری لەسەربکرێت و هەوڵەکانی بخرێتەڕوو. قسەکردنی موفتی زادە لەبارەی دەسەلاتی ئیسلامی و چۆنییەتی دروستکردنی حوکمەتی ئیسلامی و حوکمی ئەم دەستەلاتە و جیاوازی لەگەڵ تەواوی حکومەتەکانی دونیادا، و پێگەی کرێکار ومنداڵ و ژن و پیاو لەم سیستەمەدا، لەوباسە جدییانەیە بەچەندین سەعات قسەی لەسەرکردووە.

---

[١] بەهزادی خۆشحاڵی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو کوردستان، روزهای بحران ٤

ئابووری و سیاسی و ئیسلام و جیاوازی، لەگەڵ(ئابوری مارکسی)دا، بابەتگەلێکن موفتی زادەی کردە نوێنەر و ڕابەری گەلی کورد لەسەردەمی ئینقیلابدا.

پڕۆژە چاکسازییەکانی(کاك ئە حمەد) لەو کارانەی بوو، بەهەموو هێزو توانایی خۆیەوە کاری بۆدەکرد و دەیویست لەم سەرویەندی ئازادییەدا کەمیللەتی تێکەوتووە پشکی شێریان بۆ وەربگرێت و بەو خۆشگوزەرانییە شادییان بکات، کە زەمەنێکە میللەتی کوردی بەشەینەت خەونی پێوە دەبینێت. ئەو دڵنیابووە لەوەی ئەم مافانەی کورد بەئاسانی دەستناکەون و نادرێنەوە، بۆیە دەبینیت لەوتارێکیدا کەلە شاری(بۆکان) پێشکەشیکردووە بەدڵێکی پڕ چۆش و خرۆشەوە میللەتی ئێران ئاگاداردەکاتەوە و دەڵێت"برا ئێرانییەکان، خوشکە ئێرانبیەکان. هاودەردین شوکور بۆ خودا هیچکاممان لەوی ترمان جێنەماوە. هەموو لەئەم زەمان و حەیات و جوڵەیەدا زەجر و ئێش قبوڵدەکەین و تەحەمول دەکەین، بەلاّم برا ئێرانییەکان لەبیرتان دێت ئێوەش زووڵمتان کێشاوە لەم مێژووە نەنگینەدا ئێمەش زوڵممان کێشاوە، ئەگەر بەئومێدی خودا ئەو دەورانی زوڵم و ستەمە لە بەینچوو نابوت بوو، ئەم تاغوت و ئیستیبدادانە ڕوخان و وێران بوون شەراکەتەکەتان لەبیر نەچێتەوە، میللەتی کوردستانتان لەبیر نەچێتەوە. میللەتی کوردی هەروا هاو دەردی ئێوەیە لەهەموو دەردەکانتاندا، ئائەو دەردە گەورەیەشی هەیە، دەردی مەحرومیەت لە مافی نەتەوەیی خۆی"[1]. هەروەها لەیەکێك لەپڕۆژەکانیدا کە بەماوەیەکی کەم دوای سەرکەوتنی ئینقلاب پێشکەشی دەسەلاّتدارانی کردووەو

[1]) کاسێتی ژمارە(٦)، سخنرانی بۆکان، (٤٥)B.





لەرۆژنامەی(اطلاعات)دا ئاماژەی بۆ دەكات و دەڵێت"پێش ئەمەم نامەیە*، هەندێك پێشنیار و گەلاڵە نامەیەكمان پێشكەش بەدەوڵەت و شورای شۆڕشكردووە. پلانێكە بۆ گۆڕینی سیستەمی ئابووری ئیسلامی كۆمەلایەتی لەئێراندا هەیە، هەروەها پلانێكە بۆ دەرباز بوون لەو حاڵەتە چینایەتییەی ئێستا هەیە، و گۆڕینی بۆ سیستەمێكی تەوحیدی ئیسلامی(یەكبونی ئیسلامی)، هەروەها پلانێك بۆ گۆڕینی باری كرێكارانی بێ كار و جوتیاران، كە(شۆڕشی سپی) بووە هۆی كۆچی جوتیاران لە لەگوندەوە بۆشار، پلانەكە ئەوەیە دەوڵەت ڕاستەوخۆ بەسەرپەرشتی خۆی و بەبێ دەست تێوەردانی هیچ كەس و لایەنێكی تر بەرهەمی جوتیاران بەنرخێكی بەرز بكڕێتەوە لێیان و بەنرخێكی هەرزان بیداتەوە بەخەڵك.... فریای باری تەندروستی خەڵك بكەون، هەروەها سەرپەرشتی تەندروستی ئاژەڵەكانیان و دەرمان ڕێژی كێڵگەكانیان بكە ن...."[1].

وەك ئاماژەمان بۆكرد، پێش ڕودانی ئینقلاب و بڵاوبونەوەی بەهەموو ئێراندا لە(كوردستان) ئەوانەی دژی دەسەلاتی(شا) قسەیاندەكرد تە نها(موفتی زادە) بوو، خۆی لەم بارەیەوە دەڵێت"لە پێش ئینقلابەوە هیچ لایەنێك دەنگیكی نەبووە تەنها ئێمە بووین جار جار باسێكمان لەبارەی ئیسلامەوە دەكرد. دژی حكومەتی (شاهەنشاهی) ئەڵبەتە جار جارێك جموجوڵێكی چەكدارانە هەبوو، كە ناسیۆنالستی ماركسی و غەیری ماركسی خەڵكی عادی موسوڵمانیان تێكەڵدە

---

*) دیارە كاك ئە حمە د پێش ئەو نامە یە، نامەیەكی دیكەی ئاڕاستەی سەرانی شۆڕش كردووە،دە ربارەی ئینقلابی سیاسی و ئیدارەی ولاتەوە یەوە , وە ك خۆی دە ڵێت، ئە گەر ئەو پلانەی لە و نا مە یە دا خستو مانە تە ڕوو جێ جێ بە جێ بكرێت بۆ هە میشە ئە نجو مە نێكی بە هێزمان دە بێت، بەهزادی خۆشحاڵی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو كوردستان، روزهای بحران ٤

[1]) بەهزادی خۆشحاڵی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو كوردستان، روزهای بحران ٤

بوو لەبەرامبەر حكومەتەوە، بەلاّم هیچ نەبوو ئەوەی وا بەئاشكراو لەناوخەڵكیدا قسەبكات و زانیاری بدات بەخەڵك و خەڵك ئاگادار بكاتەوە تەنها چالاكی ئیسلامی بوو... ئەوانەی هەبوون ئەوەندەی كاریان بۆ ئەوە دەكرد دەرنەكەون و حكومەتی(شا) و (ساواك) ناویان نەزانێت، بۆئەوەی دەستگیر نەكرێن نیوەی ئەوە ئامادەییان نەبووبێت لەناوخەڵكیدا قسەبكەن، جارێكیان لە(مەیدان ئازادی) لە(سنە) لەسەردەمی(شا)دا كۆبونەوەیەكی گەورە ئەنجامدرا خەڵكی ڕەخنەیان دەگرت و دەیانگوت ئەمە چییە؟ هەر موسوڵمانەكان قسەدەكەن و ماركسیەكان قسەناكەن؟ وتم برا خۆ ئەوان نەهاتون و ئێمە ڕێگە نەدەین و بلێین(نا)...ئەوان بابێن بە سەرچاو باقسەبكەن ... بانگمان كرد فلاّن بێت و فلاّن بێت، ناوی چەند نەفەرێكمان برد... ئەوان چەند نەفەرێك بوون لەكوردستاندا، كەچی دوایی یاداشتێكیان ناردووە بۆچی ناوی ئێمە دەبەن كە بزانن لێرەهەین...!!"[1].

بەوجۆرە لەپێش ڕودانی ئینقلابدا(كاك ئەحمەد) هەوڵدەدات خەڵكی لەوە ئاگادار بێت داوای دەكات. ئینقلاب هەر بریتی نەبێت لەهەست و سۆزو توڕەبوونێك بۆ لابردنی دەسەلاّتی تاغوتی، بەڵكو هەوڵیدەدا و بۆ خەڵكی باسدەكرد پێویستە ئەم ئینقلابە ببێتە مایەی ئەو خۆشگوزەرانییەی خەڵكی هەیەتی و ئێوە نیتانە، هەمیشە هەوڵیدەدا و كۆڕ و كۆبونەوەی سازدەكرد، بۆئەوەی ڕۆشنی بكاتەوە خەڵكی پێویستە چیبكەن و داوای چیبكەن. بەتەواوی توانایەوە باسی جوڵانەوەو ڕۆڵی خەڵكی دەكرد چەندێك گرنگە لەبەرامبەر لەناوبردن و ڕوخانی دەسەلاّتێكی دیكتاتۆرییەوە، ئەو هەمیشە وتویەتی"تە نها كۆمەڵگایەك مافی ژیانی هەیە لەبەرامبەر ئەو مافانەی لێی زەوتكراوە كۆشش بكات و ڕانەوەستێ...." ئەو پێی

---

[1] كاسێتی ژ.(١٣)-(٢١٢)(چە زمانی با حكومتهای غیر نسلامی جنگ مسلحانە لازم است)-A.



وابوو كۆمەڵگایەك لەهەوڵدان بكەوێت بۆ وەرگرتنەوەی مافەكانی خۆی، وەك ئەو پەرداخە ئاوەی لێدێت، ئەگەر ماوەیەك نەیجوڵێنێت (بەڵغ)دەكات و پڕدەبێت لە(میكرۆب)".

كاك ئەحمەد، هەمیشە لەوە ترساوە، ئەگەر بەزانایانە مامەڵە نەكرێت ئینقلاب لەخەتكی خۆی لادەدات و ئەوەی میللەتی كورد ساڵهایە هەوڵی بۆ دەدات لەدەستی دەچێت. هەر لەوكاتەدا لەرێی نامە و بروسكەوە چەندین جار سەرانی شۆڕش(ئیمام خومەینی) لە مەترسیەكانی لادانی شۆڕش لەخەتی خۆی ئاگادار كردۆتەوە، دەكرێت هۆكاری ئەم ترسەی لەباسەكانی دواتر ئاماژەی بۆبكرێت.

پاش ڕودانی ئینقلاب و سەرهەڵدانی چەندین گروپ و حیزب لەناومیللەتانی ئێرنداو بڵاوبوونەوەیان بەشارەكاندا و خۆپڕچەك كردن و هەوڵدانیان بۆگرتنە دەسی دەستەڵات و خۆناساندنیان بەنوێنەری ڕاستەقینەی میللەت و بلاوكردنەوەی فیكرەی(ماركسی)، كەدەبوایە ئەم هەوڵەیان لەپێش ئینقلاب بەچڕو پڕی و بەجۆرێكی وابوایە لەكاتی ڕودانی ئینقلابدا میللەت خۆیان بڕیاریانبدایە كامییان پێ باشە(ئیسلامی یان ماركسی)، بەڵام لەبەرگرنگی نەدان بابەتە گرنگو چارەنوس سازەكان بەئەندازەی قورسایی خۆی دەیبینێت بەداخەوە شۆڕش‌و سەركردایەتی شۆڕش بەنیسبەت میللەتی كوردەوە دەكەوێتە ئەوەی ساردوسڕانە مامەڵەبكات. هەوڵەكانی(كاك ئەحمەد) لەم بوارەشدا هەمیشە جێگەی گەورە نرخاندنییەتی.

مێژوو دەبێت بەوە خۆشحاڵبێت، كەزۆر پێویستی بەبەڵگەنییە، بۆئەوەی ئەوە بسەلمێنێت بەڕاستی(موفتی زادە) هیچ جۆرێك لەو هەوڵانەی داوە كەرێگری بكات لەڕوو بەڕوو بونەوەی چەكدارانە لەنێوان چەكدارانی حیزب و ئینقیلابیەكاندا؟

چونکە(کاك ئەحمەد) لەچەندین دانیشتندا لەم بارەوە قسەیکردووە و بەڵگەو چارەسەری خۆی بۆ بەرەوپێشبردنی کێشەی نەتەوەیی کورد خستۆتە بەردەم هەموو حیزبە کوردستانییەکانی ئەوکاتە. لەیەکێك لەدانیشتنەکانی شاری(کرماشان)یدا باسی ئەوە دەکات کەچۆن لەدانیشتنی ئەحزابەکاندا باسی لە ڕێگە چارەکردووە بۆیان، دەڵێت"لەدانیشتنەکانماندا قسەم دەکرد، لەگە ڵیاندا ڕێگەی میللەتی کورد ڕێگەی چەکدارانە نییە وەرن با بە(تەوافوق) کاربکەین با کێشەکانی میللەتی کورد لەڕێگەی سیاسی لەڕێگەی یاداشت و قسەکردنەوە حەلبکەین، ئەگەر ئارەزوتان ئەوەیە مافی میللەتی کورد وەربگرین ئەم حکومەتە(ئینقلابی) ئێستا ئارەزوی هەیە، (چونکە سەرەتایەتی) چەندجار ئێران ئامادەیيان دەربڕیوە-ئێوە(کوردەکان) بەبێ تەفرەقەو جیاوازی قسەی خۆتان بهێنن تا ئێمە کاربکەین و ئەنجامی بدەین-دەموت کورە وەرن بالەم فورسەتە سود وەربگرین شایەت ئەمە تاسەر نەبێت، شایەت مەوزوع گۆڕا و ئەم حکومەتە بارودۆخی تری بۆهاتە پێشەوە کاری نەدەکرد، ئەم میللەتە(کورد) قەرنەهایە لەگشت جێگەیەکدا زوڵمی لێدەکرێت وەرن ئەم حکومەتە ئارامە لەم سەردەمەدا ئامادەیی هەیە، وەرن با فورسەت تەڵەبی نەکەین دەستنەکەینە خۆبردنە پێشەوە، بەڵکو ئیمتیازییاتێك بۆ خۆمان وەربگرین. هەوڵ بدەین لەڕێگەی یاداشتەوە کێشەی نەتەوەکەمان چارەبکەین و مافی خۆی پێ بدرێت.

ئێمە خەریکی یاداشت نوسین بووین بڕیار بوو تەرحێکی بەکۆمەڵ بنوسرێت و کۆمەڵێك لە موسوڵمانان و مارکسییەکان کەلێرە بوون بانگهێشت بکرێن لەهەموو شارەکانی دیکەی کوردەوارییەوە بێن و بیروبۆچونی خۆیان پێشکەش بکەن و دواتر کۆمەڵێك بەناونیشانی(نوێنەر) لەموسوڵمانان و مارکسیەکان دیاری بکرێن و

تەرحەکان هەڵبگرن و بیبەن و لە تاران دەستکەنە دانیشتن و گفتوگۆ کردن. ئێمە خەریکی ئەم کارانە بووین، لەولاوە تێکیاندەدا. دەمزانی چی ئاگرێك دەبارێت بەسەر میللەتی کوردا لەهەردوو لاوە (ئینقیلابی و حیزبەکان)..... لە دانیشتنەکانی (سەقزو بابەکندی)دا، باسی ئەوەم بۆ دەکردن، ئەگەر هەموو میللەتی کورد بەگە ورە و بچوك و منداڵییەوە لەبەرامبەر ئەم حکومەتەدا (ئینقلابیەکان) ناتوانن و دەرەقەتی نایەن، لەبەرئەوە ئەم جارە تەواوی میللەتی ئێرانی لەگەڵدایە لەڕاستیشدا میللەتی ئێران چەند قەرنە خەون بەحکومەتێکی ئاواوە دەبینێت. حکومەتی پێشوی(شاهەنشاهی) پڕبوو بوو لەفەسادی، بۆیە بەئاسانی دەست لەم حکومەتە بەرنادەن مودەتهای دەوێت تا پشتی ئەم حکومەتە خاڵی بکەن، تا ئەوەش ڕودەدات پشتی میللەتی کورد دەشکێنن لە کۆتاییدا میللەتی کورد دەکەوێ، و بەهوژم و بەئاسانی دێنە ناو کوردستانەوە جا ئەمجارەیان پەیوەندی حکومەت، لەگەڵ میللەتی کوردا نابێتە ئەم پەیوەندییەی ئێستا هەیەتی. وەرن ئەم بەدبەختییە مەڕێژن بەسەر میللەتی کوردا، ئەم حوکمەتە جیاوازی هەیە لەگەڵ حوکمەتی جاراندا، ئەگەر واشنەبێت میللەتەکە هەروا لەگەڵیدا. سالآنێکی زۆری دەوێت ئەم میللەتی ئێرانە ئاگادار بێتەوەو دەست لەم حوکمەتە هەڵبگرێت. میللەتی کورد بێچارەمەکەن و مەیدەن بەدژی سوپاو تەواوی میللەتی ئێرانداو بەدبەختی وامەهێنن بەسەریدا. باسی ئەو مەرجانەم بۆدەکردن کەلە جوگرافییای کوردستاندا هەیە، لەئێرانا، لەعێراقدا، لەسوریا، هاوکاری ئەم هاوسێیانە تاسەر نییە، ئێستا حوکومەتی(بەعس) کۆمەکیت بکات تاسەر نییەو هەرکات ویستیان هەرچی(ئاشە) تەواو. جارەها و جارەها ئەمانەم پێدەوتن، لە کۆبوونەوەکەدا دەیانووت"ئەرەوەلا شەڕ خییانەتە، میللەتی کورد ناتوانێت شەڕبکات...."، لەدوای دانیشتنەکە هەر وانەبوون!! هەموو ئەمانەشم لەو ڕووە

دەكرد، كە دەستوری حوكمەتی ئیسلامی بەو شێوەیەیە، تائەو حەددەی من لێی تێگەشتووم، كەچی بەداخەوە ڕێكنەدەكەوتن و هەركەسەو قسەیەكی دەكرد، دواتریش(ئینقلابییەكان) نەیاندەزانی كامییان جێ بەجێبكەن. ئەم دەستە قسەیەك دەكات و ئەو دەستە قسەیەك دەكات، (ئینقلابی ئیسلامی) دەیانوت "كامیانتان بۆجێ بەجێ بكەم؟ ئێوە هەموتان قسەتانبكەن بەیەك و بڵێن میللەتی كورد ئەمەی دەوێ بەچاوان بۆتان جێ بەجێ دەكەین".

پێمدەوتن"ئەم هەڵە لەدەست مەدەن ئەمانە لەدەستبدەن لەكۆتاییدا دەگۆڕێن خۆئەمانە(سەرانی ئینقلاب) موسوڵمانانی بەئاگانین، ئەگەر زۆربوون و دەسەڵاتیان پەیداكرد شەڕدەكەن و زوڵمدەكەن، سروشتی كۆمەڵێك مرۆڤ وایە، كە غروری پیرۆزی و زۆری دەدات لە كەلەیان بەو شێوە ڕەفتاردەكەن و پەیوەندییان دەبێتە پەیوەندی زۆر و كەم و بەڕۆحی فاتیحییەتەوە داغڵدەبن و میللەتی كورد لەحوكومەتی (پەهلەوی) زیاتر سەركوتدەكەن... لەڕوخسارياندا قسەكانیان قوبوڵدەكرد و دەیانوت "بەڵێ وایە و ئەوكێشەمان هەیە، و ئەو كێشەمان هەیە، و ئەوە چارەدەكەین. زۆر بەكورتی كۆتا دانیشتنمان لە(بابەكندی) بوو بڕیار وابوو، ڕێككەوتین بۆ(چوار) ڕۆژی دیكە نوێنەرییان بێنە شاری سنە و دانیشتنمان هەبێت، ئەوان هاتن و هیچیان نەوت".

لێرەدا جێگەی خۆیەتی ئاماژە بەو شایەتییە مێژووییەی(د.عەبدولرەحمان قاسملو)بدەین، كە دەربارەی دڵسۆزی كاك ئەحمەد بۆ كوردستان دەڵێت"جارێك لە تاران و جارێك لە سنە دیدارم لەگەڵی بووە، ئەوەندەی من بزانم گەلی كورد پیاوی ئاوا زانان و دڵسۆزی كەمتر بەخۆیەوە دیوە، ئەو لە ڕێگەیەكەوە خزمەت بەگەلی كورد دەكات و ئێمەش لەڕێگەیەكی دیكەوە"[1].

---

[1]) عەبدولكەریم فەتاح: پەیامەكەی موفتی زادە(لەنێوان چەق بەستن و گۆڕاندا)، چاپی یەكەم، ٢٠١٠، ل ٧.

ئەو كارانەی(موفتی زادە) كردویەتی، بۆئەوەی سەروەری كوردستان لەدەستی كوردەكاندا بێت و هەموو نوێنەری حیزبەكان بەرامبەر كێشەكان یەكدەنگبن زۆر جارسەری كێشاوە، بۆئەوەی شەو تابەیانی لەگەڵ ئەو گروپ و حیزبانە لەشوێنێكدا كۆببێتەوە و لەبارەی داواكارییەكانەوە قسەبكەن، لەگەڵ ئەوەی(موفتی زادە) وەك چۆن پێشبینی ئەوەیدەكرد، كە ئەگەر ئینقیلاب و (دەسەلاَتدارانی تازە) بەهێزبن و خۆیانبگرن بەو زمانەی ئێستا قسە لەگەڵ میللەتی كورددا ناكەن، بەڵكو زمانیان لەزمانی گفتوگۆوە دەبێتە زمانی چەك و بەهێز وەڵامی كورد دەدەنەوە-وەك دایانەوە-، چونكە پێش ئەوەی كاریگاتە ئەوەی چەندین جار نوێنەری(ئیمام خومەینی) و سەرانی شۆڕش هاتونەتە كوردستان و دەربارەی كێشەكان دانیشتنیان ئەنجامداوە زۆر جاریش ڕویداوە نوێنەری كوردەكان چووەنەتە تاران و قسە و باسیانكردووە، بەڵام وەك(كاك ئەحمەد) باسیدەكات كێشەكە لەوەدا بووە یەكدەنگ نەبوون، ئەمەش پیشەی هەمیشەیی كوردبووە لەزۆر لەقۆناغە چارەنووس سازەكانی میللەتدا، دیارە هۆكاری سەرەكیش ئەوە بووە حیزبەكان لە بڕیارداندا سەربەخۆ نەبوون!! كاتێك هەركام لەگروپ و حیزبەكانیان بیانەوێت بڕیاربدەن و قسەبكەن دەبێت بگەڕێنەوە بۆ مەرجەع، كە(ئەمریكاو بەریتانیا و ڕوسیا)یە، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی بە بەردەوامی چارەسەری كێشەكان دوابكەوێت، هەروەها ئەوەی كە (كاك ئەحمەد)یش باسیدەكات"كاتی وا هەبوو شەو تابەیانی لەسەر زۆر بابەت قسەمان دەكرد، قەولو قەرارمان هاتۆتە سەر شتێك و لەسەری ڕێكەوتوویین و بابەتەكانمان دەنووسی، چی بەیانی نووسیویانەتەوە و گۆڕیویانە!! چەند دانیشتنمان لەدادگا ئەنجامدا، بۆئەوەی شورایەك بۆ شاری سنە دروستبكەین، سەیرمدەكرد ئەویشیان دەستكاری دەكرد. بەتەواوەتی دەمزانی ئەمانە درۆدەكەن و لەزاهیریان (ڕوخسار)دا شتێكن و لەباتنی(ناوەڕك)دا شتێكی تر. ئەمانەم تەنها لەبەرئەوە قبوڵدەكرد كەخەت

و مەسیر جیانەكەنەوە و هاوسەنگەرییەك زاهیری هەبێت، ئەمانەش بۆئەوەی ماڵ وێرانی نەیەت بەسەر میللەتی کورددا، بۆئەوەی ئەو وەزعەی بەسەردا نەیەت كەهات"[1].

قسەكردن و كارەكانی(كاك ئەحمەد) تەنها ڕووبەڕووی گروپ و حیزبییەكانی كوردستان نەبووە، بۆئەوەی خوێن نەڕژێت و بەناهەق لەژێرناوی جیاوازدا كاری دژەمرۆڤ ئەنجام نەدرێت، بەڵكو لەبەرئەو هەموو هەوڵ و كۆششەی لەگەڵ لایەنە كوردەكان بۆگەشتنە ئەنجام و ڕێگریكردن لەخەڵك كوشتن لەلایەكی ترەوە، لەگەڵ سەرانی ئینقلابدا هەمیشە لەدانیشتندا بووە و هەوڵی ڕێگریداوە لەكۆمەڵێك كار، كە دەرئەنجامەكەی بەزیانی میللەتی كورد و هەژاران بەتایبەتی و دەوڵەت بەگشتی شكاوەتەوە. یەكێك لەوكارانەی(موفتی زادە) بەدووربینی خۆی هەوڵی داوە سەرنەگرێت و سەرانی ئینقلاب لە مەترسییەكەی ئاگادار بكاتەوە، پڕچەك كردنی دەرەبەگەكانی ناوچەی كوردستان بووە دژی(كۆمەڵەو دیموكرات). چونكە حكومەتی ئینقلابی، بۆئەوەی بتوانێت بەسەر ئەو حیزبە چەكداریانەدا زاڵبێت و سەركوتیان بكات، هەڵساوە دەرەبەگەكانی چەكدار كردووە، دیارە ئەمەش جارێكی تر بۆ نانەوەی تەفرەقە و شەڕە لەنێوان میللەتی كورد خۆیدا، ئەو شەڕەی(موفتی زادە) پێش دروستبوونی هۆشیاریداوە كەنابێت كارێكبكەین شەڕی كورد بەكورد بكرێت، بۆ ئەم بابەتە(كاك ئەحمەد) دەڵێت"دەستیانكردبوو بەچەكدار كردنی دەرەبەگەكان و ئەو هەموو كێشەیەی بۆیان دروستكردبووین ئەو هەموو هەوڵەی ئەماندا بۆئەوەی كارێك بكەین فلان دەرەبەگ چەكدار نەكرێت، جا لەم ماوەی دوایدا بەمەترسی ئەمەیان دەزانی، یەكێك لەو لایەنگرانەی لەسەر(حزبی جمهوری) بوو وابزانم لەڕۆژنامەی(اطلاعات)، یان ڕۆژنامەی(حزبی جمهوری) خۆیاندابوو باسی هەندێك دەرەبەگی ناوچەی(ئورمییە)ی

---

[1] كاسێتی ژ.(١٣)-(٢١٢)(چە زمانی با حكومتهای غیر تسلامی جنگ مسلحانە لازم است)-A

کردبوو، کە لەگەڵ ئەوەی لەلایەن دەوڵەتەوە پارەیان پێدراوە لەژێریشەوە لەگەڵ (کۆمەڵەو دیموکرات) دابوون، جا وتم بڕۆن پێیانبڵێن "کاتێك تۆڵەترسی کۆمەڵە و دیموکرات دەرەبەگەکان چەکدار دەکەیت، ئەگەر چەکدار بوون زۆر لەوانە خراپترە، چونکە دەڕوات بەئاشکرا جوتیارەکان دەکوژێت،-ئەوەدەردت بێت- دوو ساڵە لەئێوە دەخوات لەکۆتایدا هەر لە بەرامبەرتانەوە وەستا، بۆچی ئەوکاتە پێمدەوتن قبوڵتان نەدەکرد؟ دەرەبەگی واهەبوو (سەد، تا دو سەد، تا هەزارو پێنج سەد) دانە چەکییان پێدراوە"[1]. پاش ئەو هەوڵ و ڕێگایانەی (کاك ئەحمەد) بۆچارەسەرکردنێکی مەنتقیانەی کێشەکان دەیگرێتە بەر بەهەموو توانایەوە کاردەکات، بۆئەوەی شەڕو کوشتار لەکوردستاندا دروست نەبێت، بەڵام دیارە سودێکی وای نابێت و کاردەگاتە ئەوەی لەلایەنگرانی گروپە چەکدارەکانەوە بەتایبەتی ئەوانەی فیکری(مارکسییان) هەیە دەستبکەن بەدەست درێژی کردنە سەر لایەنگرانی(کاك ئەحمەد)و لێیان شەهید بکەن(کاك حەسەنی ئەمینی) دەربارەی ئەو ڕوداوانە دەڵێت"هەر حکومەت شانی بۆئەو تاقمانە شلکرد دەستیانکرد بەکوشتنمان، ڕاستە ئێمە شەڕێکی فیکریمان لەنێوانیاندا هەبوو، وە دور و نزیك قسە و باسمان بەیەکەوە هەبوو، ئەوان دەیانوت ئیسلام ئەوەیە و ئێمە دەمانوت ئەوەیە، خۆ دیاریشە گروپ و تاقمەکان پێکەوە قرەیان هەیە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەوان چەکییان پێ بوو دەستیانکرد بەکوشتن لێمان و زۆریان لێ کوشتین هەر لەم شاری(سنە)یەدا لەبنەماڵەی(غەکی)-سێ- برایان پێکەوە کوشتن و ماڵی(شبلی)-سێ- برایان پێکەوە کوشتن، ئەمەش هەر لەبەرئەوەی لەگەڵ ئێمە دابوون و مەکتەب قورئانی بوون، (مەعروف شبلی) لەمزگەوتدا خەریکی دەرسی قورئان بوو چوون بەسەر قورئانەکەوە لێیاندا و ڕایانکێشا بەسەر پلیکانەکانی مزگەوتدا و هێنایان لەناو حەوشەکەدا کوشتییان. براکەی لە( تاران)-ئەصڵەن لێرە

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو

نەبوو تاکارێك بکات- هەواڵی زانیبوو لێرە(سنە) براکەیان کشتووەو هاتووە بزانێت چی ڕویداوە لەناو سەیارەکەدا هێنایانە خوارەوەو کوشتیان. (مەهدی شبلی) برایەکی دیکەیان بوو کەبرا بچکۆلەیان بوو ئەو هیچ کارەبوو ئەویشیان بەوجۆرە کوشت.

بنەماڵەی(ئەکی)یش هەر بەوجۆرە-سێ-کوڕی(ئەکی)یان بە بەرچاویەوە کوشتو خۆیشیان بریندارکرد، ئێستا هەر لەجێگەدایەو کەساس کەوتووە"[1]. لەگەڵ ئەو هەموو تاوانانەی بەرامبەربە(کاك ئەحمەد) و هاوەڵانی ئەنجام دراوە، بەڵام (کاك ئەحمەد) لەبەرئەوەی بەوپەڕی بەرپرسیاریەتی ئایینی و نەتەوەییەوە کاریکردوە و لەڕوداوەکانی مێژوو شارەزاییەکی تەواوی هەبوو، ئەوەی زانیوە ڕۆژێك مێژوو هەموو ئەو کارانە مەحکوم بکات، جگە لەوەش خۆ بەبەرپرس زانینی(موفتی زادە) تا ئەندازەیەکە ڕێگەی پێنادات کەمترین بڕیاربدات ڕوبەڕوبونەوەی ئەو گروپانە بێتەوە، لەگەڵ ئەوەی لەتوانایدا هەبووە ئەو کارەش ئەنجامبدات، بەڵام ئەو دەڵێت"لەئێستادا موسوڵمانانی کوردستان ئەوەندە دەرکییان نییە تامەسائیلەکانیان لاڕۆشنببێتەوە و پاڵنەدە بەپاڵی زوڵمەوە. زۆرکەس هەیە پاڵی داوە بەپاڵ ئەم حیزب و ئەم گروپ و ئەو دەستەوە، تەنها لەبەرئەوەی حەقی بۆ ڕۆشننەبۆتەوە بۆیە ئیسلام ئیجازەنادات، لەگەڵ ئەو ئینسانانەدا شەڕبکەیت. کەسی وا هەیە دەچێتە ناوگروپی ئیسلامی و غەیرە ئیسلامی، بەڵام لەبەر حەق دەچێت وا تێگەیشتووە فلانە حیزبی دژە ئیسلامی دێت پارێزگاری لەحەق دەکات، ئەمەش لەبەرئەوەی سیاسەتی پیشانداوە، وەك کابرای موسوڵمانی فەقیر لە(دیواندەرە) وتویەتی"ئای ماشەڵا موسڵمانانی ئەمەسە ئەم-کۆمەنیستانە-دەیبەن بەرێوە." ئەمە بۆچی وادەڵێت؟ چونکە کۆمەنیستەکان واقیعیەتی خۆیان پیشانی خەڵکی نەداوە، ئەگەر کۆمەنیستە چۆن موسوڵمان دەبات

---

[1]) چاوپێکەوتنی بلاۆنەکراوەی نوسەر لەگەڵ ( کاك حەسەنی ئەمینی )بەرپرسی مەکتەب قورئانی کوردستان – سنە -٢٠٠٨.

بەرێوە؟!!! خەڵکی ئەمە نازانن، چونکە ئەو گروپانە بەجیاواز لەو واقیعیەی هەیانە خۆیان پیشانی خەڵکی دەدەن، هەتا لەسەرەتاوە مەلایان گرتبوو بەدەستەوە و دەیانوت ئەها ڕابەری ئێمە(مەلایە)، لەبەرئەوەی میللەتی هەژاربلێن، ئەها-مەلا-ڕابەریانە، لەهەندێك(لادێ)دا بیستومە چون نوێژ و پێش نوێژیان بۆ خەڵك کردووە!! ئەوخەڵکە ئاواخەڵەتاون نازانن حەق چییەو باطڵ چییە؟ زۆربەیان بەقسەو دروشم خەڵەتاون و کەوتونەتە شوێنی(گورگ)* و بەناونیشانی(شوان). زۆربەیان بۆ حەق چون، یانی لەڕوبەڕوو بونەوەیەدا وابکەن حەقیانە، چونکە دەڵێت مەسەلەن ئەم موسوڵمانانە زوڵم دەکەنو لایەنگری حکومەت و داگیرکەر و دەرەبەگ و خوێن مژن... دەی هەرکەس لایەنگری ئەوانەبێت دەبێت شەڕیکەیت لەگەڵی،"ئەگەر موسوڵمانیش بێتو نوێژیش بکات ئەم خەڵکە زۆری وا حاڵیکراوە وا تێگەیەنراون حەرەکەتی موسوڵمانانی کوردستان لایەنگری ئەو زوڵم و زۆرەن، دەی ئەگەر وابێت کەسێك لایەنگری زوڵم و زۆربێت دەبێت بدەیتە تەوقی سەریا و نابووتی بکەیت خەڵکی فەقیر بۆ ئەوەچوون. دەی چۆن چەك بدەمەدەست کەسێکەوە کەهێشتا ئیسلامی نەناسیووە لەبەرامبەر لایەن و قوتابخانەیەکەوە بوەستێت ئەویش هێشتا ئیسلامی نەناسیوە نابەرپرسیاریەتی و بەهیچ زانینی خوێنی ئەم میللەتە لای ئەوگروپانە گەشتوەتە ئاستێك خەڵکی بەموستەحەقی ئەوەدەزانن بکوژرێن، (یەك گەنجی بەئیحساس لەشوێنێکدا-کە ئەو جەماعەتە کۆبونەتەوە-دەڵێ، بەسە بائیتر ئەم شەڕە بوەستێت

---

*) کاك ئەحمەد، لەم شیعرەیدا زۆر بەڕوونی و جوانی باسی خەمی خۆیی بۆ کوردستان و پەژارەیی بۆ میللەتی کورد باسدەکات:

لافاوی داخ

دیسان خەیاڵی دەردی گرانی گەلو وڵات

لافاوی داخی ڕشتە کەلاوەی دڵی کوکۆڵ

داخی وڵاتە لەتلەتەکەی لاشە پڕ لە داخ

زوخاوی دەردی ملەتی داماوی خەم لە کۆڵ

ئیتر شەڕنەكەین بڕۆن سەیری ئەو چەم دۆڵە بكەن هەمووی لاشەی خەڵكە لەولاوە یەكێكیان تەلەفۆن دەكات و دەڵێت، جائەم خەڵكە بەكەڵكی چی دێت؟ هەریەكاری ئەوەدێن بكوژرێن..."[1].

ئەوەی تا ئێرە خوێندتەوە چەند هۆكارێكە وا لە(موفتی زادە) دەكات(سنە) بە جێبهێڵێتو بڕواتە(كرماشان)، ئەوەی لێرە بەدواوە لەسەر ئەم باسە دەیخوێنیتەوە وەڵامی ڕاستەوخۆی(كاك ئەحمەد)ە لەسەرهەمان بابەت، هەروەك لەسەرەتادا وتمان، ئەم باسە قسەی زۆر هەڵدەگرێت، بۆیە دەبینیت(موفتی زادە) لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا، كەبۆچی(سنە)ت چۆڵكرد؟ دەگەڕێتەوە بۆسەرەتاكانی مێژوو، وەك پیشەی هەمیشەی، ئەگەر پرسیارێكی ئاڕاستە كرابێت، ڕاستەوخۆ زانیویەتی وەڵامی ئەو پرسیارە چەنێك درێژە دەكێشێت، بۆیە زۆربەی كات دەڵێت"زۆر بەكورتی باسی دەكەم"، بۆئەم بابەتەش لەگەڵ ئەوەی دەڵێت بابەتێكی دورودرێژە، بەڵام بەكورتی باسی دەكەین، وەك وتمان سەرەتای باسەكەی لە بەرەبەیانی دەستەلات و قودرەتی كوردەوە دەستپێدەكات و بەشێوەیەكی قۆناغ بەندی هەوڵدەدات لەكۆتایدا بگاتە، ئەوەی هۆكاری كۆچی بۆ(كرماشان)چی بووە. ئەو ڕاستەوخۆ ناڵێت لەبەرئەم چەند هۆكارانە من بڕیاری كۆچكردنم داو و بەرەنگار نەبومەوە، بەڵكو لەئەنجامی خوێندنەوەی تەواوی باسەكە دەگەیتە هۆكارەكان، هەموو ئەمەشی لەبەرئەوە بووە بەكەسە نابەرپرسیارەكان بڵێت، ئەوەی ئێوە لێی تێگەیشتوون و بەهۆكاری كۆچی ئێمەی دەزانن وانییە. كاك ئەحمەد بەم شێوەیە باسەكە دەستپێدەكات:

"وەڵامی ئەم پرسیارە كەمێك ڕونكردنەوەی دەوێت، دەبێت قسەیەك لەبارەی حاڵ و وەزعی كوردستان و كوردەوارییەوە بەگشتی بكرێت، ئەگەر بەوێت ئەم باسە زۆر

---

[1]) كاسێتی ژ.(١٣)-(٢١٢)(چە زمانی با حكومتهای غیر ئسلامی جنگ مسلحانە لازم است)-A

بەڕونی باسبکەم ئەمەش هەندێك زۆری دەوێت، بۆیە بەکورتی قسەدەکەم، میللەتی کورد بەدرێژایی مێژووی زوڵمی زۆری دیوە، ئائەم بابەتە بەناوی(جەژنی نەورۆز)لەناو کوردەواریدا ماوەو کوردی فەقیریان پێ‌خەڵەتاندووەو دەڵێن، ئەمە جەژنی میللەتی کوردە، حەتا شاعیری بەحەماسەت مەسەلەن مەرحومی(پیرەمێرد) شیعری هەیە بەناوی نەورۆز دەڵێت:

**"ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە.**

**جەژنی کۆنی کوردە بە خۆشی و بە هاتەوە"**

ئەگەر واقیعیەتی مێژووەکەی سەیر دەکەیت. مێژووی دەست پێکردنی بەدبەختییە بۆ میللەتی کورد. سەرەتا ڕاستیەکەی ئەوەیە، ئەم بابەتە کۆنە ئەرزشی نییە، وەك ئەوەی دەڵێن "کای کۆن بەباکردن ئەرزشی نییە". مرۆڤی بەئاگا دەبێت لەبابەتی کۆن و تازە ئەوەی وا سودی هەیەو بەکاریدە خوات بەکاری بهێنیت و ئەوی دیکەی لاببات. مەسەلە هەیە هەر ئیمڕۆ ڕوودەدات خراپ و بەدە. دەبێت لای ببات و فڕێی بدات. مەسەلە هەیە لەکاتێکەوە مرۆڤ دروست بووە لەسەر زەوی تا ئێستا هەیەو هەر دەبێت ببێت و بەردەوام بێت. بەشێوەیەکی گشتی سودمەند بوون یان سودمەند نەبوون ئەسڵی بابەتە بۆئەوەی مرۆڤ کارێك بکات یان نەیکات .

ئەم بابەتەش لەو مەسائیلە کۆنەیە، کە لەدەورانی(شاهان شاهی) ئێراندا چی بوو پێش ئەوچی بوو، ئەمەش ئەرزشێکی بۆ میللەت نییە، مەگەر مرۆڤ بیەوێت ڕاستیەکی مێژوویی بزانێت، بەڵام بەهەر حاڵ، کاتێك میللەت فێری ئا ئەو کۆنە پەرستیە بێ ئەساسییە بێت و بڵێن"جەژنی نەورۆز جەژنێکە دەبێت یادی بکرێتەوە "لەبەرامبەرەوە مرۆڤ پێویستە لەسەری خەڵکی ئاگاداربکاتەوە، مەسەلەکە پێچەوانەیەو جەژنی نەورۆز جەژنی نابووتی کوردە، چونکە یەکەمجار-ئەمە ئیتر لە شتە ڕۆشنەکانە لە مێژووی ئێرانا. شتێك نییە بەناوی مێژووی کورد-لەئێرانا دوای

ئەوەی هۆزەکانی (فارس و ماد..)هاتن بەرەو ئەم ناوچەیە، ئەم ناوچەیە کەئێستا مەشهورە بە-ئێران-هەڵبەتە ئێران زۆر فراوانتر لەم سنورەی کەئێستا هەیە.- ئەمانە بەشێوەی هۆز، هۆز دەژیان هەندێك هۆزی دیکەش هەبوون هەر لێرە نیشتە جێ بوون، لەئەم ناوچەیە هۆزی(ماد) نیشتەجێ بووەو نیقامەتیان پەیدا کرد، دیارە ئەم(هۆزی مادە) لەو زەمانەدا لەمیللەتی کورد بوون، یەکەمجار ئەمانە حوکومەتێکی بچکۆلەیان دروستکرد، لەناوچەیەکی بچکۆلە لەنزیکی(هەمەدان)، لەوەودوا ئەم حوکومەتە گەشەیکرد، توانی تەواوی (ئێران)ی ئەو کاتە کە گەورەتر بوو بەناونیشانی یەك جوگرافیایی سیاسی فراوان دروستبکات.

زۆر وتراوە، چی ئەفسانەیەك دروستکراوە بۆ(زوحاك)!. (زوحاك) کۆتا پاشای کورد بووە، لە ڕاستیدا هەرچی لەبارەیەوە وتراوە درۆیە، (پاشا) یەك بوو قارەمان، بەلیاقەت و ئازا، هیچ کەس و بەشەر لەبەرامبەریەوە خۆی ڕانەدەگرت، بەلاَم لەزولم و زۆر و ئەمانا موتلەقەن خەبەرێك نەبووە، مرۆڤێك بووە زۆر سالم، زۆر بێ گرفت و عادل، بەلاَم هۆزی(پارس) کەدوای بوو بە(فارس) لێی نزیك بووەتەوە لەرێگەی ژن و ژن خوازییەوە وردە وردە چوونە ناو(دەربار)و بەکورتی کورد، کە خالّوانی(فارس) بوون هاتن کودەتایانکرد بەسەر زوحاکدا، ئەو(کاوە) کەدروستی دەکەن، ئەصل و ئەساسی نییەو یەك نەفەر کارگەر و زەحمەتکێش نەبووە دژی(شا) بجەنگێ، بەلّکو(فارسگەل) بوون دژی خالّۆکانی خۆیان کە(کورد) بوون کودەتایان کردوو حوکومەتیان لەدەس سەندنەوە، لەوەودوا (فەرەیدون)یان هێناو باسی(نەورۆز)و دانانی(کورش). بەجۆرە(شاهەنشاهی) زالّمی ئێرانیان دروستکرد. کە گەورەترین بەلاَبوو لەمێژووی مرۆڤایەتیدا. ئەگەر قسە لەکۆنەو باسی کۆن دەکەین ئەمە حەقیقەتی(نەورۆزە)، واتە دەستپێکردنی بەدبەختی میللەتی کورد.

حەدی ئەقل، لە(کورش)ەوە، یان پێش ئەویش، لەو ڕۆژەوە کە(زوحاك)یان لەکارخست، نیتر ئەم نەژادە، واتە میللەتی کورد میللەتی(ماد)ی کۆن. نە فەرهەنگی نە مەوجودیەتی، نەژادی، هیچی خۆی نە گردۆتەوە. هەر ژێر چەپۆکە و چەوساوە و بەدبەخت بووە. لەوەو دوایش، مێژووی ئیسلام هاتو کەمێك ئەم نەتەوەیی لەچنگی(شاهەنشاهی) ڕزگار کردوو کورد و فارسیش لەڕاستیدا ئەوانەی وا دەگەنە دەسەلاّت میللەتەکەی خۆشیان لەناودەبەن. میللەتی فارسیش زەلالەتی بووە بەدەستی شاهەنشاهی خۆیانەوە. نە لەڕاستیدا هەر زالّم و تاوانکاربوون — ئوصولەت سروشتی شاهەن شاهی زولّمو تاوانکارییە، ئەگینا(صەفەویەکان) کورد بوون، کەچی لەهەرچی شاهەن شاهی ئێرانە تاوان بارترو خراپ تر بوون تەنانەت نیسبەت بەکوردیش، ئەمانیش هاتن لەباتی کورد هەڵسێننەوە، کەچی ئەو هەموو کوشتن و کوشتارەی بەسەر کوردیاندا هێناوە وێنەی کەمە لەمێژوودانییە. دوای ئەوەی شاهەنشاهی کەوتە دەستی فارسەوە تەواوی میللەت بەدبەخت بوون، لەم بارەدا میللەتی کورد فەرقی لەگەڵ فارسەکاندا نەبوون، فەرهەنگەکەشی لەناوچوون، لەم لایەنەوە هەر زولّمی لێکراوەو بەناوی میللەتێك ناوی نەما لەبیر چوویەوە، لەدەورانی ئیسلامدا ئەم بارودۆخە گۆڕا. کەسەردەمی خەلافەتی حەزرەتی(عومەر) بوو، لەوکاتەدا شاهەنشاهی ڕوخێنرا ووردە ووردە میللەتی ئێران گشتی سەری بەرزکردەوە، بەلاّم دەستەو تاقمەکانی شاهەن شاهی کارێکیانکرد دووبارە میللەتی ئێران کەوتە ژێر چەپۆکی شاهەنشاهی و(شاه) دروست بوویەوە، ئەڵبەتە فەسادی دەزگاکانی(ئومەوی و عەباسی) هۆکارێك بوون بۆ ئەمە، کەپاشماوەکانی دەسەلاّتی شاهەنشاهی دەست بەجووڵە بکەنەوەو بتوانن میللەتی ئێران جیابکەنەوە لەباقی سەر زەمینی ئیسلام. ئەمە کورتەیەك لەبارەی ئەوەی دووبارە زولّم پەیدا بوویەوە. دووبارە میللەتی کورد کەوتە سەر ئەو بارە بەدبەختیە

هەروا سەدەی جیاواز، جیاواز گوزەریان، دەسەلاتی جۆر جۆر دەهاتو دەچوو، تا لەم ئاخیرەوە قیافەی داگیركاری ئەوروپای(ئینگلیز و فەرەنسا) پەیدا بوو. لەوەودوا دووبارە لەقارەی(ئەمریكا) (ویلایەتە یەكگرتووەكان) گەشتە دەسەلات وهاتن جێگەیان بە(ئینگلیزو فەرەنسا) لێژكرد. ئالەمكاتەوە، لە زەمانێكەوە ئیستیعمار لە ئەوروپاوە دەستی پێكرد ئیتر سەرگوزەشتەی ئەم وولات و ناوچەیە حاڵەتێكی پەیدا كردوو زۆر جیاواز لەگەڵ كۆنا. ئەم دوا براوانە هاتن، خاكی كورد، سەرزەمینی كوردیان بەوجۆرە لەتوپەتكرد بەسەریەكدا، تیكەیەك- پارچەیەك-لە (ئێران)، تیكەیەك(توركیا)، تیكەیەك لە(شورەوییا-ڕوسیا-) تیكەیەك لە(عێراق)و، تیكەیەك لە(سوریا) ئا بەجۆرە لەتوپەتیان كرد بەسەریەكدا! ئەمەش لەبەر دوو هۆكار بوو، واتە ئەم دابەشكارییەی كوردستان لەبەر دوو هۆكار بوو:-

یەكەم: لەخودی میللەتی كورد دەترسان، میللەتێك بووكە ئەهلی نەبەردو ئازایەتی بوو. شارنشینی تەواو خوێری و خاوی نە كرد بوو، چونكە شارنشینی، جۆرێك لەئازایەتی و ئەمانە لەمرۆڤ دەسێنێتەوە، هەرچەند ئەگەر فێركاری گەورە ببێت، جۆرێكی دیكە لە ئازایەتی جێگەی دەگرێتەوە، بەلاَم جۆرێك لە ڕووبەڕوو بوونەوەی مەردانەی و شەهامەتی نائاسایی دەوێت، وەك نەخەوتنو توند و تۆڵی و هاتوو چۆو ڕاكردن. ئەمە لەشارەكاندا نییە، ئازایەتی لەدێهات و ناوچە عەشایەرییەكاندا جۆرێكە لەشارەكاندا جۆرێكی دیكەیە. بەهەرحاڵ، چونكە شارنشینی گەورە لە ناوكوردەواریدا نە بوو ئەو جۆرە ئازایەتیە لەبەرامبەر دوژمنەوە بتوانن مەردانە شەڕ بكەن لە ناوكورددا بوو، لەبەرئەوە



لەنەتەوەیی کورد دەترسان حەزیانکرد لەتی بکەن و هەر لەتێکی بدەنە باوەشی نۆکەرێکەوە کەنەتوانێ سەر بەرزۆ بکاتەوە.

دووەم: بۆئەوەی خودی میللەتی کورد بکەنە داردەستی خۆیان. ئەم حوکومەتە نۆکەرەی، کە دروستیانکرد میللەتی کورد بدەنە گژیاو بدەنە تەوقی سەریا، چونکە میللەتی کورد هەست بە نارەزایی دەکرد، بۆئەوەی بلێن"ئەها ئەوە بوو زوڵمیکرد لەتۆ"، ئەگەر مەسەلەن حوکومەتی(ئێران- سوریا- عێراق) هەرکام لەمانە گەرەکیان بوو سەرکەشی بکەن لەفەرمانی داگیرکەران، بێژنە کورد ئەمانە زوڵمیان لەئێوە کردووە تا بیاندەنە گژییەکدا، هەمیشە ئەمە بەرنامەیان بووە، هەم خۆیان بدەنە تەوقی سەری میللەتا، هەم میللەتی کورد بدەن بەگژی ئەواندا. ئەمە زوڵمێك لە ئەندازە بەدەر گەورە بوو لەوکاتەدا دەیان سەپاند. بەدرێژایی مێژوو لە(کورش)ەوە، یان لە ڕۆژی(نەورۆز)ەوە میللەتی کورد بەناوی میللەت نەماو فەرهەنگی میللی و هەرچی شتی هەیە لە ناوچوون، لەم ئاخیرەشەوە، لە داگیرکاری(ئینگلستان و فەرەنسا)وە سەر زەمینەکەشی لەتوپەتکرا بەسەریەکدا ئاوا ئەم گشتە بەدبەختیەی بەسەر داهات. ئەمە لەڕووی میللی و نەژادی و فەرهەنگییەوە، ئەمە لەڕووی سەرزەمینی و جوگرافیاییەوە.

ئێستا بێینە سەرباسی(دین)، تەنها سەرمایەیەك دەبوایە میللەتی کوردی ڕزگار بکردایە، بریتی بوو لە(دین) لە(ئیسلام)، چونکە ئیسلامە ڕۆشن دەڵێ بەئینسان "دەبێت جیهاد بکەیت و زوڵم قبوڵ نەکەیت"، ئیسلامە هەرچی زوڵم و عەدالەتە ڕۆشنی دەکاتەوە و دەڵێت، کامە زوڵمەو کامە عەدالەتە، ئەگەر بەڕاستی لە ناومیللەتی کوردا موسوڵمانی بوونی هەبوایە شکی تێدا نییە زۆر سەهل و ئاسان دەیتوانی هەڵسێتەوە لەبەرامبەر ئەم گشتە زوڵمەو مافی خۆی

وەرگرێتەوە، بەڵام چیبکەین بۆئەوەی ئەم بیرەش نەکرێتەوەو کارێك بکەن موسوڵمانیش ئەو تەکان-جوڵە-و هێزەی نەمێنێت و نەتوانێت بجوڵێت، ئەم سیاسەتە بەکاریانهێنا، ئەم شەیتانییەتیە کەدەنگی موسوڵمانێتی بگۆڕن و هێزو تەکانێك کەئیسلام دەیداتە ئینسان لێی بسێننەوە، نەك هەر بۆناو کوردەواری بۆ تەواوی سەر زەمینی ئیسلام ئەم کارەیان کرد، بەڵام لەهەر جێگەیەکدا بەجۆرێ.
لە وولاتی کوردەواریدا بەجۆرێك زۆر بەکورتی کارێکیان کرد لەنەزەری میللەتی کورددا موسوڵمانی بێننە ئەوە فەقەت نوێژەکەی بکات و ڕۆژووەکەی بگرێت،و ئەگەر دەوڵەمەند بوو زەکاتەکەی بدات،و ئەگەر پووڵ و دەسەڵاتی بوو بچێت (حەج) بکات،و لەکاتێکدا گەشە دەکات،و ئەگەر کوڕە یان کچ بڕۆنە لای مەلایەك و مارەی کچ ببڕێت بۆ کوڕ و پارەیەك بدرێتە مەلا،و ئەگەر کاتێك کابرای فەقیر دەمەقاڵێیەکی بوو لەگەڵ ژنەکەیدا تەڵاقێك هات بەزمانیدا بەبێ دوا کەوتن ئەم مەلا پاسی بات(بی نیرێت) بۆ ئەو مەلاو هەمتر ئەو بینێرێ بۆ ئەو، یەك یەك(٥٠ تمەن و ٢٠٠ تمەن) بسێنێت لە کابرای کوردی فەقیری بێچارە ڕووتی کەنەوە و لەوسەرەوە دەڵاڵی شێخەکان، تەکیە و خانەقاکانیان دروستکردووە و دەستیانکردووە بەمیللەت ڕووتاندنەوە ئامادەن هەمیشە دێوانانە-شێتانە- دەکەونە ناومیللەتی بێچارەو کابرای هەژار دەستی ناگاتە دەمی خۆی و ناتوانێت ماڵ و منداڵەکەی تێر بکات. دەبێت ساڵی جارێك، دووجار هەستێت لەدەمی ماڵ و منداڵی بگرێتەوە و بیبات بۆ تەکیەو خانەقای شێخ، ئەمە بارودۆخێك بوو میللەتی کورد بەناوی موسوڵمانی بوویی. میللەتی کورد لەموسڵمانی هەر ئەمانە حاڵی بوو، هیچی تر!! بەڵام ئیسلام دێ دیفاع دەکات لەمیللەت، ئیسلام دێت حەقی مەزڵوم لەزاڵم بسێنێتەوە، ئیسلام دێت

بداتە تەوقی سەری زاڵمدا داغانی بکات و لەناوی بەرێت. ئیسلام دێت ئەم گشتە سەروەت و داراییە وا کۆبۆتەوە لای کۆمەڵێك. لێیان بسەنێتەوەو دابەشی بکات بەسەر هەژارو فەقیرا، ئیسلام دێت ئەم گشتە مالیکە قودرەت مەندە وا گیانی هەرچی جوتیار بوو کێشابوویان ووردیان بکات و لە قوڕگیان دەری بهێنێتەوەو بیداتە دەستی خەڵکی. خەبەر لەجۆرە ئیسلامە نەبوو-وایانکرد کەس ئاگای لەم ئیسلامە نەبێت-، کەسێك نەبوو شك ببات کەئیسلام ئەمەیە، هەتا زۆرێك لەمەلاکان* هەروەك(شێخەکان)ساخت و پاختیانکرد-ڕێککەوتبوون-بوو، لەگەڵ ئەشراف و زۆردارەکاندا دەیانووت"هەر ئەمە شەرعییەو دەبێت وابێت"، ئەگەر باسێك بکرایە ئەمە زوڵمە ئەمە ناحیساب و نامەشروعە قانونی ئیلاهی ئەوەیە، وا ئەوکەسە زەحمەت دەکێشێت لەسەر زەوییەك، ئەو دەرامەتە هی خۆیەتی نەك هی کابرایەك کە لەسێبەردا دانیشتووەو خۆشگوزەرانی دەکات، و خەڵکی بڕۆن ئارەق بڕژێنن و ماندوو بن و ئەو بیخوات دەیانووت"ئەمە کوفرە"، هەروا شێخەکان وایاندەووت، خۆشیان زاڵم بوون (زۆرێك لە شێخەکان) مەلاکانیش هەندێك بوون دەیاندایە پاڵ شێخەکان. جۆرێکی تری زوڵمەکان(دەربار) بوون، حوکومەت و نۆکەرەکانی حوکومەت هەر دەستورێکیان بدایە هەر فەرمانێکیان بدایە ئیتاعەتیان دەکرد. لێپرسراوی دەوڵەت بهاتایە لەشارەکاندا، یان لەدێهاتەکاندا زوڵمی بکردایەو عەزیەتی خەڵکی بدایەو ئیهانەی بکردایە میللەتی بێچارە حەقی نەبوو(لەل)-

---

*) کاك ئەحمەد، لە یەکێك لە کۆبوونەوەکانیدا، بەناوی(یادی مەولود)، کە لەماوەیەکی دیاریکراودا لایەنە گرنگەکانی سیرەی پێغەمبەر(ﷺ) باسدەکات، و بە ڕونی باس لە پێغەمبەر بوونی پێغەمبەر دەکات. هەر لەو کۆڕەدایە وتە مێژوویییەکەی دەربارەی کار و کردەوەی هەندێك لە مەلاکانی سەردەمی خۆ دەڵێت،" من تەعەجوب دەکەم لە خەڵکی ئەم شارە، ئەم گشتە مەلایەیان هەیەو هێشتا موسوڵمانن و خوا دەناسن و ڕێگەی ئیسلامیان ون نەکردووە". کاك ئەحمەدی موفتی زادە: کاسێتی مەولودنامە.

هیچ قسەو رەخنەو نارەزاییەك دەرببرێت-بچوك ترین قسە بكات. حەقی نەبوو لار بروانێت، چونكە مەلعونەكان و شێخەكان و هەندێ لەمەلا دین فرۆشە مەلعونەكان، مانای قورئانیان دەگۆراو"أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ". (أُوْلِي الأَمْرِ) واتە(شاه)، یانی بەرپرسانی دەولەت، كەباسمانكردووە (وَأُوْلِي الأَمْرِ)، یانی بیرمەندانی ئیجماع، بیرمەندانی ئەهلی حەل و عەقد، كە شورا دروست بكەن و لە رووی پێوەرە ئیسلامییەكانەوە بتوانن ئەحكام رابگەیەنن هەر حوكمێك بەو جۆرە ئیعلام بكرێت واجبە گوێ رایەڵی بكرێت. ئەوان دەیانووت "واتە، حوكمی(شاه)، یانی هەر فاسد و خراپە كارێك هەرچی بڵێت، دەبێت بەگوێی بكەیت". جامیللەتی كورد بەوشێوەیە لە موسوڵمانی حاڵی بووە، میللەتی كوردی بێ چارە ئەوە حاڵی بوو. ئەوە زەمان و فەرهەنگ و سەرزەمینی بوو، ئەوەش دینەكەی بوو! شتێكیان بەناوی ئیسلام دابوویە كوردی بێ چارە كە بەراستی لە هەرچی سیستەمە خەتەرناكتر بوو.

ئەوە چی جۆرە ئیسلامێكە هەر بڵێت(نوێژو رۆژوو) بكەو برۆ پارە لەرێی حەجدا خەرج بكەو دەوڵەمەند بووی زەكات بدەو پارە بێنە بۆ تەكیەو خانەقاكان، و ئەگەر تورە بوویت قسەیەك بەزمانتا هات، ژمارەیەك لەمەلاكان رووتو بكەنەوەو بەناوی(تەلاق) كەوتن و بڵێن چاكی دەكەینەوە بۆت، ئا ئەمە موسڵمانێتییەكەشی بوو، دەی ئەم میللەتە بێ چارە بەدبەختە، چ لایەكی ئاوەدان بوو كە دڵی پێ خۆش بكات؟ چ خۆشییەك لەمێژوو ژیاندا مابوو تاحیسابی بكات بۆ خۆی؟ ئەمە میللەتی كورد بوو.

زۆرێك ئاگادارن بەتایبەت گەنجەكان چەند ساڵ پێش ئێستا، كەوتمە هەوڵ و تەقەلا كە موسوڵمانی راستی لەناو میللەتی كوردا زیندوبێتەوە و بامیللەتی





کورد بزانێت کوڕە(شێخ و مەلا)درۆی لەگەڵدا دەکەن و موسڵمانی ئەمەنییە، موسڵمانی ئەوەنییە لەدەمی خۆی بگرێتەوە و بیبات بۆ تەکیەو خانەقاکان. موسڵمانی ئەوە نییە بەناوی(تەلاق کەوتن) تالآن بکرێت و پارەی پێ نە هێلرێت، موسڵمانی ئەمە نییە کابرا ئەم گشتە زوڵمەی لێ بکرێت و بەشی بخورێت‌و دەنگ نەکات، موسڵمانی ئەوە نییە کۆمەڵێك لە خۆشگوزەرانیدا ئەمرو نەهی بکەن و فەرمان دەربکەن و باقی تر هەمیشە لە کوێرە وەری و زیللەت بکێشن، بەزیللەت و جەفارەتەوە لەبەرامبەر ئەوانی تر بوێستن، بە پێوەبن لە بەرامبەر ئەرباب و دەسەلآتدارانەوە زەلیل و فەقیر بوەستانایە.

بەهەر حاڵ ئێمە هەوڵماندا ئەم بەرنامە لەناو بەرین و میللەت حاڵی بکەین دینی واقیعی چییە، دین ئەمەیە سەرو خوار-کەسێك لەبەرئەوەی مەسئولە لەپێشەوە بێت و هەژارێك لەبەر هەژار بوونی بکەوێتە خوارەوە لەهەموو شتێکدا- نەمێنێت، ئیسلام ئەوەیە زۆردار و بێ زۆر نە مێنێت، دەوڵمەندو هەژار نە مێنێت ئەمانە دەسکیسەو کەڵکە، ئەم موسوڵمانییە کەئەم شێخ و مەلا دروستیان کردووە بۆ ئێوە ئەمانە دژی دینی خوایە، ئەمانە دژی قورئانە، قورئان‌و پێغەمبەران(درودی خودایان لەسەربێت)جۆرێکی تر بەرنامەیان پەیڕەو دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) هات ئەمانە وا شێخ و مەلاکان دروستیان کردووە، ئەم زوڵم و زۆرە لەناو بەرێت، ئەمانە وا(شاهەنشاهی) بەرپرسانی دەوڵەت دایان ناوە. پەنا بەخوا کاتێك بەرپرسێك دەچوویە لادێیەك چی ترس و لەرزێکی دەخستە دڵی ئەو خەڵکە هەژارەوە، ئیسلام بۆئەوە هات ئەمانە بپێچێتەوە.

لەساڵی(١٣٤٣)وە دوای ئەوەی لە(تاران) هاتبوومەوە تەقریبەن هەر خەریك بووم و کارێك نە دەکریا. ترسی دەوڵەت و شێخ و مەلا لەدڵی خەڵکدا زۆر بوو، ئەگەر

كەسێك هاتووچۆی منی بكردایە دەوڵەت دەیگرت و ئازاری دەداو مەلاكانیش پێیان دەووت كافرەو مونافیقە، لەبەرئەوە خەڵكی فەقیرانە زاتییان نەبوو حەقیشیان بوو، هەتا ساڵی(١٣٥٢) كە شوكر بۆ خوا ئەو بەربەستانە شكاو گەنجان لەو كاتەوە بیریان كردەوە، بەڵێ كەسێكی تر هەیە بەجۆرێكی دیكە لەبارەی دین و میللەتەوە قسە دەكات و بە جیاواز لەبارەی فەرهەنگ و مەحرومیەتی میللەتەوە قسە دەكات. زۆرێك لە بیریانە تەنها من شەرواڵی كوردیم لەپێدەكردو و خەڵكی سەرجادە تانەو تەشەریان لێدەدام و مەگەر تۆ (چێواری)* مەگەر تۆ كرێكاری. ئەمە جلی(چێوار و كرێكارە)، بۆچی شەرواڵ لەپێ دەكەیت؟

منیش وردە وردە باسم دەكرد بۆ خەڵكی، ئەگەر چێوار و كرێكار بەشەرن دەی منیش بەشەرم وەك ئەوان، ئەگەر ئێوە چێوار و كرێكار بە بەشەر نازانن منیش حەز دەكەم وەك ئەوان بەشەر نەبم. بەوجۆرە كە فیكری ئیسلامی خەڵكی فێردەكات. زۆركەس دەزانن ووشەی(كاكە—خالۆ —مامۆ) لە(سنە)و دەورو بەریدا بۆ ئیهانەكردن بەخەڵكی بەكار دەهێنران، كەسێك فەقیر بوایە ئەو ووشانەیان بۆ بەكار دەهێنا، بە هاورێكانم ووت، جگە لەوشەی(كاكە)هیچم پێنەڵێن، ئەگەر ئێوە ڕازی نین من بەئێوە دەڵێم(ئاغا)، بەلاّم ئێوە بەمن بڵێن(كاكە)، بەمجۆرە ووردە ووردە جلی كوردی و فەرهەنگی كوردی ڕێزێك پەیدابكات و لەناوشارەكەی خۆماندا(سنە) كەسێك دێهاتی فەقیر دەهات بەجلی كوردییەوە،و بەگاڵتە پێكردنی و كلاّو شاڵەكەیان فڕێ دەدا، ئەم فیكرە ووردە ووردە بگۆڕێت و بزانن كوردن.

---

*) چێوار: ئەوكەسەیە كاری ئاژەڵداریدەكات و ئاژەڵ(مانگا، بزن، مەڕ...) دەكڕێت و دەیفرۆشێت.

وای لێهاتبوو خەڵکی دەگەیشتن بەیەکتری پێیان عەیب بوو بەکوردی قسەبکەن، هەر ئەمانە ئێستا موونافیقی خوێڕی بە درۆ بەکرێگیراوی (حیزبی بەعسو ئەمریکاو ئیسرائیل ) دەڵێن"ئێمە کوردین". دەزانن ڕەفتاریان چۆن بوو .

تـــا دوێنێ بوو پانتۆڵ و کڵاویان لەبەرەکردو و ڕیش و قژیان تێکەڵدەکردوو ملوانکەیان لەمل دەکردو و بنێشتیان دەخوارت، ئێستا مۆدەی ئەوە نەماوە و لەلایەکی ترەوە پارەیان پێ دەدرێت بۆکارێکی دیکە دەچن بەناوی کوردەوە قسەدەکەن، کە زۆریان هەیە خۆیان بە کورد نازانن ئەوانەش بەرنامەیان بۆدادەنێنن، کوردنین، لەحالێکدا هەیانە ژن و منداڵەکەیان هەر بە کوردی قسەناکەن، بەڵام بۆ کورد و میللەت خەڵەتاندن ئێژن کوردین. ئەم جوانگەلە یەکە یەکە بوون موقەیەد بوون و زۆر نە دەهاتن ترسیشتان فرە نەبوو کە پێتان بێژن کافر یان دەوڵەت بیانگرێت، وورده وورده لە ساڵی(١٣٥٢)بەولاوە هاتووچۆ پەیدابوو، ئەمە هەر ڕوویدا بەردەوام بوو تا گەیشتە ئەوەی(الحمد الله) ژمارە زۆربوو. سەیرمکرد لەسەرانسەری کوردەواریدا ژمارەیەك خەڵك هەیە ئەهلی کارن و توانایان هەیە، کەوتمە فیکری ئەوەی بۆ ئەم ڕەفیقگەلە، ئەم براو خوشکانەی وا هەندێك لە ئیسلام تێگەیشتن و شەهامەت و ئازایەتیان هەیە و ناترسن لە حوکومەت و شێخ و مەلا دەوڵەتیەکان، مەرکەزگەلێك دروستبکەین بۆ ئەنجامدانی چالاکی، کە بتوانین میللەتی کورد ووریا بکەینەوە، لەژێر ئەم گشتە بەدبەختیە بیهێنینە دەرەوە.

دەستمانکرد بەدروستکردنی(مەدرەسەی قورئان)، مەدرەسەی قورئان دروست بوو، لەماوەیەکدا، چونکە میللەت زۆر زوڵمی لێکرا بوو لە زوویەکەوە بەدبەختی دەکێشێت بەدەست شێخ و دەوڵەت و زۆرێك لەمەلاکانەوە ئەو

پێشوازییە عەجیبەی لێكرا وا دەنگی دایەوە. لەگشت جێگەیەكەوە خەڵكی پێشوازیان كردوو حازر بوون بە تەواوی وجودەوە هاوكاری(مەدرەسە)بكەن و بێن دەرس بخوێنن و لەئیسلامی واقیعی شارەزابن و بزانن ئیسلام ڕێگەی ڕووبەڕوو بوونەوەیە، ئیسلام ڕێگەی قبوڵنەكردنی زوڵم و لەناوبردنی زاڵمانە.

ئەم چالاكیانە وورده وورده خەریك بوو توانایی پەیدا دەكرد، كە ئەم ئینقلابی ئێرانە هاتە بەرەوە. بەڵێ ئینقلابی ئێران حەقی میللەتی ئێران بوو دوای (٢٥٠٠) ساڵ لە زوڵمی شاهەنشاهی نەجاتی ببێت، بەڵام بەداخەوە ئینقلابێك فرە سەحییانە بوو بێ پایە بوو، شتێك بوو هەروا وەك ئاگر لە كوتوپڕ بلێسە بكێشێت، وەك پوشێك ئاگری تێبەر بدەیت بەوجۆرە میللەت ئەوەندە توڕە بوو لەدەست زوڵم و فەسادی شاهەنشاهییەوە گشتی سەر تا خوار ڕاپەڕی. حەقیقەتی ئەوەبوو(هەرچەندە ئەم ڕاپەڕینە هۆكاری ڕزگاری ئێران بوو)، بەڵام بۆ من زۆر كاریگەرهێن بوو كە ئێمە بنەڕەتی یەك قیام و ئینقلابێكمان دانابوو، كە لە داهاتوودا، بەڕاستی بتوانێت لە هەرچی بارەوە، هەم میللەتی كورد هەم میللەتان ڕزگار بكات، بەڵام چی ئەمانە ئا بەم ئینقلابە سەحییە بردیان بەڕێوە، كەئەو ئینقلابە بونیادییە ئەو كارە ئەساسییەیە كە ئێمە كردبوومان ڕووبەڕوو ببێتەوە، لەگەڵ كۆمەڵێك موشكیلا كەباسی دەكەن. سەیری ئینقلابەكانی دونیامان كردوە، لەئەم ساڵانەدا لەو كاتەوە كەئیتر داگیركەر تازە پەیدابووە، لەبەرامبەر ئیستیعماری گەورەی غەربەوە كە ئەمەریكا ئێستا بووەتە سەرداری، لەم لاشەوە شورەوی-سۆڤییەت-بۆتە سەرداری، جۆرێكی دیكە لەئیستیعمار و وڵات داگیركردن لەو زەمانەوە ئەمانە بەوجۆرە دەسەڵاتیان پەیداكردووە بەسەر ئەم وڵاتە بەدبەختە بێچارانە لەهەر شوێنێكدا حەرەكەتێك كرابێت تەكانێك

درابێت، بۆئەوەی میللەت ئازادببێت لەژێر دەستی حوکومەتێك، کە ئەم حوکومەتە نۆکەری ئەو ئیستیعمارانەیە بەجۆرەها دەسکیسگەڵ داویانە بەسەریانداو نە یانهێلاوە سەر بەرزبکەنەوە. هەرئەم میللەتی ئێرانە چەندین جار حەرەکەتی دەستپێکردووە هەر بەکرێگیراوان داویانەتە سەریاناو خەفەیانکردووە.

مەسەلەن ڕووداوی(سەرداری جەنگەڵ) ئینقلابی(جەنگەڵ) ئینقلابێك بوو بەڕاستی پتەو عادلانە مەنتقی ڕێك و پێك لەوانە بوو لەم ئینقلابەی ئاخیریش ئاییندەی باشتر بوایە، چونکە ووردە ووردەو تەدریجی دەڕۆیشتە پێشەوەو هەر لەبەرئەوە مەحکەم ڕێگەی دەبڕی. لەوکاتا ئینگلستان فرە زۆرداربوو لە (ئێران)دا، (ئینگلستان و ڕوس) شورەوی سەردەمی(لینین). -لینین-ێك، کە خەڵکی وا دەزانن واقعانە فریادڕەسی مەردمە. کە نامەکانی ماوە چی دەسیسەیەکیان گرت بۆ لەناو بردنی ئەم ئینقلابە —(ڕەزاخان)ی دوابراویان هێناو دەسەلاتیان پێداو خستیانە سەرکارو(لینین) موکەڕەر سفارشی-پەیام-ی نارد و نوسی بۆ(سەرداری جەنگەڵ)، کەدەبێت تەسلیم ببیت، چونکە ڕێکەوت بوو لەگەڵ ئینگلستانا میقدارێك سودی تێدابوو بۆ(شورەوی). (ئینگلستان) پەیمانی دابوو لە(ئێران) دەستیگیربوێت-پاشەکشەبکات-، کەلەوانەیە حەدی ئەکسەر (ئەوکاتە قیمەتی ملیۆنێك بوو لەسالێکا-واتە دەکرێت بلێین قیمەتی(٥٠٠-٦٠٠ ) هەزار تمەن سودی تێدا بووە، لینین بە(٥٠٠هەزار تمەن)سود کە ئینگلستان پێیدا لەسەرمایەی(ئێران) نەك هی خۆی، ئینقلابی ئێرانی فرۆش. (سەرداری جەنگەڵی) فرۆشت و ئێرانی بەدبەختکرد.

یان ساڵی(١٣٣٢) لەبابەتی(نەوت)دا، کەئەم دووانە زۆر گەورە بوون لەئینقلابی ئێراندا هەرچەند بەو مەحکەمی و پتەوییە ئینقلابی(جەنگەڵی) سەری نەگرت،

بەڵام بەڕاستی تەواوی میللەتی خستبوویە جموجوڵ. خەریك بوو میللەتی ئێران هەم لەدەستی(شاهەنشاهی) و هەم لەدەست تەڵەی ئیستیعماری(ئینگلستان) ڕزگاری بوێت. لەو كاتە ئەمەریكا دەستەلاتی پەیدا نە كردبوو لەئێراندا.

لەو كاتا(ئەمەریكا) هەوڵی دەدا لەئێراندا وەك لەزۆر جێگەكانی دیكە بتوانێت شوێن پێی خۆی بكاتەوە. كەهاوپەیمان و دۆستن پێكەوە، بەڵام خۆ ئەمانە شەرەفییان نییە، وەك كۆمەڵێك دزو تالآنكەر كەهاوپەیمانن بۆ دزی بەیەكەوە، بەڵام هەرچی بتوانن كلاو دەنێن سەری یەكتری، هەتا یەكتری دەكوژن ئەم ئیستیعمارگەل بەوجۆرەن. كەرەكی بوو بەهەر جۆرێك بێت جێگەی ئینگلستان لێژبكات و خۆی جێگەی بگرێتەوە.

بەهەرحاڵ ئینقلابی(ئێران) سەری دەگرت. بەڵام بەوجۆرە ئەو ئینقلابەیان وردكرد لەرێگەی سەرلەشكری(زاهدی) كە(شا)یان هێنایەوە بەوجۆرە چەندین(دە) ساڵ میللەتی ئێرانیان خستەوە ژێر چەپۆكی زاڵم لەساڵی(١٣٣٢) بۆ ساڵی(١٣٥٧)، دووبارە تالآنی مەملەكەتەكە كرا. ئەم نۆكەرەیان دانا پاسیان بۆ-چاودێری- بكات و خۆیان مەملەكەت تالآنبكەن.

لەزۆرێك لەجێگەی دونیادا، هەركات میللەت ویستوویانە حەرەكەتێك و تەكانێك بدەن بە خۆیان و لە ژێر چەپۆكی ئەم زاڵمانا بێنە دەرەوەو نیشانی ئەدات-وەك ئەم ئینقلابە لە ئێرانا كەوتۆتە ڕێ- خەتەرگەلی گەورە گەورەی بۆدروست دەبێت هەروا كارێكی ئاسان نییە، ئەگەر ئەو ئینقلابە وا ئێمە خستبوومانە ڕێگەوە ئەو حەرەكەتە وا بە تەدریج و وردە وردە دەرۆشتە پێشەوە هەروا برۆشتایەتە پێشەوە حیسابمانكردبوو لای كەم(١٠-١٥) ساڵی تری دەویست، كەمیللەتی كورد بەباشی و وردی حاڵی بێت لەحەق و ناحەق. حیسابی حاڵی بوێت لەعەدالەت و زوڵم، حیسابی حاڵی بوێت لەئیسلام و دەربار و تەكیەو خانەقاو جیاوازی ئەمانە بناسێت

و جیایان بکاتەوە، تێبگات چ زوڵمێکی لێکراوە، چ بەشگەلێکی خوراوە، ئەمانە بەباشی دەرك بکات.

بەڕاستی کاتێك حەرەکەتی ئینقلابی دەستی پێکرد بەتەواو تواناوە بڕواتە پێشەوە لەوانەیە نەك تەنها میللەتی کورد، بەڵکو باقی میللەتی مەحرومی ئێرانیش گشتی ڕزگار بکات. حەتا ئیحتیماڵی ئەوەش بوو میللەتی کوردی بێگومان ڕزگار دەکرد، چونکە مەحکەم دەڕۆشتە پێشەوە، وەك منداڵێك بەتەدریج و ووردە ووردە دەرسی پیێ بڵێیت تا شپرز نەبێت. تا لەئاخرەوە زۆر زیرەك و زۆر بە توانا دەبێت و زۆرباش حاڵی دەبێت، حەرەکەتی ئینقلابیش بەوجۆرەیە، هەروەك ئەوەی ئێمە لەساڵی(١٣٢٣)دەستمان پێکردوو لەساڵی(١٣٥٦)دا دەستمانکرد بەدامەزراندنی (مەدرەسەی قورئان)و حیسابمان کرد بوو لای کەمی(١٠-١٥) ساڵی تردەبێت کاربکەیت تائەو کاتەو بڵێین میللەتی کورد هەڵسەرەوە بۆسەندنەوەی حەقی خۆت، بۆئەوەی ئیتر لەژێر زوڵم بێیتە دەرەوە، وردەوردە لەڕووی(دینییەوە فکرمان ڕۆشندەکردەوەو لیباسی کوردیمان لەبەردەکرد، و مەسەلەن هەندێك گەنجی بەئیمان دەهاتنە لامان و پێیان عەیب نەبوو (پانتۆڵیان) لادەبردوو(شەرواڵیان) لەپێدەکرد، کەسی واهەبوو (ماستەر و دکتۆرای)هەبوو پێی عەیب نەبوو، چونکە قبوڵی بوو شەرواڵی لەپێدەکرد، تاوردە وردە میللەتەکە خۆی لەبەرچاوی خۆی موحتەرەم ببێتەوەو فەرهەنگ و لیباسەکەی خۆی ئیحترام پەیدا بکات. ئەم کارە کەئێمە لە(سنە)ەوە دەستمان پێکردبوو وردە وردە بڵاو دەبوویەوە.

لەهیچ شوێنێکدا خەبەرێك نەبوو، لەگشت شوێنێکدا شێخ و مەلاکان گشتی ناتوانا، شێخەکان گشتی جاسوس بوو، ئەصڵەن کاریان هەر جاسوسی و خیانەت بوو، مەلاکانیش هەندێکیان بووبنە جاسوس و خائین و دەسەڵاتیان بەدەستەوە بوو مەرتەبەی بەرزی حوکومییان هەبوو، باقی مەلا فەقیرەکانیش دەسەڵاتیان نەبوو

هیچیان پێ نەدەکریا، هەم لە ڕووی داراییەوە هەژار، هەم لە ڕووی سیاسییەوە هیچ قودرەت و ڕێزێکیان نەبوو کارێك بکەن. وردە وردە خەریك بوو بلاوەبوویەوە میللەتی کورد وریا ببێتەوە. بزوتنەوەیەك بەوجۆرە بڕۆشتایە لەکۆتاییەوە جێگەی ئومێدبوو، ئەمما ئەم ئینقلابی ئێرانە دروستبوو، وەك بەعزە باوك و دایکێك ناشی منداڵەکەیان نەخۆشە، یان زەینی کۆڵە-لەبەرکرنی زانیاری زەعیفە- لەشتێکدا زۆری بۆدەهێنن دەڵێن"دەبێت یەلا بخوێنە". یان هەندێك مامۆستای ناشی نەلەڕووی ئوصولەوە. (منداڵێك ئەگەر تەمەڵ بێت ئەبێت هانی بدەیت و ئاگاداری بکەیت بخوێنێت)، بەلام تەمەڵی ناکات هەوڵ دەدات بخوێنێت، ئەمما حاڵی ناوێت کێشەیەك لە زهنیدایە، لەبەرنامەی بەردەستیدایە. لەمامۆستاکەیدا، ئەمان هەر زۆری بۆ دەهێنن ئەوەنەی تر نارەحەت دەبێت و سەیردەکەیت دوای ماوەیەکی تر فیراردەکات و ئەصڵەن واز لەخوێندن دەهێنێت، لەوەودوا دەڕوات بۆ ئیشکردن و کرێکاری، تەنها لەبەرئەوەی لەدەست خوێندن خۆی نەجات بدات.

ئینقلابی ئێران، وەك ئەم بەرنامە سەتحیانە بوو، وەك ئەوەی زۆر بهێنی بۆ منداڵێك کەدەبێت هەر خوێندەوار و زیرەك بێت، بە پەلە بوو-میللەتی بەپەلە خستە ڕێ، لەکاتێکدا دەبوو ساڵەهای ساڵ درێژەی بکێشایە، بەهەر حاڵ نیگەران بووین ئەم ئینقلابە سەتحییە ببێتە هۆکاری ئینقلابەکەی ئێمەش، ئەمەش لەبەرئەوەی کاتێك سەتحییانەیە-ئینقلاب- ناتوانێت خۆی لەدەستی پیلانی ئیستیعمارەوە بپارێزێت.

ئەم دوا بڕیاگەلە(بەریتانیاو سۆڤییەتو ئەمریکا )چۆن ئینقلابی جەنگەڵیان شکستدا، چۆن ئینقلابی نەوتیان شکستدا، چۆن بزوتنەوەکانی دیکەی ئینقلابی لەئێراندا بەردەوام بووە. وەك(مشروتە)، چۆن بزوتنەوەی گەورە لەدونیادا بووە، کە بوویانە گەشتۆتە سەرکەوتنی گەورەو ڕوخاندویانە، ئینقلابی ئێرانیش دووچاری دەردی سەری و موشکیلە دەبێت، هەر لەئەوەڵەوە ئەم نیگەرانییەمان هەبوو، وەك

ئەوە وایە(كانی ئاو)ێك، یان كارێزێكت هەبێت(١٠-١٥) ساڵ بكەویتە شوێنی و چەندین كیلۆمەتر لەئەم لاو ئەولاوە بڕۆیت كە بتوانێت ئاوێك هەمیشەیی و بەردەوام كەئیتر نەبڕێتەوە دەستەبەری بكات، بەڵاّم لافاوێك لە پڕدا بێت كارێزو و هەرچی شتە تۆ تازە دەستت پێكردووە گشتی داماڵێت و لەناوی بەرێت، كاری ئێمە كاری ئەو كارێزە بوو، دوای ساڵەها ببێتە كارێزێك و نە بڕێتەوە، بەڵاّم ئینقلابی ئێران لافاو بوو. لافاوێك هات كردییە هەرا و كەسافەت و جەنجاڵ و زەحمەتی ئێمەشی بەربادداو لەناوی برد.

هەر لەئەوەڵی ئەوەڵەوە نیگەران بووین شتێك بەو جۆرە پێش بێت، جا میللەتی كورد بەڕاستی، ئەگەر ئەم ئینقلابی ئێرانە سەری هەڵنەدایە و دوای(١٠-١٥) ساڵی دیكە ڕوی بدایە دەبوویە ڕەهبەری ئەم ئینقلابەی ئێران، دەبوویە پێشڕەوی ئینقلاب، چونكە سەیرت دەكرد ئەو بزوتنەوە ئینقلابیە بەرلەوەی ئینقلابی ئێران دروست ببێت لە كوردەواریدا بوو-لەهیچ شوێنێكی ئێراندا نەبوو- ئابەو جۆرەی (مەدرەسەی قورئان) دروست بوو وردە وردە خوێنەوار و نەخوێنەوار و ژن و پیاو كور و كچ پەروەردە دەكران و حاڵی دەكران لە حەقیقەتی ئیسلام و مەسیری ئینقلابی ئیسلامییان پێ نیشان دەدرییا كەهیچ جۆرە زوڵمێك، هیچ جۆرە ناڕەحەتییەك لە ئاییندەدا قبوڵ نەكەن، ئەو جۆرە ئیسلامەی ئێمە پێمانیان حاڵی دەكرد، كە هەتا لە بەرامبەر كەسێكەوە بوێتی ئەمە واتای(شیركە)، هەتا ئەمە یەك نەفەر عەبایەكی بوێت، مێزەرەیەكی بوێت و بەوە خۆی جیا بكاتەوە لەخەڵك ئەمە گوناه و مەعصییەتە، ئەمە(فەخر) فرۆشییە، هەتا ئەمە یەك نەفەر لەقەبی هەبێت و پێی بڵێن(مەلا-سەید_حاجی_شێخ)و ئەم لەقەبە ماقوڵتری دەكات لەخەڵك و شانازی پێوە دەكات، ئەمە گوناهە، ئەمانە گشتی باتڵە و ئیسلام دەبێت هەموو ئەمانە لەناو بەرێت. تەواوی مرۆڤەكان دەبێت یەك پلەیان هەبێت

لەڕووی مادی و مەعنەوییەوە، بان و خوار نەمێنێت، ماقوڵو ناماقوڵ نەمێنێت، لەقەب و ئیمتیاز و عەلامەت و مەدالیا نەمێنێت. ئـا بەوجۆرە بەموحكەمی خەریك بووین میللەتی كوردمان حاڵی دەكرد، بەڕاستی ئەم میللەتە دەیتوانی ببێتە ڕەهبەری ئینقلاب بۆ تەواوی ئێران، ئەگەر بەوجۆرە بچوایەتە پێشەوە، بەلاّم هێشتا ئیسلام ڕوون نەكراوەتەوە، هێشتا سەرەتای كارە. لەكتوپڕا ئەم ئینقلابەی ئێران دەركەوت. چەندێك نیگەران بووین!! خوایا ئەم ئینقلابە، بەڵێ....

بە هەرحاڵ، حەقی میللەتە و میللەت تووڕەبێت و خۆی ڕزگار بكات، بەلاّم لەبەرئەوەی بێ بنەڕەتەو هەوڵێكی عەجولانەیە ئاخری شتێكی ڕێك و پێك نابێت و دەبێتە هۆكاری لەبەین بردنی ئینقلابەكەی ئێمەش.

ئەگەر ئێستا باسی ئەوە بكەم چی پەیوەندییەك لەنێوان ئینقلابی ئێمەو ئینقلابی ئێرانا هەبووە و چۆن ئەم ئینقلابەی ئێران بوویە باعیسی ئەم ئینقلابەی ئێمە. ئەمە دوورو درێژو لەبارەیەوە نادوێم.

بەلاّم بەكورتی ئەوەی هۆكاری نیگەرانی بوو چی بوو؟ ئەمە بوو، دەمزانی كاتێك ئەم ئینقلابە دروست دەبێت یالاّ وەك ڕابردوو خۆپیشاندان و پێكدادان و دەزگای جاسوسی دەكەونە كار دژی ئینقلاب كە لەناوی بەرن، چونكە ئەم هێزە ئیستیعمارییەی باسمانكرد، هەرچەند دژایەتیان هەیە بەیەكەوە، بەلاّم هاوڕان لەوەی نە هێڵن هێزێكی دیكە پەیدابێت و كەسێكی دیكە پەیدا ببێت و قسە بكات، لەبەرئەوە هەر دووكیان دەستدەخەنە دەستییەكەوە بۆسەركوتكردنی ئینقلاب، هەروەك چۆن (ئەمریكاو شورەوی چین-كە تازە دەستیپێكردووە بۆ دونیا تالاّنكردن-)هەرسێكیان دژی ئینقلاب قسەیان دەكردو و پاڵیان دەدایە پاڵ(شا)وە و پارێزگاریان لێ دەكرد، ئەمە دەلیل بوو دوای ئەوە ئینقلاب سەركەوێت، ئەمانە گشتی یەك دەنگن بۆئەوەی ئینقلاب لەناو بەرن و(شاه) بهێننەوە، یان(شاه) نەبێت



نۆكەرێكی تر بۆ ئەوان فەرق ناكات، چونكە ئەوان ئەوەندە وەفادارنین بۆ نۆكەری خۆیان گرنگ ئەوەیە نۆكەرێك دانێن ئەمین بێتو خەیانەت لەمیللەت بكات و خزمەت بكات بەئەوان. هەموو ئەمانە لەزهنمدا ڕۆشنبوو، ئینقلابێك ئاواسەتحییانە بڕواتە پێشەوە دەرەقەتی ئەم گشتە دەسیسەو پیلانانە نایەت بەتایبەتی لە(كوردەواریدا).

لەجێگەكانی دیكە شەرایەتییەكە جیاوازە ناوچە سەر سنورییەكان جیاوازە لەناوچە سەنتەرییەكان ئەو حەساسترە، لەناوچەی سەنتەریدا خەتەریات كەمترە وەك لەناوچە سەر سنورییەكاندا. ئەم گشتە هێزە دەتوانن ئاسان دەستێوەردان ئەنجام بدەن. جگە لەوەش میللەتی كوردیش ئەوەندەی مەحرومییەتی دیوە ئەم حەرەكەتەی ئێمە لەم چەند ساڵەدا نە یتوانیوە ئازا-خێرا-ئاگاداری بكاتەوە، زەمانی مابوو تا بەتەواوەتی زیندوو ببێتەوە. ئیتر بەهیچ شێوەیەك نامەردی قبوڵ نەكات و هیچ درۆ قبوڵ نەكات و لەبەرامبەر زۆرو زوڵمەوە سەر نەخەوێنێت. بەڕاستی مابووی میللەتی كورد بگاتە ئەو حاڵەتە، نیگەران بووین، ئەگەر بێتو باقی ناوچەكانی ئێران زۆر توشی كێشە نەبن لە دوای ئینقلاب، بەلاَم ناوچە سەرسنورەكان كەڕێگەی هاتووچۆی ئەمریكاو شورەوی و نۆكەرەكانیانە، و بەتایبەتی كوردەواری لەلایەكەوە(عێراق و لەلایەكەوە (توركیا)، حیزبی (بەعسی) عێراقیش دەناسین، و دەزانین چی دوژمنێكە بۆ میللەتی كورد!! چۆن بەناوی دڵسۆزی قوردەكات بەسەر میللەتی كوردا و دەزانین چی بەلاَیەكی بەسەرماندا هێناوە، بیری ئەوەمدەكردەوە، بەیانی میللەتی كوردی بێ چارە كەهێشتا دۆست و دوژمنی باش نە ناسیوە، هێشتا وریا نە بۆتەوە، ئەگەر ئینقلابێك ڕوویدات ئەم گشتە دەزگا جاسوسیگەلە(سەگەكانی خۆیان) بەریدەنە وڵاتی كوردەواری، میللەتی كوردی بێ چارە لەژێر چەپۆكی ئەمانەدا چی بكات؟ ئەگەر لەلایەكەوە دڵخۆشبین ئینقلاب

لەبەرئەوە لە بنەڕەت دور کەوتوینەتەوە دەستمان بەلقە کانەوە گرتووە، لەئێستادا ئێمە ئایینزایین نەك ئایینی، دەبێت هەوڵبدەین ببینە ئایینی، نەك ئایینزایی، و ڕێگەکەشی تەنها ئەوەیە چەند کۆبونەوەیەك لە تاران بەناوی(شورا)وە هەبێت، کە لەناو ئەو کۆبونەوەیەدا دانە بە دانەی کێشەو بابەتەکان لەوانە لەدەستوری ولاتدا جێگای بایەخ پێدانن و ئەوانەش بابەتە لاوەکییەکانی نێو کۆمەڵگا دەگرێتەوە لە بارەیانەوە باس و لێکۆڵینەوە بکرێت، پاشان ئەو ڕێگایەی لەگەڵ پێوەرە بنەڕەتییەکاندا دەگونجێت و هەڵبژێرێت و کۆمەڵگاشی لێ ئاگادار بکرێتەوە، بەپێچەوانەی ئەمیشەوە شتێکی ڕوونە، کەهەرگیز ناتوانین لەم لێکترازانە بەرەو یەکبون هەنگاو بنێین"[1].

کاك ئەحمەد، زۆر مەبەستی بوو ئەو کەلێن و درزانە پڕبکاتەوە و چارەیان بکات، کەزەمەنێکە دوچاری ئایینی ئیسلام بۆتەوە، وەك وتمان ئەو هەمیشە هەوڵی داوە ئەم بابەتە ئاڵۆزە سادە بکاتەوە و لەدەستی ئەو نەزان و تێکدەرانە دەری بهێنێت و بیداتەوە دەستی زاناکانی هەردوو مەزهەبوو هەوڵبدرێت لەڕێگەی زاناکانەوە چارەبکرێت، جگە لەوەش ئەو پەیامە بداتە گوێی خەڵکیدا، کەبابەتی مەزهەبی(شیعەو سوننە) بابەتێك نییە هەرنەزانێ هەستێ و قسەی تێدابکات، بۆیە دەبینیت لەووتاری(کۆلێژەکەی تاران) ئەوە ڕوندەکاتەوە، ئەم دوو لقە گەورەی ئایینزا(شیعە و سوننە) چەند جیاوازی یەك لە نێوانیاندا هەیە، ئەم جیاوازیانە سروشتین و خاوەن ڕایان بونەتە هۆی دروست بوونی، بەڵام بەداخەوە چەند جۆرێکی تر لە جیاوازی هەیە، کە لەلایەن خودی مرۆڤەوە بەسەر ئایینزادەکانو پەیرە و کارانی ئایینزادەکاندا سەپێنراوە.

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشو. ل٢٩٨

كاك ئەحمەد، پێیوایە كاتێك چەند تایبەتمەندییەك لەسەردەمی(سەفەویەكان) بەدواوە،و تەنانەت چەند سەدەیەك پێش لەوانیش خراوەتە سەر ئایینزای(شیعە) دەخەینە لاوە و كاری پێناكەین، بەهەمان شێوە چەند تایبەت مەندیەك لەئایینزای(سوننی) دەخەینە لاوە ئەوكات دەبینین ئەم دوو ئایینزایە لەبنەڕەتدا بەیەك دەگەنەوە"[1].

موفتی زادە، دوای ئەوەی نەخۆشییەكانی كۆمەڵگای دیاریكرد و ئەو هەموو كۆشش و قسە جدییەی بۆ چارەسەركردن و لاواز كردنیانكرد، بەلاّم وردە وردە ئەگەرەكان بۆ سەرهەڵدانی(ستەمی مەزهەبی) بەهێز دەبێت، لەگەڵ ئەوەی هەمیشە خودی ڕەهبەری مەزهەبی شیعەو رابەری شۆرشی ئێران(ئیمام خومەینی) بەڵێنی پێدەدات و لە هەموو جێگەو لەوەلاّمی هەموو نامەكاندا ئەوەی بۆ دووپات دەكاتەوە، شتێك ڕونادات بەناوی سستەمی مەزهەبییەوە. تەنانەت(ئیمام) خۆی نەعلەتی كردووە لەو كەسانەی جیاوازی دروستدەكەن لەنێوان مەزهەبەكاندا، ئەوەتا(كاك ئەحمەد) لەچاوپێكەوتنی لەگەڵ ڕۆژنامەی(كیهان) ئاماژە بەوە دەكاتو دەڵێت"خەڵكمان هۆشیار كردۆتەوە لەحوكمەتی ئیسلامیدا جیاوازی چینایەتی هیچ مانایەكی نییە، ئێستاش كاری ئێمە هەر ئەوەیە بۆچونەكانی مەكتەبی ئیسلامی بەتەواوەتی پیادە بكەین، بەلاّم بەداخەوە ڕێڕەوی كارەكان بەجۆرێكن نەك هەر لەڕوی ئیشەكەوە، بەڵكو لەڕوی شێوەی ئیشكردنیشەوە بەجۆرێكە خەڵك بەرەو نائومێدی دەبات، مەگەر خەڵكی جارەهای جار نەیانبیستووە لە(ییمام) ئەو كەسانێكی بەنەعلەت كردووە كە لەنێوان مەزهەبەكاندا جیاوازی دروستدەكەن، دەیباشە ئێوە چۆن(ئەسڵی ١٢-دوانزە ئیمامەكانی شیعە-) كەبووەتە هۆی جیاوازی

[1]) سەرچاوەی،ل٢٨٨.

دروستکردن لەنێوان(شیعە و سوننە)دا، بۆ خەڵکی باسبکەین؟! کاردانەوەی خەڵکی چۆن دەبێت جگە لەنائومێدی؟! تـائێرە قسەکانمان لەگەڵ کارەکانماندا پێچەوانە دەبنەوە و هاورێك نین، من تائەوەی بتوانم کۆمەڵ ئاراستە دەکەم ئێستا کارەکان تۆزێك ئیسلامی نین، بەڵام هەردەبێت هەوڵ بدرێت تاکەم و کورپیەکان لابرێت"[1].

هەروەها لەیەکێك لەو نامانە(ئیمام )بۆ"ڕۆحانییەکی" ناوچەی(کرماشان) بەناوی (ایت الله عبدالجلیل جلیلی) دەنوسێت"لەبەڕێزتان و هەموو زانایانی(کرماشان) چاوەڕێ دەکەم یەك ریزی بپارێزن و لەم هەستانەوە پیرۆزەدا بەشداری بکەن، ئەگەر خوا نەخواستە لەمەدا شکست بهێنین، میللەتی موسوڵمانمان بۆ هەمیشەیی لەژێر زوڵم و ستەم و ڕەنج و عەزابدا دەبێت...."[2]، هەروەها لەنامەیەکی دیکەدا، کەلەبەرواری(٢٤/١٠/١٣٥٧)لەرۆژنامەی(کیهان)ی(٢٦/١٠/١٣٥٧)بلاۆکراوەتەوە، بەهەمان شێوە نامەیەك ئاراستەی هەموو خەڵکی کوردستان دەکات، و تێیدا داوای پاراستنی یەکریزی دەکات. لە بەشێکدا ئاماژە بەوە دەکات، تەنها ڕێگای نەمانی چینایەتی تەتبیقی ئایینی ئیسلامە،"بەدڵنیاییەوە بزانن چارەسەری هەموو ئەو چینایەتییەی لە حوکمەتی ئیسلامیدا هەیە و وەکو حوکومەتی تاغوتی نییە، کە لەئەودا هەموو ڕێگا لەهەستیدا-واتە، تەنها لەڕێگەی پشت بەستن بە هەستەکانی مرۆڤ و یاسا دانراوەکانەوە کۆمەڵگا ڕێکدەخرێت، بەڵام لە

---

[1]) بەهزادی خۆشحاڵی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو کوردستان، روزهای بحران ٤

[2]) بهرام ولدبیگی: تاریخ سیاسی اجتماعی پاوه و اورامانات در بیست سال اخیر-١٣٦٨-١٣٤٨هـ.ش. چاپ،اول.زستان ١٣٩٦، چاپخانه پەیام. نشر احسان، تهران.لا١٠١

ئیسلامدا لەگەڵ پشتبەستن بە هەستەكانی مرۆڤ، لەهەمانكاتدا پشت بەگەورەترین سەرچاوەی زانیاری دەبەسترێت، كەبریتییە لە(وەحی)-كورت دەبویەوە"[1].

بەڵێنەكانی سەرانی ئینقیلاب تەنها لە(خومەینی)دا كورت نابێتەوە، بەڵكو هەموویان ئەو بەڵێنانەیان داوە، بەلاّم بەداخەوە دواجار چاوپۆشییان لێدەكەن و لەكاتی دانانی(دەستور)دا(لەمادەی ١٣)دا دەنوسن مەزهەبی ڕەسمی دەوڵەت (شیعەی جعفەری)ە، بەبێ هیچ ئاماژەكردنێك بۆ ئایینی ئیسلام كەلەم بابەتەدا ئەساسە، بۆیە(كاك ئەحمەد) بەمە زۆر بێتاقەت دەبێت و بۆچەندین بارە دەستدەكات بەهەوڵ و كۆشش بۆ ئاگادار كردنەوەی ئەوانەی لەدانانی ئەو دەستورەدا بەشداریان كردووە، جگە لەوەی وەك ئاماژەمان بۆ كرد، پێش ڕودانی هەر شتێك ئەو هەمیشە دەست پێشخەری كردووە و ڕێگە چارەكانی ئاراستە كردووە، ئەوەتا لەچاو پێكەوتنێكدا، لەگەڵ ڕۆژنامەی(اطلاعات)دا سەبارەت بە دەستوری بنەڕەتی و (ڕفراندۆم) پرسیاری لێدەكرێت و ئەویش ڕاشكاوانە راو بۆچونی خۆی و ئەهلی سوننە دەخاتە ڕوو:

☒ ڕای ئێوە لەبارەی دەستوری بنەڕەتییەی(ڕفراندۆمەوە) چییە؟ ئەگەر لەحاڵێكدا پەسەند بكرێت.

+سەبارەت بەدەستوری بنەڕەتی وڵات، دەبێ ڕەچاوی(دوو) خاڵ بكەین، یەكەمیان/ ناوەڕۆكی ئەو دەستورە.

دووەمیان/ چۆنییەتی ڕێك خستنی ئەو دەستورە، چی لەڕوی زانستییەوە، چی لەڕوی هونەری و داڕشتنەوە.

---

[1]) هەمان سەرچاوە،ل٩٦.

ڕیفراندۆمیش واتاو ڕۆحێکی گشتی هەیە، ئەو دەرئەنجامەی هەیەتی بەهەمان شێوەیە هەروەك چۆن پێشتر لەبارەی پەسەندکردن، یان ڕەتکردنەوەی(کۆماری ئیسلامی) و دانانی لەجێی(سیستەمی پاشایەتی) ریفراندۆم پەیرەوکرا، ئەوە کارێکی باش بوو ئەنجامدرا لەو کاتەدا خەڵك بەگشتی تەنها کەمێك زانیاری شوناسێکی کەمیان بەسبوو، بۆئەوەی هەڵبژاردن دروست بکەین، بەلاّم لەدانانی دەستوری بنەڕەتی ولاّتدا سەرەڕای گشتگیربونی بابەتەکە مەسەلەی ویستو ئارەزوی خەڵك لەئارادایە، زۆر بابەتی زانستی و هونەری وردە هەیە خەڵك بەگشتی نایزانن و دەستیان پێی ناگات. بۆیە ڕۆڵی(ڕیفراندۆم) لەدانانی دەستوردا تەنها پەسەندکردنی(ناوەڕۆك و ڕۆحی ) ئەو دەستورەیە لەلایەن خەڵکەوە بەگشتی، نەك دانانی ئەو دەستورە و ناوەڕۆکەکەی، لەبارەی داڕشتنی ناوەڕۆکی دەستورەکەوە دەبێت بگەڕێینەوە بۆلای شارەزایان و پسپۆڕانی ئەوبوارە، لێرەدایە ئێمە جەختدەکەینەوە لەسەر ئەوەی زانایانی ئەهلی(سوننە) دەبێ بەشداریان پێ بکرێت لە دانانی دەستوردا، زۆرجار دووبارەمان کردۆتەوە(ئەهلی سوننە) دەستوری بنەڕەتی ولاّت ڕەتدەکاتەوە، ئەگەر زاناکانیان بەشدار نە بووبن لەدانانی ئەو دەستورەدا"[1]، وادەزانم لێرەدا زۆر ڕون دیارە(کاك ئەحمەد) چۆن ویستویەتی شارەزایانە و لەڕێگەی(ڕیفراندۆم) و بەژداریکردنی زانایانی سوننە لەدانانی دەستوردا ڕێگە لەو کارەساتە بگرێت کە ڕویدا!

---

[1]) بەهزادی خۆشحاڵی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو کوردستان، روزهای بحران ٤.

## ستەمی چینایەتی (طبقاتی):

قسەکردنی(کاك ئەحمەدی موفتی زادە) لەبارەی جیاوازی چینایەتی و ئەو تەبەقاتەی لەناو کۆمەڵگادایە بەئەندازەیەکە، ئەگەر کەسێك پێشینەیەکی لەسەر(کاك ئەحمەد) نەبێت ڕاستەوخۆ لە کۆڕو سیمینارە کانییەوە دەستپێبکات بەو ئەنجامەدەگات، ئەم پیاوە تەنها کارێك کەویستویەتی لەکۆمەڵگادا ئەنجامی بدات بریتییە لە نەهێشتنی ئەو بەرز و نزمییەی کۆمەلگەی داپۆشیوەو کۆمەڵێکی کردۆتە کۆیلەی کۆمەڵێکی دیکە، چونکە دەبێت ئەوەمان لەیادبێت (موفتی زادە) پێش ئەم ستەمە(ستەمی چینایەتی)، تـا ئەو شوێنەی توانیویەتی کاری بۆ نەهێشتنی دوو ستەمی کۆمەڵگا خەفەکەر کردووە(ستەمی نەتەوایەتی- ستەمی مەزهەبی)، بەڵام قسەو باسەکانی(کاك ئەحمەد) لەبارەی چینایەتی لەکۆمەڵگادا زیاترە، ئەمەش لەبەرئەوەیە ئەم ستەمە تایبەت نییە بە کۆمەڵگایەکی دیاریکراوەوە، بەڵکو ستەمێکی جیهانییەو لەهەموو کۆمەڵگایەکدا، ئەگەر زانایانە مامەڵەی لەگەڵدا نەکرێت لە ماوەیەکی زۆرکەمدا سەرهەڵدەدات، واتە نەخۆشییەکە پێویستە بەردەوام ئاگاداری بیت و دەرمانی بکەیت. دەکرێت لەکۆمەڵگادا(ستەمی نەتەوایەتی) نەکرێت، لەبەرئەوەی ئەو کۆمەڵگایە لەیەك(نەتەوە) پێکهاتووە، یان (ستەمی مەزهەبی) نەکرێت، لەبەرئەوەی کۆمەڵگایەکی بێ دینە، یان یەك(دین) تێیدا حاکمە، بەڵام(ستەمی چینایەتی) دەکرێت لەهەموو شوێنێکدا بکرێت، تەنها ئەگەر ئەو شوێنە مرۆڤی تێدابێت، هەر لەبەرئەمەیە دەبینیت بە بەردەوامی(کاك ئەحمەد) باسی دەکات و بەهەموو توانای خۆیەوە کار بۆ ئەوە دەکات لەڕیشکەوە دەرمانی ئەم دەردە

سامناکە بکات. لێرەدا بەدڵنیاییەوە دەتوانین ئەوە بڵێین، ئەگەر کەسێك بییەوێت لەبارەی نەهێشتنی چینایەتی و جیاوازییەکانی ناو کۆمەڵگا، چ لەڕوی مادییەوە، چ لەڕوی مەعنەوییەوە قسەبکات، بەبێ گەڕانە وە بۆ (کاك ئەحمەدی موفتی زادە) زۆر شت هەیە ناتوانێت ئاماژەی بۆ بکات و زۆر زانیاری هەیە لەکیسی دەچێت.

کاك ئەحمەد، لەکاتی قسەکردنی لەسەر دروست بوونی چینایەتی لەکۆمەڵگادا ڕاستەوخۆ دێت لەپەنجەرەی باڵە خانەی(قورئان)ەوە بەشارەزایی خۆی تەماشای کۆمەڵگاکانی ڕابردوو دەکات، دواتر دێت ئەوەی بینیویەتی لەڕێگەی وتارو کۆڕو سیمینارە مەستکەرو خامە بەبڕشتەکەیەوە بۆ تەواوی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەگێڕێتەوە...

ئەو زۆر ڕاشکاوانە ئەوە دەڵێت، بەدرێژایی مێژوو ئەو هەموو شۆڕشەی پێغەمبەران (سلاوی خوایان لەسەربێت) لەکۆمەڵگاکانی خۆیاندا بەرپایان کردووە، هەر لەبەر ئەمەبووە ئەو چینایەتیە و ئەشرافییە نەهێڵن، کەباڵی کێشاوە بەسەر چینی فەقیرو هەژاردا."ئەوە وا ئێمە لەقورئاندا دەبینین لەبارەی حەرەکەتی مێژووی بەشەریەتەوە، لەبارەی ئینقلابگەلی دینییەوە سەیر دەکەین، کۆمەڵێك لەمەدا خۆشگوزەران و خەڵکیان چەوساندۆتەوە، ئەم کۆمەڵە ئەشرافیو خۆشگوزەرانانە لە مێژووی ئیسلامدا بەدوژمنی خەڵك و بەناوی دوژمنی پێغەمبەران (سلاوی خوایان لەسەربێت)و موستکبیرین و موترەفین، یان ناوە گشتییەکەیان(ملاء) دەناسرێن،ئەمانە بەدرێژایی مێژوو کارێکیانکردووە لەڕێگەی جۆراو جۆرەوە بەفروفێڵی جیاواز وردە وردە دەسکەوتی ڕەنج و کۆششی خەڵکی

بێتە ژێر دەستیان، خەڵكی بێزاربێت و ناڕەحەت زیندەگی بكات، بەڵام ئەوان خۆشبگوزە رێنن"[1].

كاك ئەحمەد، دەڵێت كۆمەڵێك وشە هەیە، هەرگیز ناتوانێت مانای پڕاو پڕی(مستعضفین)بدات، وەك وشەی(ڕەنجەدەر و پرۆلیتار)، بەڕای ئەو تەنها ئەو چەمكە قورئانییە دەتوانێت ئاماژە بكات بەدەردو و ئازارەكانی(مستعضفین)، ئەمانە زەعیفكراون لە ڕوی مادی و مەعنەوییەوە، لەهەموو لایەنێكەوە زەعیفكراون، لەلایەنی فیكری و ڕۆحییەوە، لەلایەنی دەرك و شعورەوە. ئەو عیبارەتە ڕاستە(مستعضفین)، تەعبیرەكانی دیكە ناتوانن بەتەواوەتی مانای ئەم چەمككەلە بگەیەنن. ئەم شەڕە بەدرێژایی مێژووی بەشەری بوونی هەبووە، پێغەمبەران (سلاوی خوایان لەسەربێت) لەسەردەمێكدا هاتوون بۆ ڕزگار كردنی وەزعی كۆمەڵگا، و ڕاستەوخۆ لەگەڵ جەماعەتی(مترەفین)دا ڕوبەڕوبونەتەوە، چونكە ئەگەر قەراربێت نبوەتی پێغەمبەران(سلاوی خوایان لەسەربێت) سەربگرێت یەقینەن بازاڕی ئەوان-مترەفین-تەخت دەبێت، خەڵك وریا دەبێتەوە، كەخەڵكیش وریا بویەوە ئیتر ئەو نازو و غرورەی ئەوان كار ناكات، ئەم حاڵەتە بەدرێژای مێژوو بەردەوام بووە جەماعەتی(ملاء و مترەفین) بوون و لەدووای ئەوان پێغەمبەران ڕوبەڕویان بونەتەوە و سەركەوتون و ئەوان-ملاء و مترەفین- شكستیان هێناوە، دووبارە هەوڵیانداوەتەوە و سەریان بەرز كردۆتەوە بۆئەوەی بتوانن خۆیان بسەلمێن، بۆئەمەش ئەو بەرنامەیەی پێغەمبەرێك هێناویەتی لەناوی بەرن جۆرەها هەوڵیانداوە، تازەمانێكیش توانیوییانە زۆرترین پەیامییان لەناوبردووە. بەرنامەی ئیلاهیان فەوتاندوە، بەلام وردە وردە هۆشیاری خەڵكی پەیدابووە، ئیتر

[1]) كاسێتی ژمارە(٧)،درباره انقلاب فرهنگی،(٦٦)B

نەیانتوانیوە بەتەواوەتی لەناویبەرن، چونكە لەچوارچێوەی(دەربار)-كۆشكی كڵێسا و خانەدان و ئەشرافییەكان-دا مایەوە و بەو شێوەیە پەیامەكەیان لەدەستی خەڵكی و(پێشەوایانی دینی) دەرهێنایە دەرەوە، وەك(تەورات و ئینجیل )، ئەسڵی(تەورات و ئنجیل)یش بەشێوەیەكی گشتی لەناو نەچووە، چونكە میللەت ئەوەندە هۆشیار بووە كەبڵێت چی لێهات؟ بەڵام چونكە لەدەست(دەربارو ڕۆحانییەكان)دابووە، هاتوون بەئارەزووی خۆیان دەستكاریان كرووە و عیبارەتیان گۆڕیوە"[1].

دەبینین بەو جۆرە(كاك ئەحمەد) دێت سەرهەڵدان و زەرورەتی بوونی دینەكان پەیوەست دەكاتەوە بە بوونی ئەو تەبەقاتییەی لەناو كۆمەڵگادا هەیە."ئینقلابی ئیسلام، وەك باقی ئینقلابەكانی تری دینی دژی ئەشرافییەت بوو، هەوڵدەدا بۆ سڕینەوەی ئەو ئەشرافیەتەی لەكۆمەڵگادا هەبوون، شوكر بۆ خوا ئینقلابی حەزرەتی(ڕەسول الله)(ﷺ) زۆر كار كرا لەوەودواش لەسەردەمی(خولەفای ڕاشدین)دا كەم تا زۆر ڕوداو ڕویدا، بەڵام بەداخەوە غەفڵەتگەری ئەشرافی سەریانهەڵدایەوە وردەوردە هاتنەوە ناوكۆمەڵگا، یەكێك لەسیفاتی ئەشرافی كەئیسلام نەفرینی دەكات ئەوەیە، باڵەخانەكان مجلل(بەشان و شكۆ-ڕازاوە) تربێت لەژیانی وەسەتی كۆمەڵگا، زیاتر بێت لەحەدی وەسەتی ژیانی خەڵكی ناوكۆمەڵگا، خەڵكی بێن باڵەخانەكانیان لەو ئەشرافی ترو و موجلەل تر دروست بكەن كەجۆرێك بێت حەدی وەسەتی ژیانی خەڵكی تێپەڕێنێت. ئەمە لەدیدی فیكرو تەمەدوونی ئیسلامییەوە شتێكە نەنگین و خوێن تاڵە لەناو كۆمەڵگادا"[2].

---

[1]) كاسێتی ژمارو(٦)، حوكمەتی ئیسلامی، (٥٨)، A

[2]) كاسێتی ژمارە(٧)، درباره انقلاب فرهنگی، (٦٦)B

موفتی زادە، دوای ئەوەی دەیسەلمێنێت کۆمەڵگای دینی، واتە کۆمەڵگای بێتەبەقات و بێ ئیمتیازات. دێت قسە لەسەر ئەوە دەکات، هۆکاری چییە زۆربەی زۆری ئەوناوچانەی سوپای ئیسلام فەتحی کردوون بەبێ جەنگ و کوشتار هاتونەتە ژێر رەحمەتی ئیسلامەوە و بەدەسەلاتی ئیسلام رازی بوون؟

ئەو بۆ وەلامی ئەم پرسیارە جارێکی دیکە لەروانگەی نەبوونی چینایەتی و جیاوازی لەناو سوپای ئیسلام و ریزەکانی ئیسلامدا بەلگەدێنێتەوە لەو گۆشەیەوە وەلامی ئەم پرسیارە دەداتەوە.

"لەناو سوپای موسولمانندا هیچ جۆرە جیاوازییەکی تەبەقات و ئیمتیازاتێك نەبووە، ئەوەی سەرکردەی سوپایەك بۆ تێربوون خواردوێتی سەربازێکی سادەی ناو سوپاش هەرئەوەی خواردووە، کاتێك خەلکی لەناوچەیەك ویستویانە روبەروو ببنەوە، بەلام دواتر ئەوەیان بینیوە و لەملاشەوە جیاوازی ئیمتیازاتی ناو سوپاکەی خۆیان دەبینی لەهەموو رویەکەوە، ئیتر شەریان نەکردوەو مسولمان بوون. بۆنمونە ئەوسوپایەی ئامادەکراوە بۆ فەتحی ناوچەکانی(فارس) لەژێر دەسەلاتی تاغوتی، کاتێك خەلکی چینی خوارەوە بینییان لەناو سوپای ئیسلامدا تەبەقات و ئیمتیازات و جیاوازی لەناو سەربازەکاندانییە و لەهەمان کاتدا سەربازانی سوپا لەدەستەی هەلبژێراون،-ئەمەش بۆئەوەی(دین) بەسەلامەت بگەیەننە هەموو لایەك، هەروەها تەماشایانکرد ئەوکەسانەی لەسوپادان و بەشداری فەتحکردنی ناوچەکان دەکەن هەمیشە جیاوازی و ئیمتیازاتێکیان هەیە بەنیسبەت ئەوانەی نایەنە ناوسوپا، لەولاشەوە کەسەیری سوپای خۆیانکرد هەمووی چینی هەژارە بەکوشتیان دەدەن بۆ ئەوەی چینی دەسەلاتدارن بەسەلامەت بێنەوەو نەروخێن، خوێنی هەزاران جەنگاوەر دەرژێنن بۆئەوەی یەك قەترە لەخوێنی ئەوان




نەڕژێت، کەوایان خستبویە مێشکی خەڵکی فەقیرو هەژارەوە ئەو خوێنە موقەدەس-پیرۆز-ەو نابێت لەناو بچێت و بفەوتێت. ئائەمانە کاتێك لەشکری ئیسلام دەبینن دێت هەر لەدورەوە بەبێ ئەوەی تەبلیغ-بانگرێن بۆناو ئایینی ئیسلام-بکرێن، بەبێ ئەوەی دەنگی حەق بەشێوەیەکی سەریح و ئاشکرا بلاو بێتەوە، بەبێ ئەوەی سیستەمی ناوکۆمەڵگابیینن-کۆمەڵگای ئیسلامی-، تەنها سوپای ئیسلام دەبینن، هەر بەچاوکەوتنیان بەسوپای ئیسلام دووچاری ڕامان دەبن، بیردەکەنەوە و دەڵێن سەیرکەن سوپای ئیسلامی چۆنە؟! نە چادرەکانیان جیاوازە، نە جلەکانیان، نە ئەو خۆراکەی لەمبەر بۆئەو بەر دەیگێڕن-مەبەست لە سەرکردەی سوپاوە بۆ سەربازە ئاساییەکان-، هەر لەدورەوە ئەوە دەبینن و سەیری حاڵو وەزعی لای خۆشیاندەکەن جگە لەوەی دەیانزانی جیاوازی زوڵم چەند زۆرە لەناو سوپای خۆیاندا، لەکاتێکدا سوپا لەحاڵی ئاوادا چەند پێویستی بەسەرباز هەیە بیانپارێزێت کەچی سوپا بەو حاڵەشەوە هەرگوێیان پێنادات، لەبەرئەوەیە دەبینیت سەرچاوەیەك نییە پیشانی بدات بەموتلەقی ئەسڵەن میللەتی ئێران ڕوبەڕوو بوونەوەیەکی هەبوبێت، تەنانەت لەو سەرچاوانەشدا نییە کە(١٢٠٠)ساڵ پێش ئێستە نوسراون"[1].

قوڵ ڕۆشتنی(موفتی زادە) لەدیاریکردن و دەرمانکردنی دەردە کۆمەڵایەتییەکانی ناوکۆمەڵگا، توانیویەتی سیفەتی فەیلەسوفی کۆمەڵایەتی پێ ببەخشرێت، هەرکات بییەوێت ڕەخنە لەڕەوتی ئەشرافی کۆمەڵگا بگرێت و لەبارەی ئەو تەبەقاتەوە قسەبکات، شتێك لەبەردەمی خۆیدا نابینیتەوە ببێتەمایەی ڕێگری، ئەم قسەیەش لەدواتردا باشتر ڕون دەبێتەوە. بەڵام تائێستا وەك خۆی

[1]) کاسێتی ژمارە(٢).درمورد چگونەگی حملە اعراب بە ایران.(١٩).A

دەڵێت"بگەڕێنەوە بۆ مێژوو"، بۆ ئەوكاتەی پێغەمبەر (ﷺ)دەستیدایە ئەوەی مزگەوت دروستبكات، چونكە لەڕوانگەی(موفتی زادە)وە مزگەوت ئەرزشێكی زۆری هەیەو هەرگیز قبوڵناكات مزگەوتەكان ببنە ئەشرافی،"كەبەداخەوە ئەشرافی بوونی مزگەوتەكان سنوری بۆ نەماوە، لەسەرەتای ئیسلامدا حەزرەتی (رەسول الله) (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵە قارەمانەكانی مزگەوتێكی دروستكرد، تەماشا دەكەین ئەو مزگەوتەی پێغەمبەر(ﷺ) دروستیكرد هەروەك ماڵی كرێكارێكی غونەیی، وەك ئەو ماڵەیە كرێكارەكان هەیانە، یا هیچ جیاوازییەكی نییە، لەوەو دوا ژیان گوزەرا وردەوردە سەیری مزگەوت دەكەین، چی بۆتە شتێكی تر، ئەوەڵین خیانەتێك بەنسبەت كۆمەڵگای ئیسلامییەوە ئەوانە كردییان وا فەرهەنگی ئیسلامیان گۆڕی، -هەوڵی تەواوییاندا-كارێك بكەن هەتا(-مركز-سەنتەرە ئیسلامییەكان) ئالودەبكەنەوە بەڕەنگی ئەشرافی"[1].

ئالێرەدا، پێش ئەوەی بێین قسە لەسەر گۆڕانكاریەكان بكەین لەڕوخساری مزگەوتەكاندا، گرنگە بەكورتی ئەوە بخەینە ڕو، كە(موفتی زادە) چی بابەتێك بەخەسڵەتی مزگەوت تەماشا دەكات؟ ئەو هەموو بینانەی ئێمە ناومانناون (مزگەوت)پێویستە خەسڵەتییان چی بێت و گرنگییان چییە؟

كاك ئەحمەد، لەباسێكدا بەناونیشانی(زمانی كوردی) لەسەرەتادا باسی چەند خەسڵەتێكی مزگەوت دەكات و گرنگییەكانی مزگەوت ڕوون دەكاتەوە لەڕێگەی ئەو تایبەتمەندیانەی كە مزگەوت هەیەتی، وەك یەكڕیزی و بە بەندەبون،و نەتوانینی بڕیاردانی تاك ڕەوانە، چونكە ئەوەی لەمزگەوتدا كۆدەبێتەوە هەر دەسەڵاتێكی هەبێت دواجار لەگەڵ ئەوانی دیكەدا یەكسانە و جیاواز نییە. سێیەم خەسڵەتی

---

[1]) كاسێتی ژمارە(٧)،درباره انقلاب فرهنگی،(٦٦B)

مزگەوت لەگەڵ ڕەنگی ئەشرافیدا سازگار نییە بەمەرجێك ئەو ڕوكنە یەكەمییە دامەزرابێت، ئەویش ئەوەیە گشتی-هەموو نوێژ خوێنەكان-بە ناونیشانی بەندەی خوا بێنە مزگەوت و بەشداریبكەن، ئەمە پەیدابوو ئیتر مزگەوت ڕەنگی ئەشرافی و تەبەقاتی ناگرێت و هەموو بەناونیشانی بەندەی خوا ئامادە دەبن، ئەگەر ئائەم تایبەتمەندیە یەكەمییە دروست بوو سەیردەكەیت بەشێوەیەكی سروشتی مزگەوت ڕێگەی ئەوە نادات كابرا غروری ئەشرافییەت و عەزەمەتی تێدا دروست ببێت و بیفرۆشێت بەسەر خەڵكدا. ئا ئەم سروشتە كەمزگەوت هەیەتی دەبێتە هۆی دروستكردنی مرۆڤی مەردو و پیاو، مرۆڤێك لەگەڵ خەڵكدایەو بۆ خەڵكە، مرۆڤێك ژیانی جیاواز نەبێت لەوەی خەڵك هەیەتی"[1]. دەی كاتێك سەیری ئەم خەسڵەتە دەكەین چاوێك بەمێژووی دوای جێنشینی پێغەمبەر(ﷺ)دەخشێنینەوە بەجۆرێك لەجۆرەكان مزگەوت لەو بنەماو و سادەیەیی خۆی لایداوە، تەنانەت كۆبوونەوەكان نەك هەر لەمزگەووتدا ئەنجام نادرێت، بەڵكو لەكۆشكی(خەلیفە)و (پاشاكان)دایە و جیاوازی ژیانی نێوان دەستەڵات و خەلیفەو پاشا زەوی بۆ ئاسمانی نێوانە. خەلیفەی وادەبینیت كۆشكەكەی لەناوەڕاستی شاردایە كەچی بەشوراو پاسەوان دەورە دراوەو ئاگادار نییە لەدەرەوەی كۆشك دەنگوباس چییە، لەكاتێكدا فەتحی ناوچەكان و دەسەلاتی سوپای ئیسلام لەسەردەمی خەلیفەیەكی وەك (عومەری كوری خەتاب)(ﷺ) دەگاتە ئەوەی كۆشكی شاهانەی(فارس) تەفرو تونابكات، ئەم خەلیفە جوامێرە لەگەڵ ئەو هەموو فەتحەی لەسەردەمی ئەودا ڕوویدا كەچی ژیانی بریتییە لەژیانێكی سادە، بەڵكو كەمتر لەسادەترین ئەوسادەیەی كەسێكی ئاسایی ناو خەلافەتی خۆی ژیان دەگوزەرێنێت، نمونەیەكی گرنگ هەیە

---

[1]) كاسێتی ژمارە(٢)زبانی كوردی(١٧)A





لەسەردەمی خەلیفە(عومەر)دا، کە(موفتی زادە) زۆرجار باسیدەکات و بەو نمونانە ئەوە دەسەلمێنێت چەنێك حەقیقەتی دین شاراوەتەوەو لەرێگە ئەصلیەکەی خۆی لایداوەو کۆمەڵێك ئەشرافی هاتوون دەیانەوێت بەناوی دینەوە خەڵکی فریو بدەن و لەگەشەکردنیان بخەن.

"حەزرەتی عومەر(ﷺ)، ئەو مرۆڤە بەعەزەمەتە، دوای ئەوەی بوو بەخەلیفە، نەیتوانی کرێکاری بکات و کاربکات. ناچاربوو زۆرترین کات سەرقاڵی بەرێوەبردنی ئەو کۆمەڵگا گەورەیە بێت، ئەو کۆمەڵگایەی وا خەریك بوو لەگەڵ(ئێران و رۆما) شەربکات، ئەو کۆمەڵگایەی توانی نیوەی(ئاسیا و ئەفریقا) فەتح بکات. بیر بکەینە تاکە کەسێك خەریکی بەرێوەبردنی ئەو کۆمەڵگایە بێت- هەڵبەتە خۆ نیزام و بەرنامە بە شورا بوو، بەلاّم(ئیدارەی ئیجرا) بە ئەو بوو-، هێشتا حەق بلێین، لەگەڵ ئەوەی ئەو ماوەیە هەر دەچوو کاربکات، دەچوو باخەکانی(بیت المال)ی ئاو دەدا و حەیوانەکانی(بیت المال)ی چارەدەکرد، چونکە لە(بەیتەرییە)و ئاودان و خەلیفەی شارەزا بوو. ئا ئەوەیە مرۆڤی گەورە بەو شێوەیە پەروەردە دەکرێت! ئەم مرۆڤە گەورەیە کەبوو بەخەلیفە ئیتر نە یدەتوانی بڕوات کاربکات و نان و بژێوی ماڵ و منداڵی بەدەست بهێنێت. لەبەرئەوە(شورا) موچەی بۆبرییەوە، ئەو چەند ساڵە هەر ئەو بڕە پارەی هەبوو. لەپێش هەموو کەسەوە (علی و عائشە) بیریانکردەوە ژیانی ژن و منداڵی زۆر خراپە. لە کاتێکدا جامیعەی ئیسلامی وەزعی زۆر خۆشە و ئەو بڕە پارەیەی وەریدەگرێت بۆ مەسروفی ماڵ و منداڵی زۆر کەمە، لەبەرئەوە زۆرێك لە هاوەلاّن پێشنیاریان کرد،"کە(عومەر) ئەمە کەمە و بەش ناکات، ئیجازە بدە بیکەینە دوو بەرامبەر". ڕازی نەبوو،

كۆمەڵێك لە بەرپرسە گەورەكانی(شورا) چوون بۆلای(حفصە)، كەكچی حەزرەتی عومەر و خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.
وتیان: "ئێمە چەندین جار قسەمانكردووە، خۆت دەزانی ماڵی باوكتو براو خوشكەكانت چەند ژیانیان ناخۆش دەگوزەرێت، وتمان بە(عومەر) ئیجازە بدە مووچەی خۆت و مندالەكانت زیادبكەین رازی نەبوو، ئێستا هاتووین بەتۆ بڵێین، چونكە تۆ لە لایەكەوە(باوك و فەرزەن)ی لە نێوان تاندا هەیە و لەلایەكیتریشەوە خێزانی پێغەمبەر(ﷺ)بوویت و ئەرزش-رێز-ی دایكایەتیت هەیە بۆی، لەبەرئەوە لەلایەن خۆمانەوە ئەم پەیامەی بۆ دەنێرین، بەلام لەلای ئەو نەڵێیت، كەئێمە وتوومانە پێت، هەر بەناوی قسەی دڵی خۆت پێی بڵێ "باوكە ماڵی خۆمان ژیانیان زۆر تاڵە، برا و خوشكەكانم ژیانیان زۆر نارەحەتە، با كەمێك ئەم مووچەیەت بۆ زیاد بكەن ".
(حفصە) رازی بوو، رۆیشت قسەی كرد لەگەڵیدا....دەستیكرد بەقسەكردن و باسی ژیانی موسڵمانانی بەگشتیكرد، كەچەند ژیانیان باشە و هیچ كەسێك نییە ژیانی ناخۆش بێت، تەنها ئەو ماڵە هەیە كەژیانی لە چاو ژیانی زۆربەی خەڵكیدا لەخوارەوەیە....
حەزرەتی عومەر، خۆی پێرانەگیرا و وتی"گوێبگرە رۆڵە با هەندێ پرسیارت لێ بكەم. تۆ ژەمێك لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)ژیاویت، ژیانی پێغەمبەر چۆن بوو؟ باسی بكە.
ماوەیەك باسیكرد و وتی: زۆربەی جارەكان لەسەر زەوی بەبێ راخەر خەوتووین، ژوورەكەمان هیچی تێدانەبووە، زۆربەی كات بەیانی تاوەكو ئێوارە نانێك نەبووە بیخۆین.


وتی: دەی ڕۆڵە پێغەمبەر نەبووە لە بەردەستیدا- ئەوەی پێویستایە دەستی نەدەكەوت-؟

وتی: سوێند بەخودا(بیت المال) كاتی وا هەبووە لەو پەڕی دەوڵەمەندی و سەروەت و دەسەلات بووە، زۆرترین سەروەت لە ئیختیاریدا بووە، بەلام بەو شێوەیە ژیاوین.

وتی: ڕۆڵە خۆ پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتیكرد، بە بۆچوونی تۆ باشیكرد یان خراپیكرد؟ بەڕای تۆ، ڕێگەی دروست بووە و گەیشتوەتە مەبەست؟ حەزرەتی (حفصە)، دەستیكرد بەگریان و وتی: هەڵبەتە تەنها ئەوە باشدەگاتە مەنزل. ئەوە باش ڕێگە دەزانێت چۆن بڕوات تا بگاتە ئەو شوێنەی وا داواكراوە.

وتی: دەی ڕۆڵە گیان دوای پێغەمبەر كێ بوویە جێنشینی؟ كێ بەردەوامی بەڕێگەی ئەودا؟

وتی : ئەبوبەكر

وتی: ئەی ڕێگەی(ئەبو بەكر) چۆن بوو؟ ئەو چۆن ژیانی دەگوزەراند؟

كەمێك باسی ژیانی ئەویشی كرد، كەبەچی برسییەتیەكەوە ژیانی گوزەراندوە، لەكاتێكدا ئەو هەموو سەروەت و سامانە لەبەردەستیدا بووە.

جا بەكورتی باسی بكەم. دوای ئەوەی باسی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەكری گێڕایەوە.

وتی: دەی ڕۆڵە، ئەبوبەكر بەڕێگەی ڕاستدا ڕۆیشت؟ گەیشتە ئەو مەنزلەی وا پێغەمبەر بۆی ڕۆیشت؟

وتی: بێ گومان باوكە، ئیمانم هەیە ڕاست دەگاتە ئەو مەنزلە.

وتی: دەی ڕۆڵە گیان، ئەگەر باوكی خۆتت خۆشدەوێت، پێم بڵێ باوكە ئەمان بكە بالەو ڕێگەیە لا نەدەیت، ڕۆڵە گیان پێدەچێت یەك زەڕە لەو ڕێگەی(محمد و ئەبو

بەکر) لامدا لەمەنزڵدا هەر نەگەمەوە پێیان. ڕۆڵە گیان، ئەگەر من ویستم لابدەم تۆ ئاوا ئامۆژگاریم بکە، کەدەبێت ڕەهبەر وەك (محمد) ژیان بگوزەرێنێت، ڕەهبەر دەبێت وەك(ئەبوبەکر) بێت. نەك لاشەم پەروەردە بکەم، نەك خۆشگوزەرانی بکەم و لە کۆتاییدا ڕێگەم جیابێتەوە و نەگەم بەئەوان"[1].

کاك ئەحمەدی موفتی زادە، بەو شێوەیە کاری لە ناو نمونەکانی مێژووی ئیسلامدا دەکرد، هەموو هەوڵێکیدا ئەو ڕەگە ئەشرافییەی لەناو خەڵکیدا بلاْوبۆەتەوەو ڕیشی داکوتاوە لەبنا وشکی بکات. بەهێزێکی تەواوەوە کاری بۆ ئەوە دەکرد لە پاڵ ئینقلاب لەدەسەلاْتدا، ئینقلاب لەو فەرهەنگەشدا بکات، کەکۆمەڵگای ئێرانی بەگشتی و کوردستانی بەتایبەتی گیرۆدەکردووە، ئەمەش یەکێکە لەو خالاْنەی (موفتی زادە)ی دڵساردکردبوویەوە لەئینقلابی خەڵکی ئێران.-دیارە لەشوێنی خۆیدا قسە لەسەر ئەم بابەتەشکراوە-.

کاك ئەحمەد، لەو بابەتەی بەناوی(فەرهەنگی ئینقلاب*)ەوە پێشکەشی کردووە، لەدڵەوە لەخۆی دەپرسێت(بۆچی لە ناوکۆمەڵگادا هەندێك کەس ماڵەکەی لە(مەڕمەڕ)و هەندێك ئەصلەن ماڵی نییە تێیدا دانیشێت، و(٦٠ -٧٠)ساڵ تەمەنی کردووە کرێنشینە و دەبێت هەمیشە خەریکی ئەملا و ئەولا بێت و لەم محەل بۆ ئەو محەل لەم ماڵ بۆ ئەو ماڵ بار بکات؟ ئەمە ئەو پەیوەندییە فاسدەی کۆمەڵگایە وایکردووە، ئەم کابرایە مافەکەی دزراوە-ئەو کەسەی خانووی نییە-، مومکینە فلاْنە کەسی ئەشرافی کەئێستا ئەشرافیانە دەژی دزیبێتی، بەلاْم ئەم دزییە ڕاستەوخۆ نییە. مومکینە فلاْنەکەسی ئەشرافی ژیانێکی ئەشرافی

---

[1]) کاسێتی ژمارە(٢)زیانی کوردی(١٧)B

*) تەواوی ئەم بابەتە لە کتێبی(٢)دا بلاْوکراوەتەوە.

دروستکردبێت، بەڵام ڕاستەوخۆ خۆی تاوانێکی نەبێت و لەو صەدمەیەی گەیاندویەتی بەو میللەتە هەژارە،.... بەڵام ڕاستییەکەی ئەمەیە، ئەو پارەییەی لەماڵێکی ئەشرافیدا خەرجیکردووە، ئەوە بەشێکی پارەی ئەو ماڵەیە وا لە گڵ(خۆڵ) دروستکراوە و دەبوایە لەمدا خەرجبکرایە...

کاك ئەحمەد، لەدرێژەی ئەو کۆڕ و بابەتانەی لەبارەی ئەشرافی و ئەشرافی بوونی کۆمەڵگا ئەنجامیداوە، لە قۆناغێکدا بەوە دەگات، وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە. هۆکاری ئەوە چییە، لەگەڵ ئەوەی ئایینی ئیسلام توانی دژایەتییەکی زۆری ئەشرافییەکان بکات و لەناویان بەرێت، بەڵام سەیردەکەیت دوای ماوەیەك دەگوزەرێت، بەتایبەتی دوای دەسەلاتی خەلیفەکانی ڕاشدین، وردە وردە ژیانی ئەشرافی لەکۆمەڵگای ئیسلامیدا سەرهەڵدەدات و کاردەگاتە ئەوەی هەڵەی زۆر گەورە و مێژوویی بەسەر برێك لەدەسەلاتدارانی جیهانی ئیسلامی ئەو کاتەدا تێبپەڕێت؟

موفتی زادە، بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە لەسەر بابەتێك قسەدەکات و لەدەرگایەکەوە دەچێتەو ژوورەوە، کەبەڕاستی ئەوانەی خۆیان بەخاوەنی دنیایەك لەگێڕانەوەی مێژوو دەزانن و لایان وایە هەمیشە بۆ پرسە مێژووییەکان پێویستە ڕاوێژ بەئەوان بکەیت، پەیان بەم باسە نە بردووە، بۆیە لێرەدا گرنگە ئاماژە بەوەبکرێت، هەندێك بابەت لەمێژووی دەسەلاتی ئیسلامیدا هەیە پێویست دەکات قسەیان لەسەر بکرێت و وەڵامی مەنتقییان بدرێتەوە ئەو موقەدەساتەی بە بەریانداکراوە لێیان وەربگیرێتەوە، چونکە وەك دەڵێن"لەئیسلامدا مێژوو پیرۆز نییە، بەڵکو حەقیقەت پیرۆزە". زۆریش گرنگە بۆ چارەسەرکردنی ئەو بابەتانە سەردانی نوسینو کۆڕو وتارەکانی(کاك ئەحمەد موفتی زادە و مامۆستا ناصری سوبحانی و مەلا محمد

رەبیعی و...) زۆری دیكە لەزانایانی كورد بكرێت، كەتائێستاش نەناسراون، كەسێكی وەك(رەبیعی) (رەحمەتی خودای لێبێت) لەبارەی (وەفات و مانەوەی حەزرەتی عیسا)وە لێكدانەوە و تەفسیرێكی هەیە، دەتوانرێت زۆر گەورە سەیر بكرێت، یان( مامۆستا ناصر) لەبارەی (جەنگی جەمەل و بابەتی ناسخ و منسوخ و ئیمامی مهدی....) و چەندین پرسی گرنگەوە، كەبەڕاستی لەكاتی ئێستاشدا وروژاندن و قسە لەسەر كردنیان بە ترسناك دەزانرێت، قسەی هەیە و جێگەی خۆیەتی بەهەند سەیریان بكرێت بۆ ڕوونكردەوەی نارونی ئەو بابەتە سودیان لێوەربگیرێت، بۆیە دەبینیت موفتی زادە، لەبەرئەوەی گەیاندنی حەقیقەتی لەلا گرنگ بوو دێت بەم جۆرە وەلآمی ئەم پرسیارە دەداتەوە و لەڕێگەی و رووژاندنی پرسیاری(بۆچی لە سەردەمی معاویەی كوڕی ئەبو سوفیان-مقەر-شوێنی كۆبوونەوە) لەمزگەوتەوە گوێزرایەوە بۆ ناو كۆشكەكان؟ بابەتەكە زۆر دوور و درێژە، ئەگەر بەكورتی باسی بكەم، دین بەو جۆرەی قورئان بەیانی دەكات هاتووە بۆ شەڕ و ڕووبەڕوو بوونەوە، لەگەڵ(موترەفین)دا، {وَكَذَلِكَ مَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِم مُّقْتَدُونَ }الزخرف٢٣

دەفەرموێت"ئێمە لەهیچ جێگەیەكدا پێغەمبەرێكمان نەناردوە(الا) ڕاستەوخۆ لەگەڵ خۆشگوزەراندا(موترەفین) كەوتوەتە ڕووبەڕوو بوونەوە. خۆشگوزەرانەكان دوای پارەی زۆر و فرت و فێڵیان بەكارهێناوە، هاتوون و وتویانە دینی ئیلاهی(چۆنەو چی) دەڵێت لەگۆڕێدا نییە، باو و باپیران و نەژادی ئێمە (چی دەڵێن)، ئەوە-واتە قسەكانی باوباپیرانمان-جێی قسەیە بۆئێمە و تاباوو نەژادی ئێمە وا ڕەفتاریان كردووە، ئیتر ئێمە حەقمان نییە خودا چی دەڵێت.





نەژادی ئێمە باشتر حاڵی بوون لە ئێمە، ئەو جۆرە ئەوان ڕفتاریان کردووە ئێمەش وا ڕەفتار دەکەین". ئەمە قسەی ئەوانەیە کەوا خۆشدەگوزەرێنن.

ئەوان دەچپێنن بەگوێی هەژار و فەقیردا ئەگینا هەژار و فەقیر هیچ کات گوێ بەژیانی باو و باپیرانی نادات، بەلاّم(موترفین) و خۆشگوزەرانگەل بۆ پارێزگاریکردن لەوەی هەیانە و بۆتە خەصلەت بۆیان، بۆئەوەی ئەو بارودۆخەی بوونی هەیە وەك خۆی بمێنێتەوە و تەکانێك نەخوات، چونکە بەبچوکترین تەکان و حەرەکەت لەکۆمەڵگادا قەسر و قسور و ژیانی خۆشیان دەکەوێتە لەرزە و تەکان دەخوات، لەبەرئەوە بەشێوەیەکی ئاسایی ئەم وەسوەسانە دەخەن گوێی خەڵکەوە،"کورە خەڵکینە ئەژداد و ئاباوی ئێمە نەیانفامی ژیانی چەند پشتە، ئێستا ئێمە بکەوینە شوێن بیر و بۆچوونی کابرای لات، کابرایەك کەکۆمەڵێك لات و لوت لەدەوری کۆبوونەتەوە؟

ئەمە دەربڕینێکە لەدەربڕینەکانی(موترەفین)، کەقورئان دەفەرموێت(وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلاَّ الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ وَمَا نَرَى لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَاذِبِينَ )هود٢٧. تانەو تەشەر دەدەن لەپێغەمبەران، دەڵێن"تۆ چیت؟ کۆمەڵێك لات و لوت لەگەڵتان"، ئەمە لۆژیکی دین و ڕووبەڕوو بوونەوەی دینە، لەگەڵ موترەفین، کەلەم دوو وشەدا کورتی دەکاتەوە بۆمان، چونکە ئیسلام کاملترین دین و بەرنامەیەکی جیهانی بوو، لەبەرئەوە هەر لەسەرەتاوە ڕووبەڕوو بوونەوەی دەستیپێکرد لەگەڵ تەواوی دنیادا، دنیای ئەو ڕۆژەش بریتی بوو لەناوچەیەك لە(ئێران و ڕۆما) باقی ناوچەکانی تر داگیرکراوی ئەوان بوون، یان جێگەیەکی بێ ئەرزش و ناقابیل بوون، کەگوێ بەداگیرکردنیان نەدراوە. هەر لەسەرەتاوە لەبەرئەوەی ڕووبەڕووبوونەوەی هاوشێوەی ئەو سیستەمە ئیلاهییە

لەسنوری نزیکترین هۆزەوە دەستی پێکرد بوو، دواتر وردە وردە گوازرایەوە بۆ قەبیلەو نەتەوەکانی دیکە. خودی پێغەمبەر(ﷺ) جیهانیبوونی ئەم نیزامەی بەم جۆرە بلاّوکردەوە، کە ئەو فەرمانەی نارد بۆ(خوسرەو پەروێزی)ی گۆڕ بەگۆڕ، هەروەها بۆ(ئیمپراتۆری ڕۆم)، پاشان بۆ پاشاکانی دەوروبەر، کە زەمەنێك سەربەخۆبوونو زەمەنێکیش داگیرکراوانە حوکمیانکردووە، بەو جۆرە تەختی گشتیانی لەرزاند.

جا لەناو ئەم پاشایانەدا هیچ کامیان هێندەی (شای ئێران) بیّ شەرەف و بیّ شەرم نەبوو!

هەرکام لەپاشاکان بەجۆرێك بەرپەرچی نامەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دایەوە، بەلاّم دەزانن(خوسرەو پەروێز)ی ڕوو ڕەشی بیّ شەرەف، نەوی لەکاغەزەکەی پێغەمبەر(ﷺ) و دڕاندی و فڕێیدا، کاتێکیش ئەم هەواڵە گەیشتەوە پێغەمبەر(ﷺ) دوعای لێکرد"خوای گەورە تەخت و بەختی پەرت بکات". جا تەماشا دەکەیت لەتەواوی ستەمگەری دنیادا تەنها شای ئێران ئەوەندە بیّشەرەفو پڕ ڕووبووە، لێرەدا سەیرێکی ئەوانەی دەوری پێغەمبەر خۆی و ئەوان بکەن وا باوەڕیان پێهێناوە، دەبینی بازرگانێکی سەروەت مەندی وەك(خەدیجە) کەشویکرد بەپێغەمبەر(ﷺ) ئەوندە پاك وصەفا و صەمیمەتی لەماوەی(١٥-١٦) ساڵ کار لەگەڵ(محمد) دیبوو، لەگەڵ(محمد) (ﷺ) وەحی بۆهات دەچێت بۆلای ئامۆزاکەی، پیش ئەوەی بۆ خودی(محمد) ڕۆشنبیێتەوە چی ڕوویداوە ئەو ئیمانی پێدەهێنێت.

ئەبوبەکر(ﷺ)، بازرگانێکی دەوڵەمەندی ئەشرافی ئیمان دەهێنێت. دەبینێت تەنها(ئەبو سوفیان) و منداڵەکانی درێژە بە شەڕی خۆیاندەدەن تا کاتێك(مەککە) فەتح دەکرێت، کەئیتر تازە توانایەکیان نامێنێت شەڕبکەن، جا لەو کاتەدا هیچ

چارەیەكیان نییە مسوڵمان بوون. گرنگی بەم(دوو) شتە بدەن بۆ لەمەو دوامان گرنگە، ئەوەی وا فیرقەو گرووپ دروستبوو. سەیر دەكەیت شوێنی ئەمدووانەیە، (شاهێنشاهی ئێران) و (خانەوادەی بەنی ئومەییە). خیانەتی ئەم دوو فكرە و سیاسەتە بوو-واتە، هۆكاری سەرهەڵدانی گروپ و فیرقەگەری لە جیهانی ئیسلامیدا ئەم دوو دەستەلاتە لێی بەرپرسیارن-. هەر لەرۆژی سەرتاوە-سەرەتای ئیسلام- تەماشادەكەین دوژمنایەتی بێ شەرمانەی ئەم دووانە، (ئەمەویەكان) دور لە(حەزرەتی عوسمان و عومەری كوڕی عبدالعزیز) و دور لە زۆریك ئینسانگەلیان. لێرەدا تەنها قسە لەسەر ئەشرافیەكانە ئەوانەی وا جاهوجەلال و ئمتیازاتیان دەویست. هیچ كەس ئەوەندەی(ئەمەویەكان) لەنزیكەوە و (شاهینشاهی ئێران) لەدوورەوە خراپ نەبووە لەگەڵ ئیسلامدا. دوای ئەوەی ئیسلام گەشەیكرد و ئەوانەی لەناوبرد ئەم دوابڕاوانە بێدەنگ دانەنیشتن. تەماشا دەكەین تەنها كەسێك لەسەر كورەی زەویدا دیاریكرا(حەزرەتی عومەری كوڕی خەتاب) شەهید بكات یەك نەفەری(ئێرانی) بوو بەناوی(ئەبو لوئلوئی مەجوسی) كە لەقەبی (بابا شوجاع)یان پێدا. زۆر دیارە سەیردەكەیت پەناگەی ئەم(بابا شوجاع)ە بریتییە لەماڵی (معاویە و ئەبو سوفیان)، یانی پەیوەندی ئەم دووانە بەیەكەوە. جائەم باسە زۆر دوور و درێژە بتەوێت ئەم باسە بگێڕیتەوە و حەقی خۆی پێبدەیت، بەڵام ئەوەی لێرەدا ئێمە ئەنجامی لێدەگرین ئەوەیە، كەسێكی وەك(حەزرەتی علی) (ﷺ)، وتی بە(ئەبو سوفیان) كەهاتبوو مسوڵمان ببێت، كاتێك كەشورای (ئیسلامی) تەشكیل بوو بوو،(حەزرەتی ئەبوبەكر) بە(خەلیفە) هەڵبژێردرا بوو، (ئەبو سوفیان) وەك(كلكە نەوتینە)دەهاتە بەردەمی ماڵی(علی) دەستیكرد بەوتنی (شیعر) و وتنی(ئیهانە) بەحەزرەتی(علی)، كەئامۆزای پێغەمبەرە لەگەڵ حەزرەتی

(عبداللە). كە ئەویش ئامۆزای پێغەمبەرە. دەستی كرد بەشیعر و تانە و تەشەر، وتی"فەقیران ئەوە لە(شورا) حەقی ئێوە دەخۆن و كەسێكی دیكە دەبێتە(خەلیفە)، لەكاتێكدا ئێوە(بەنی هاشمن)، ئێوە ئاموزای پێغەمبەرن، بەئێوە ڕەوایە، خوێرییەكان بۆچی نایەنەدەرەوە حەقی خۆتان بسێنن. ئەمە شەرتی بێت(مەككە) پڕدەكەم لەشۆڕە سوار بۆ پارێزگاری لەهەقی ئێوە"، بەلاَم حەزرەتی (علی) زۆر بەدەرك و تێگەیشتو بوو، لەنزیكەوە لەقوتابخانەی پێغەمبەر(ﷺ) پەروەردە بوو بوو.

هاتە دەرەوە وتی: ئەوە چی دەلێیت ئەبوسوفیان؟! خەریكە من هاندەدەیت چی بكەم؟ ئەبو سوفیان قەسەم بەخودا دەزانم لەسەرەتاشەوە ڕاستت نە ئەكرد مسوڵمان بوویت، دەزانم لەترس و ناعیلاجیدا مسوڵمان بوویت، ئەبو سوفیان تۆ لەم ماوەیەدا ئەمە تێنەگەیشتیت دین بۆ هۆز و تایفەیەك نییە بۆ تەواوی بەشەریەتە؟ لەدیندا هۆزێك فەزلی نییە بەسەر هۆزێكدا؟ ئەبوو سوفیان، دەزانم كەڵەكت داوە، دەزانم دەتەوێت هەر لەئەوەڵی ڕۆژەوە، كە پێغەمبەر وەفاتیكردووە. خێرا ئیسلام لەناو بەریت و بگەڕێیتەوە بۆ ئیمتیازاتەكەی خۆت. حەزرەتی (علی) وریابوو كلاَو نەچوویە سەری، خەلافەت لەزەمانی(حەزرەتی ئەبوبەكر و حەزرەتی عومەر)دا بەهێز بوو یەكێك لەنیشانەی هێزی ئەمە بوو، قوتابیەكانی پەروەردەی دەستی پێغەمبەر زۆریان هەر لەژیاندا بوون، بەلاَم وردە وردە كەم بوونەوە، (حەزرەتی ئەبوبەكر) چووە-وەفاتیكرد-، (حەزرەتی عومەر) چووە-شەهیدكرا، زۆرێك لە هاوەلاَن كۆچی دواییانكرد تا گەیشتە زەمانی(حەزرەتی عوسمان). لەسەردەمی (حەزرەتی عوسمان)دا، چونكە هەر لەبەرۆ پیاوە گەورەكان كەم بوونەوە. وردە وردە توانیان كاربكەن-دوژمنان-، ئەمە جگە لەوەی(حەزرەتی عوسمان) ئەركێكی

تەحقیقی زۆر زۆر قورس و گرانی لەسەرشان بوو، كەئەگەر مرۆڤانە داوەری بكەیت ئەو كارەی(حەزرەتی عوسمان)كردی لەو سەردەمەدا بەوەسائیل و ئەو توانایییەی ئەو كاتە لەبەردەستدا بووە لەبەرامبەر ئەو كارانەوەیە، كەئێستا بەم هەموو وەسائیلەوە چەندین بیریار خەریكدەبن ئەنجامی بدەن و ئەنجامی دەدەن نیوەی ئەوشیان پێ ناكرێ. لەماوەی ئەو(دووانزە) ساڵەی خەلافەتدا كارێكیكرد زۆر زۆر گرنگ، هات بەزمانی عەرەبی رەسمی بەخەتێكی جوان(حەوت*) دانە نوسخەی قورئانی نوسییەوە و رێكیخستن، بوویە هۆی ئەوەی تەواوی خەڵكی دنیا بزانن چۆن قورئان بنوسنەوە، نەك ئەوەی هەركەسێك بێت بەجۆرێك بینوسێتەوە. ئەمە بووە هۆی ئەوەی شەیتانە خائینەكانی(بەنی ئومەییە)-نەك مسوڵمانەكانی- هەر لەزەمانی(حەزرەتی عوسمان)دا، ئەوەی(ئەبوسوفیان) لەسەردەمی(ئەبوبەكر)دا كردی و نەكرا لەم سەردەمەدا كردیان. وردە وردە توانی لە ویلایەتی(شام) كۆشكێك درووست بكات، ئەمەش یەكەمین لەتمەی سەرزەمینی ئیسلامە!

ئالێرەوە دەتوانین(موعاویە) بناسین، دەتوانین بزانین(موعاویە) وەك (عومەرو ئەبو بەكر) ناتوانێت رەفتاربكات، چونكە(موعاویە) یەك كۆشكی هەبوو، مسوڵمانان دەچوون لەماڵی(موعاویە) نانیان دەخوارد لەپشت سەری(علی) نوێژیان دەكرد. رۆژێك (موعاویە) بەمسوڵمانێك دەڵێت"دێیت لەماڵی من ناندەخۆیت و لەپشت سەری(علی)یەوە نوێژ دەكەیت؟

ئەویش لەوەڵامدا دەڵێت:"ئاخر نانەكەی تۆ چەورترە و نوێژەكەی(علی) قبول ترە".

---

*) بیرو رای مێژوونووسان جیاوازە لەسەر ژمارەی نوسخەكانی قورئان، زۆرێكیان دەڵێن لیژنەی نووسینەوەی قورئان چواركەس بوون.(نووسەر)

ئەو خۆراکی ناواخۆشی دەخوارد، ڕەنگی ناوا ئەشرافی بوو، بەڵام ئەمە بۆ ئەوانی ترنەبوو. (موعاویە) ناتوانێت وەك حەزرەتی(عومەر) بژی، ناتوانێت وەك حەزرەتی(ئەبو بەکر)بێت.ڕاستە(ئەبوبەکر)پێشتر ئەشرافی بوو، خۆشگوزەرانیدەکرد، بەڵام بەڕاستی مسوڵمان بوو، لەبەرئەوە وەك(محمد)(ﷺ) دەژیا.

(عومەر)پێش مسوڵمانی، دەچوو(باجی) فەحشاو(باجی) شەرابی لەدەوڵەمەندەکان دەسەند و لەهەرچی خۆشگوزەرانە خۆشگوزەرانتر بوو، بەڵام ئەو بەڕاستی مسوڵمان بووە تازە خۆشگوزەرانی مانای نییە بۆ ئەو. ئەو لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) پەروەردە بووە،بەڵام وەك قورئان دەفەرموێت،"ئەوەی لەپێش(فەتح- فەتحی مەککە) مسوڵمان بووە گیانی لەمەترسیدابووە، لەگەڵ ئەوەی لەدوای فەتح مسوڵمان بووە وەك یەك نین، ئەمانەی دوای فەتح ڕێگەیان بۆ نەماوەتەوە و (کونە مشکیان لێ بووە بەعەمارە)، هەڵبەتە بووە بەدڵ مسوڵمان بووە پەشیمان نە بووەتەوە، بەڵام زۆرێك چارەی نەماوە بۆتە مسوڵمان، ئەمانە ناتوانن وەك(ئەبوبەکر و عومەر)بن، ئەو ڕێگە وا پێغەمبەر(ﷺ) پێیدا چووە ئەمانیش پێدا بچن. ئەو بەرنامەیەی ئەو کاری لەسەرکردووە ئەمانیش کاری لەسەربکەن، لێرەدا سروشتی ئەشرافیەت و خۆشگوزەرانی(موعاویە) ناچاربوو (بنکە و بارەگا)ی کۆبوونەوەی لە مزگەوتەوە بگوازێتەوە بۆکۆشك و لەناوێدا خۆشگوزەربێت، لەناو کۆشکدا دەستور دەدات. هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) (١٢) نەفەر بەجارێك بکوژرێن لەسەر ئەشرافیەتی خۆی، لەناو کۆشکدا بتوانێت سفرەی ڕەنگاو ڕەنگی دابخات و ئەمر و نەهی بکات و خەڵکی لەبەرامبەرییەوە بەپێوە بوەستن، تا ئەم رەسم و ئاداب و ڕسومە لەناو کۆشکدا دەکرێت و لەناومزگەوتدا ناکرێت"[1].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

کاك ئەحمەد، لەبابەتەکانیدا بەدەگمەن دەبینین باسەکانی بەجۆرێك لە جۆرەکان پەیوەستی نەکات بەو چینایەتییەی لەناوکۆمەڵگادا دروستبووە، قسەکردنی (موفتی زادە) لەبارەی چینایەتییەوە ئەوەندە دووبارە بووەتەوە، ئەوەندە پێداگری لەسەر کردووە. بەبەڵگەی لۆژیکی سەلماندوویەتی دەبینیت لەکاتی خۆیدا توانیویەتی گەورەترین گۆڕانکاری درووست بکات لە ناوخەڵکی شارەکاندا، ئەمەش لەباسەکانی دواتردا قسەی زیاتری لێدەکرێت.

لەوکاتانەی(کاك ئەحمەدی موفتی زادە) دەربارەی چەمکی چینایەتی و (بێ تەبەقایەتی) قسەی کردووە زۆرێك لە خەڵکی و بەتایبەتی(مەلا) نەخوێدەوارەکان! واحاڵی بوون ئەم قسانەی(کاك ئەحمەد) دەیکەن لەقسەی دینەوە دوورە و ئەو هاتووە چەمکی(مارکس)ی هێناوە و قسەی لەسەر دەکات، خۆی دەیگێڕێتەوەو لەو بارەیەوە دەڵێت"دێتەوە بیرم چەند باسکراوە لەبارەی وشەی(بێ تەبەقەوە)، هەرئەوەندە شتی منداڵانە و بێ مانا وتراوە حەدو حسابی نییە!! بۆنمونە هەندێك بەناوی زانایانی دینەوە وتویانە(بێ تەبەقە) زاراوەیەکی(مارکسییە) ! ئەمانە کاریان تەنها بەوشەکەیە، نەك ماناو هەڵگری ناوەڕۆکی، هەتا لەسەرەتای ئینقیلابەوە لەبارەی وشەی(تەوحید)ەوە. شورایەك بوو لەم بارەیەوە قسەو باسیان کردبوو، یەکێك لە(مەلاگەل) وتبووی"خۆشم لە وشەی(تەوحیدی) نایەت(تەوحید) وشەیەکی مارکسیزمییە و عەبا و مێزەرەکراوەتە سەری" هەڵبەتە خۆی ئەهلی مێزەر و عەبا بووە، هەتا گوێم لێبووە وتویانە"ئەحمەد بەرەو مارکسی چووە"، چونکە لەکتێبی(لەبارەی کوردستانەوە) نوسیومە(کومەڵگەی تەوحیدی بێ تەبەقات)، دەبێت مرۆڤ بەو شێوەیە چەندێك بێ ئاگابێت؟!! وشە لەم یاسایانەدا دەوری نییە، مەفهومی وشە دەوری هەیە، من زۆر ئەمەم وتووە، کۆمەڵگای





ئیسلامی ئەو كۆمەڵگایەیە(ئیستكباری)تێدا نەبێت، ئەوەی وا(ماركس) دەیڵێت لەبارەی وشەی(بێ تەبەقە).

یەكەم: ئەمە درۆیە، ئەو تەوحیدە ئەو هەیەتی كۆمەڵگای بێ تەبەقە ناكات، بەڵكو كۆمەڵگا تەبەقاتی دەكات و(چوار مێخی دایدەكوتێ). مەبەستی ئەوەیە، توانای گۆڕان و لابردنی ئەو تەبەقەی نامێنێت، كەئیمكانی نییە تەبەقات حەرەكەت و تەكان بخوات! هێشتا لەدەسەڵاتی سەرمایە داریدا توانای گۆڕانكاری لەبارەی تەبەقەكانەوە بوونی هەیە و كرێكار دەتوانێت ببێتە خاوەنی كارگە و خاوەنی كارگە دەكرێت ئیفلاس بكات، لەكاتێكدا لەدەوڵەتی ماركسیدا ئەم ئیمكانیاتە بوونی نییە، حوكمەت سەرمایەدارە و كرێكاری بێچارە هەر بەرهەمهێنە، بۆیە كۆمەڵگای پڕ تەبەقە و تەبقەترین تەبەقە ئەو كۆمەڵگایەیە ماركس درووستی دەكات، دەبێت كەسێك نا شارەزابێت بڕوا بكات و بڵێت "ماركس تەبەقات لەناودەبات".

دووەم: مەگەر ئێمە قسەمان لەبارەی عیبارەتی وشەوە هەیە، یان لەبارەی مانا و واقیعەتی وشەوە؟ هەروەك وتوومە، تۆ ئەوە ئەنجام بدە وا شەرعییە، جا هەر ناوێكی لێ دەنێیت گرنگ نییە"[1].

وەك دیارە(كاك ئەحمەد) تا ئەو ئەندازەیە لە(ماركس) تێگەیشتووە و بەو شێوەیە خوێندنەوەی قوڵی بۆ فكرەی(ماركس) كردووە هەر ئەم ڕەخنەو ڕەتكردنەوەی فكرەی(ماركسە)، وایكردووە زۆرێك لەوانەی لەبارەی(كاك ئەحمەد) و هەوڵ و چالاكییەكانییەوە دەنووسن و هێرشی بێ بنەما دەكەن، ئەوانەن سەربە(فكری ماركس)ن، چونكە واقع ئەوەی سەلماندووە یەكێك لەو قوتابخانە فكریانەی زۆربەی

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

هەرە زۆری شوێنکەوتوانی توانای قبولکردن و پێکەوە ژیانیان نییە لەگەڵ قوتابخانەو فکرە جیاوازەکاندادەبینین(مارکسییەکانن)، لەمێژوودا وتە زۆرەو دەکرێت بگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرچاوانەی لە بارەی(مارکس)و سەردەمی (سۆڤیەت)ەوە قسەیان کردووە، بۆیە(مامۆستا هەژار) زۆر جوانی وتووە"لام وایە بەمردویش هەزار کۆمۆنیستی نەزانی دەبێ بەقوربان بکرێ"[1].

وادەزانین، تا ئێرە توانیومانە لەبارەی دیدگای( موفتی زادە) لە بارەی(چینایەتی و سەروخواری لە کۆمەڵگا)دا و بەتایبەتی لەڕووە مێژووییەکەیەوە زۆر بەکورتی شتێکمان وتبێت، چونکە بە دڵنیاییەوە دەیڵێین، دەتوانرێت لەبارەی(چەمکی چینایەتی لای کاك ئەحمەدی موفتی زادە) توێژینەوەی چەند سەد لاپەرەی ئەنجام بدرێت، ئەمەش دەبێتە ئەرکێك لەسەر هەموو ئەو خوێندکارانەی لەزانکۆدا، بەتایبەتی ئەوانەی لەبەشی(کۆمەڵناسی)ن، بۆیە لێرە بەدواوە هەوڵدەدەین لەبارەی چۆنییەتی کارکردنی(کاك ئەحمەد) بۆ نەهێشتنی ئەم دەردە لەناو کۆمەڵگای کوردەواریدا بەشێوەیەکی تایبەت قسە دەکەین، هەروەها لە کۆتایی باسەکەدا ئاقاری نوسینەکە بەرەو ئەو بابەتە دەبەین، کە ئاخۆ(کاك ئەحمەدی موفتی زادە) لە ژیانی خۆیدا و لەو ساتەوەی وەك ڕەهبەرێك دەرکەوتووە چەندێك بۆ پلەو پایە و ئیمتیازات کاری کردووە؟

---

[1]) مامۆستا هەژار: هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل٥٠٩



## هەوڵدانی کاك ئەحمەد بۆ نەهێشتنی چینایەتی لە کۆمەڵگەدا

هەرکەسێك بیەوێت لەبارەی شێواز و هەوڵی(کاك ئەحمەد) بۆ نەهێشتنی تەبەقات لەکۆمەڵگادا زانیاری پەیدابکات، ئەوە زۆر گرنگە بۆی بەوردی بەدوادا چوون بۆ ئەو کۆڕ و وتارانەی بکات، کەدەربارەی(ئینقلابی فەرهەنگی) قسەی کردووە.

ئەگەر لە شوێنێکدا مرۆڤ بیتوانیایە چاوێکی بە(کاك ئەحمەد) بکەوتایە و دەربارەی دەرد و ئافاتەکانی کۆمەڵگا پرسیاری بکردایە، گومانی تێدا نییە لەوەڵامدا هەر ئەوەی پێدەوتیت، کە لەئێستادا دوو دانە ئافات کۆمەڵگای گرتووەتەوە، بەهەموو شێوەیەك لەجوڵە پێکردن و گۆڕانکاری پەکی خستووە، دوو دەرد و نەخۆشی، ئەگەر هەر بزوتنەوەیەك بیەوێت بچوکترین تەکان بەرەوتی پێشکەوتن و گۆڕان بدات،بەبێ لەبەچاوگرتن ئەو دووانە مانای نابێت، ئەو دەرود ئافاتو نەخۆشیانەش بریتین لە(ئیستکبار و ئیسراف).

کاك ئەحمەد، لەم بارەوە دەڵێت،"کۆمەڵگای ئیسلامی ئەوەیە دوو ئافاتی گەورەی تێدا نەبێت ئافاتی(مەعنەوی)، لەگەڵ ئافاتی(ماددی).

ئافاتی مەعنەوی: ئیستکبار- خۆ بەگەورەزانین.

ئافاتی ماددی: ئیسراف* - زیادە ڕۆیی.

دەی سەیرکەن، کۆمەڵگایەك ئیستکباری تێدانەمێنێت، واتە خۆیان لەهەندێك بەگەورەتر نەزانن، گشتی براو خوشك بێت لەبەرامبەریەکەوە، یەك پلە و پایەبن.

کۆمەڵگایەك ئیسرافی تێدا نەبێت، واتە کۆمەڵێك ژیانیان خۆشتر نە بێت لەهەندێك. ئایا ئیتر تەبەقات بونی دەبێت لەکۆمەڵگای ولاتی وادا؟ تەنها ڕێگە چارەی نەهێشتنی چینایەتی سیستەمی ئیسلامییە، لەم سیستەمە مفهومی تەبەقات نامێنێت ئەوە وشەی (ماصدق)یە مفهومی ئەم وشەیە-تەبەقات-

---

*) کاك ئەحمەد لە شیعرێکیدا، کە دەربارەی ئیسراف نووسیویەتی بە ناونیشانی(اسراف و تبذیر)، چوار دەرەجەی ئیسرف دیاری دەکات بۆیە دەڵێت:

"اسراف"نسبیەو، زۆرە دەرەجەی — هەرکەس بەگوێرە مەسئولیەت خودی

یەکەم ئەوەیە کە زۆرتر لەوە — پێویستە بخۆی یا بخۆیتەوە

دووەم لە دەخلُ و خەرجا گوێ نەدەی — خەرجی خۆت زۆرتر لە دەرامەد کەی

سێیەم شێوانن ئەتازەو میزان: — دەس درێژی بۆ حەقی خاو خێزان

چوارەم لادانە لە حەد ناوەڕاس — لای خوار کۆمەڵتەو لای سەریش دنیاس

لەناودەبات ئەگینا لەسیستەمی غەیر ئیسلامیدا هەرچی بڵێیت تەبەقات هەر بوونی هەیە"[1]، هەروەها"ئەوە قورئانی پیرۆزە لەڕێگەی وشەی(عفوا) لەڕووی ئابوورییەوە چارەسەری چینایەتی دەکات. لەگەڵ ئەوەی وشەکان مانای جیاوازیان هەیە قورئان وشەی(عفوا) بەکاردەهێنێت(وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ) پرسیارت لێتدەکەن، چەنێك ببەخشن لەماڵیان بۆ پڕکردنەوەی ئەو جیاوازیە چینایەتییە کە هەیە لەڕووی ئابووریەوە(انفاق)واتا ئەو جیاوازیە ئابوریەی لەنێوان خەڵکیدا درووست بووە و هەندێك زۆر چووەتە سەرەوە هەندێك لەخوارەوەیە ئەو (انفاق)ی پێدەڵێن لەڕیشەی وشەی(نفق)یە"[2].

ئەگەر لەڕوی ماددییەوە پێویستە لەماڵی خۆمان ببەخشین، ئەوا لەڕووی مەعنەوییەوە دەبێت لە ئەخلاقی خۆمان ببەخشین.(موفتی زادە) بۆئەوەی لەکۆمەڵگادا دەردی خۆ بەگەورەزانین چارەبکات ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) دەهێنێت و کاری لەسەردەکات، کەدەفەرموێت(التكبر على متكبر صدقة)، واتە"خۆبە گەورەزانین بەسەر ئەوانەی خۆیان بەگەورە دەزانن چاکەیە". مرۆ پێویستە هەرچی شتە ببەخشێت، یەکێك لەو شتانە(ئەخلاقە)، یەکێکیش لەو بەخشیشانەی ئێمە لەئەخلاق ئەنجامیدەدەین پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ئەوەیە کاتێك کەسێك مەغرورە بەپلەوپایەو قودرەت و دەسەڵات دەبێت تۆ فەخریفرۆشیت بەسەریاندا و لەبەرامبەریانەوە غرور بنوێنیت.

"زۆر کەس لەوانەی هاتوچۆی ماڵی ئێمەیانکردووە دەزانن و ئاگادارن، بۆنمونە ئەکەر کەسێك مەغروربوبێت بەمەقام و سەروەت و عیلم و کەسایەتی....

---

[1] کاسێتی ژمارە(٢)زبانی کوردی(١٧)B

[2]) کاسێتی ژمارە(٢)، در مورد چگونگی حمله اعرعب به هیران،(١٩)A.

بەهەرشتێك غرووریان بوبێت و هاتبێتن بۆماڵی ئێمە(زوو کەهێشتا کەمێك سەرو خوار لەماڵمانا بوو)، لەخوارەوەی-ژوورەکە-دامدەنا. لەخوارەوەی خۆمەوە و خۆم دەچوومە سەری سەرەوەی گشتیان، یان لەهەر دانیشتنێکدا هەڵکەوتایە خەڵك کۆببوایەتەوە،(ئەگەر-فەرزەن- چونکە من نەدەچوومە دانیشتنی ئەشرافی وشتەوە...)، بەڵام بۆنمونە ڕۆژێکیان مەجلیسی(خوێندنەوەی قورئان گیرا)، جەماعەتی پارێزگاو بەرپرسان هاتن، چی سەیردەکەم کەسایەتییە زاناکان گشتیان لەخوارەوە دانیشتوون و چەند کورسییەکیان لەسەرەوە بەخاڵی هێشتۆتەوە بۆ پارێزگارو-محافض-و ئەمانە(چەند دانە خوێڕی وهیچ وپوچ...)، ڕاست چوومە کورسی سەری سەرەوە دانیشتم، سەیرمکرد دەڵێن"چەند مغرورە". سوێند بەخوا، کاتێك ڕۆشتم جلەکانم دڕابوون، بەشەرواڵ و چاکەتێکەوە ڕۆشتم سەرقۆڵەکەی دڕابوو. بەڵام ئەمە لەبەر ئەخلاقی ئیسلامی، لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووە. هەرکەسێك هاتووچۆی ماڵی کردبێ دەزانێت چۆن لەبەرامبەر کەسە سادەکانەوە مامەڵەمکردووە، و چۆن سەرو خوارم لەماڵدا لابردووە"[1].

هەروەها لەبارەی ئەو جیاوازییانەی لەفەرمانگەکاندا ئەنجامدەدرێت، دەڵێت"ئەگەر کەسێك بچێتە فەرمانگەیەکەوەو لەبەرناسراوی و هەندێك حاڵی تایبەتی بەجیاوازی مامەڵەی لەگەڵدابکەن و کارەکانی بۆ ئەنجامبدەن، ئەگەر ئەوە قبوڵبکات ئەوە ناعەدالەتی کردووە"[2].

بۆ ڕیشەکێشکردنی ئەم دەردە(موفتی زادە) ئەوەندە دەچێتە خوارەوە تادەگاتە ئەوەی لەبارەی(لەبەر یەکتری هەڵسانەوە)وە قسەدەکات و ئاگاداری خەڵکی

---

[1]) کاسێتی ژمارە(٧)، سخنرانی در مسجد-پیر محمد-،(٨٠)B.

[2]) سەرچاوەی پێشوو.

دەکاتەوە دەردی لەبەریەکتری هەڵسانەوە لەناوخۆیاندا نەیهێڵن."ئا ئەمە نمونەیەکی سادە گشتمان لەم کۆبوونەوەیەدا بینیمان*، یەکێکی وەك من دێم، کەتەمەنم (٤٥-٤٦)ساڵێکم لەبەرم هەڵدەسنەوە، بەڵام یەکێك دێت(٦٠-٧٠)ساڵ تەمەنییەتی لەبەری هەڵناسنەوە، توخـوا ئەمە ئەدەبە؟! ئەمە ئەخلاقە؟ ئەمە پێیدەڵێن موسوڵمانی؟! موتڵەقەن ئەمە بۆنی موسوڵمانی لێنایەت، ئەگەر قەرارێت هەڵسانەوە دروستبێت دەبێت لەبەری ئەو(٦٠-٧٠)ساڵە هەڵسنەوە نەك لەبەری من. ئەمە نمونەیەکی بچکۆلە، کەچەنێك بەڵگەی ئیسلامیمان لەبارەیەوە ڕونکردۆتەوە"[1].

یەکێکی دیکە لەو خاڵانەی(کاك ئەحمەد) کاری لەسەرکردووە و هەوڵیداوە لەو لایەنەشەوە کۆمەڵگا ئاراستە بکات و لەپەتای چینایەتی و جیاوازی پاکی بکاتەوە، بریتییە لەلایەنی پۆشینی ئەو جل و بەرگەی خەڵکی ڕۆژانە لەبەری دەکەن. لەباسی(ستەمی نەتەوایەتی)دا ئاماژەمان بۆ ئەوەکرد چۆن هەوڵیداوە جلی لەبیرکراوی کوردی جارێکی دیکە بیکاتەوە جلی باوی کۆمەڵگا، کەتا ئەوکاتە بەرەو

---

*) دیارە کاك ئەحمەد ئەم باسەی لە کۆبوونەوەیەکدا کردووە، کە ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی ئامادەی بوون، لێرەدا پێویستە ئەوە بوترێت یەکێك لەو شێوازانەی ناردنی پەیامو مەبەستەکان، کە لەوڵاتی ئێران بەگشتی و ناوچەی کوردستانی خۆمان بەتایبەتی بەکارهێنراوە بریتییە لە ناردنی پەیام لەڕێگەی خوتبەدان و کاسێتی تۆمارکراوەوە، کەیەکێکە لەڕێگە زۆر شیاوەکان لەچەند ڕویەکەوە،کە لێرەدا بەکوردتی ئاماژەی بۆدەکەین. باشترین ڕێگەیە لەڕوی کاتەوە، بۆنمونە کەسێك وەك(کاك ئەحمەد یان مامۆستا ناصری سوبحانی)دێن لەماوەی(٢١)کاتژمێر-دیارە هەر ڕۆژی کاتژمێرێك-تەفسیرێکی(سورەتی یونس)دەکات کەلە دواتر لەدوتوێی(٤٢٩)لاپەرەدا چاپدەکرێت، هەروەها پاشترین و ئاسانترین ڕێگایە بۆ گواستنەوەی هەستی کەسەکان لەکاتی قسەکردنیاندا بۆ نەوەکانی دواتر........ مەبەستیش لەم ڕونکردنەوەیە ئەوەیە، زۆرێك کەس پرسیاری ئەوەدەکەن. بۆچی کاك ئەحمەد یان مامۆستا ناصر کتێبیان زۆر نەنوسیوە، ئەمە وەڵامەکەیەتی بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەو بارو دۆخەی ئەو دوو زانایەی تێدا ژیاوە!

[1]) کاسێتی ژمارە(٧)، وەزیفەی ئینسان لە مصیری تاریخەوە،(B(٧٢.

لەناوچوون و كار گەیشتۆتە ئەوەی تەنها چینێكی تایبەتی كۆمەڵگا لەبەریانكردووە، بەلاّم وائیستا(كاك ئەحمەد) بۆ ڕەواندنەوەی جیاوازی چینایەتی لەڕووی لەبەركردنی جل وبەرگەوە دەستی پێكردووەو وەك كاری هەمیشەیی لەخۆیەوە دەسپێدەكات و دواتر بەتایبەتی داوا لەگەنجان و دانیشتوانی ناوچە كوردنشینەكان دەكات لەڕووی جل وبەرگ لەبەركردنەوە زیادەڕۆیی نەكەن و وردە وەردە هەوڵبدەن بۆ جارێكی دیكە شەرواڵ و جلی كوردی بەكۆمەڵگا ناشنابكەنەوە.

"من(١٥-٢٠) ساڵ لەمەوبەر جلەكانم لەجلی گشتان جوانتربوو، ئابڕوبەرتربوو، دژی ئیسلام تربوو، كەسانێك كەدەمناسن لەبیرتانە لەساڵی(١٣٤٣) هاتمەوە بۆ سنە لەسەرەتادا وردە وردە شەرواڵم لەپێكرد، ئەویش لەناوماڵی خۆماندا هێشتا كۆمەڵگا ئەزمی ئەمەی نەدەكرد. دەیانوت"عەیبە تۆ بۆلەناو ماڵدا شەرواڵ لەپێدەكەیت". هەتا دەیانوت"خەڵكی بە چێوارت دەزانن". دەیباشە چێوار عەیبی چییە؟!

لەوەودوا لەماڵ هاتمە دەرەوە بۆ بەردەرگا، پاشان دراوسێكانمان و خزم وناسراوەكانم، وردە وردە بۆ فەرمانگەو ئەم شارو ئەو شار. شوكر بۆخوا، دەبینم لەم (١٤-١٥) ساڵەدا زۆرێك لە گەنجان شەهامەتیان پەیداكرد و مامۆستایی زانكۆو پزیشك و خوێنەوار عەیبیان لێنایەت و جلی كوردی لەبەردەكەن. كەمێكی تریش بجوڵێن و پێشڕەوی بكەن و ئەوەی وا زەرق و بەرق و ڕەنگی ئەشرافییە لایبەرن، چونكە بزانن لە نەزەری ئینسان و لەنەزەری ئیسلامدا ڕەنگی ئەشرافییەت خوێنتاڵە. ڕەنگی ئەشرافییەت نیشانەی دزی وخیيانەتە...."[1].

هەڵوێستی(موفتی زادە) بۆ ئەشرافییەكان تائەندازەی بەدزو خائین زانینییان دەڕوات.-ئەمەشی لەبابەتی (ئینقلابی فەرهەنگی)دا زۆر بەڕوونی باسیكراوە-، جگە

---

[1]) كاسێتی ژمارە(٧)،ئینقلابی فەرهەنگی،(٦٦)B.

لەوەی لە شیعرێکیدا(نەعلەتی خوا*) لە هەموو ئەو دین و سیستەمانە دەکات دەبنە مایەیی نانەوەی تەبەقات و چینایەتی لە کۆمەڵگدا. هەروەها لەپاڵ ئەم دژایەتیکردنەی تەبەقاتی ئەشرافییەت، خۆشەویستییەکی (دایك بۆ رۆڵەکەی) هەیە بەرامبەر بە هەژاران و نەدارانی کۆمەڵگایی جیهانی، ئەم خۆشەویستییەی جگەلەوەی لەزۆرێك لە ووتار و کۆڕەکانیدا بە وردی باسیکردووە، لە (شیعر)ەکانیشدا بەتایبەت نوسیویەتی و لەسەر ئەو چینە چەوساوەیە(شیعر) دەهۆنێتەوە، تـــادەگاتە ئاستێك دەڵێ"ئەوەی خۆشەویستی هەژاران لەدڵیدا نەبێت ئیمانی تەواو نییە"*.

---

* ئاخ نەعلەتی خوا لە نەزمێ، دینێ

نەزمی تەبەقات رجوا ئەوینێ

لەلایێ، خەڵکی ملکزو هەژار

لەلایێ تر(اتراف) لەتەك(استکبار)

دیوانی شعری کاك ئەحمەدی موفتی زادە، دیاری بۆ یاران

*) پـــاو

ئەو دڵە وا بۆ هەژاران کوڵ نەدا — زەحمەتە ئیمان تیا جێ گرتبێ

ئەك بەزەی، قورئان ئەڵێ: تۆ بۆ هەژار — گیان ئەدوێنی کە ئیمانت ببێ

کۆرپەیێ، تازە گرۆگاڵی ئەکرد — وەك گوڵ ئەشکۆفایەوە بۆ دایکی کە: ((پـــاو))

دایەلەی داماوی دڵگرچاوی، بۆ — جەرگی، چی هێنا؟ تریتی نان و ئاو

ئاو لە چاوی زاو خەمی، بەرچانە دڵ — ئاگرلی، بەنی دڵی، ئاشت کردەوە

کۆرپەلە دڵپربو، بەلام نازی ئەداو — برسیەتی((پـــاو))ی، لەبیری، بردەوە

دور لەتۆ بۆخۆم ئەڵێم: دەك ژەقنەبێ — بێ خەم و هەوڵی هەژاران، عەیشو نۆش.

ئاکەوێتە فکری منداڵی هەژار — ئەو دەمەی، کۆرپەت بەناز ئەگری لە کۆش؟!

ئاخ ئاخ یاخوا بەمیراتم کەوێ — ژینی ئەشرافی، هەتا روتێ هەبێ

بێ خەمی ئەو دایك و بارکە رۆڵەیان — برسیە، تیری لە گیانم ژەقنەبێ

کاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیاری بۆ یاران.

"پایەیی یەكەمی بزوتنەوەی دینی، بریتییەلە خۆشەویستی هەژاران"[1]. تێكەڵبوونو كراوەیی(كاك ئەحمەد) لەگەڵ هەژاران و هەڵگرتنی نازو داواكارییەكانیان یەكێكە لەو هۆكارانەی لەكاتی ئینقلابدا زۆرترین لایەنگرو خەمخۆری هەبێت. كاك ئەحمەد، لە وتەیەكی ناوازەیدا دەڵێت"بەخوای گەورە صادقانەو صەمیمانە پێتانبڵێم، ئیمانی خوا لەدڵی كەسێكدا جێگەی نابێتەوە، تـــا لەو دڵەدا خۆشەویستی هەژاران نەبێت[2]".

یەكێك لەو خاڵە تایبەتو درەوشاوانەی لەكەسایەتی(كاك ئەحمەد)دا بوونی هەیەو دەبێت هەمیشە بۆ مێژوو بگێڕێتەوە، جگە لەو سادەیی و بێ فیزییەی هەیبووە، هەر ئەم خۆشەویستییەتی بۆ هەژاران، لەباسێكیدا دوای مەرەخەس بوونی لەزینداناو لەكەش و هەوایەكی تەواو نارەحەتی تەندروستیدا، نارەحەتییەك، كەئەگەر كەسێكی وەك(موفتی زادە) نەبێت هەرگیز ناتوانێت قسەبكات و باسی بابەتێك بكات لەلای زۆرێك لەخەڵكی هەرجێگەی تێڕامان نییە، دیارە هۆكاری ئەوەی(كاك ئەحمەد) لەئاوا وەزعێكی تەندروستیدا دێت ئەو قسانەدەكەت، كەخەڵكی لەباشترین حاڵی تەندروستیی‌و ئازادیدا بیریشی لێناكاتەوە، (هەست بەمەسئولییەت) كردنێكی زۆر وردە! ئەو دەڵێت"كلۆڵ ئەو كەسەی بەناوی ڕابەری بزوتنەوەی دینییەوە كاردەكات و پێی ناخۆشە هەژاران ببینێت و خۆشحاڵە بەوەی كاربەدەستان ببینێت".

تائێرە وادەزانم دەربارەی هەوڵو كاری(كاك ئەحمەدی موفتی زادە) بۆ لابردنو ڕۆشنكردنەوەی دەردی چینایەتی لەكۆمەڵگادا بەرچاو ڕونییەكمان بۆ دروستبوو. لێرە بەدواوە پێویستە لەو ڕووەوە قسە لەسەر كەسایەتی خودی(كاك ئەحمەد) بكرێت، كەتاچەند بەڕاستی ویستویەتی لەژیانی تایبەتی خۆیدا بەكردار نەك بەگوفتار كار بۆ ئەوە بكات ئەم چینایەتییە نەهێڵێت و لەناو یبەرێت؟ ئەو بەناوی سەركردەیەكی دینی و خاوەن پێگەو

---

[1]) كاسێتی ژمارە(١٧)،بحث وطن دۆستی و دلایل مانع كار سیاسی(ویدیو١٠)،(٢٥٨)B.

[2]) سەرچاوەی پێشوو.

دروشم، ئەوەی واباسیکردووە بەزیادەوە کردویەتی، یان هەر قسەو باسی سەر زارەکی بووەو ویستوویەتی لەخۆپیشاندان‌و قسەکانیدا جەماوەری زۆربێت؟
دەربارەی ئەمانە، لەژێر ناونیشانی(لەقەب و ئیمتیازات لای کاك ئەحمەدی موفتی زادە) باسێك دەنووسین و هەوڵدەدەین زۆر بەکورتی ئەو کەسایەتییەی(کاك ئەحمەد) لەمێژووی ڕوبەڕوو بوونەوەی خۆیدا لەگەڵ ستەمکاران هەیبووە، ئاشکرای بکەین‌و ئەو قسەو باس‌و درۆو دەلەسەیەیی دەربارەی کەسایەتی ئەم قارەمانەکراوە بڕەوێنینەوە.

# لەقەب و ئیمتیازات لای کاك ئەحمەدی موفتی زادە

کاك ئەحمەد، یەکەمین هەنگاو لەژیانی تایبەتی خۆیداهەڵیگرت، بۆ ئەوەی هەرچی چینایەتی و جیاوازی و ئیمتیازاتە لێی دوور کەوێتەوە، ئەوەبوو ڕاستەوخۆ، هەموو ئەو لەقەب و ناوانەی لەخۆی کردەوە کەڕۆژانە کەسەکان لەبەر پلە و پایەی ئایینی پێیاندەدرێ‌و بەشێوەیەك لەشێوەکان لە خەڵکی ئاسایی جیادەکرێنەوە، (کاك ئەحمەد) بەجۆرێك دەستی پێکرد نەیویست تەنانەت لەبەر(مەلا) بوونەکەی یان(حاجی) و (سەید) بوونەکەی یەك مسقاڵ جیاوازی هەبێت، لەگەڵ ئەو هەموو خەڵکە ئاساییەدا، بۆیە دەبینیت سەرەتا دێت وشەی(مەلا- حاجی- شێخ)و هەرشتێك بۆنی جیاکاری لێبێت لەڕووی ناونیشانەوە لەخۆی دەکاتەوە، ئەو دەیوت"پێغەمبەر و هەموو هاوەڵان لەوپەڕی دینداریدا بوون، بەڵام نابینی




یەكێكیان لەقەبێكیان پێوەبێت. كێ بیستویەتی بەحەزرەتی(علی) بگوترێ (سید علی)؟ یان بۆ حەزرەتی(عومەر و ئەبوبەكر و عوسمان) وشەی(حاجی یان مەلا) دابنرێت؟ مەگەر ئەوان(مەلا و حاجی) نەبوون؟"، لەبەرئەم بیركردنەوەی دەبینیت كاری بۆ نەهێشتنی هەموو لەقەبەكان كرد و وتی"لەجیاتی ئەوە پێم بڵێن (كاك ئەحمەد)"و خۆشەویسترین وشە دەربڕین لەلای ئەوەبووە،ئەم خۆشەویستیەشی دووبارە لەبەر هەمان هۆكار بووە، وردەكاری و ترسانی لەوەی ببێتە كەسایەتییەكی ئیمتیازدار و خوانەكا وەك ئەو(شێخانە) تەماشا بكرێت، كەئینسان لەكاتی بینینی هەڵسوكەوتی هەندێ كەس لەبەرامبەریانا هەست بەشەرمەزاری و تەریق بوونەوە دەكات، كەچۆن مرۆڤێك بۆتە بەندە و تا ئاستی خوارتر لەبەندە كرنوش بۆ شێخێك دەبات و هەوڵدەدات بەتەواوی وجودیەوە بڵێت تۆ(شێخی)منی!!

كاك ئەحمەد، دێت ناوی ئەم هەڵسوكەوت و بارودۆخە دەنێت(بت)، بۆیە زۆر لەوە سڵی كردۆتەوە وەك(بت) سەیری بكەن،"-توحیدیی بوو- نهێنی ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) توانی لەماوەیەكی كەمدا كۆمەڵگا لە ئیمتیازات پاك بكاتەوە، و منیش هەر دەنوسم وهەردەڵێم با ئیمتیازات نەمێنێت و هەر دەمێنێت ئێستا پێتان دەڵێم: بەگیانەكەی گشتان كۆمەڵێك كەس، كەخەریكن من دەكەنە(بت). (ناڵیم گشتی بەعەمدەن). بەگیانەكەی گشتان، ڕۆحی ئەوەیان هەیە(واتە، وەك ئەوانە حسێبدەكرێن)،وا پێغەمبەرانیان تـا پلەی خوا بەرزدەكەنەوە، لەبەرئەوەی بڵێن خۆمانجێنشینیانین و لەسەرترین لەهەموو خەڵك. دڵنیام لەدڵی كۆمەڵێكدا ئەمە پەیدا ببێت-كە(ئەحمەد)بكەنە(بت) بۆئەوەی خۆیان جیابكەنەوە...ئەم جۆرە ئیمتیازانە بەكارنەهێنن بۆمن.قەیناكات نامەدەنوسیت،بنووسە(برای خۆشەویستم، باوكی خۆشەویستم، كاك ئەحمەد گیان) ئارەزووی خۆتە، بەڵام لەكاتی نەبوونەدا





هیچ قەید و لەقەبێك درووستمەکە، ئاسایی وەك هەرچی مرۆڤە ناوم ببەن، ئەگەر لەغیاباتی (ئامادە نەبوونی) مندا هەر وشەیەکتان لەگەڵ ناوی(ئەحمەد)دا وت، ئەوە ئیمتیازتان پێداوە و کردووتانە(بت). بەگیانەکەی گشتان، ئەو سەرمەشقەی لەسەرەتاوە دانراوەبۆمان پەیڕەوی لیّ بکەن-مەبەست ئەو سەرمەشقەیە پێغەمبەرو هاوەڵان دایانناوە و کەسیان لەکەسیان ئیمتیازاتیان نەبووە،و وەك مرۆڤێکی ئاسایی سەیری یەکتریانکردووە-. ئائەم میللەتە مەزلومە بەدبەختە ئازادی دەبێت لەوەی هەزاری وەك من بێت و لەبازاڕدا هاتوچۆ بکات و هیچ سەرسوڕ هێنەرنەبێت و وەك کەسێکی ئاسایی سەیری بکەن"[1]. ئەگەر لێرەدا وازلەم باسە بهێنین‌و بڕۆینە سەر بابەتێکی دیکە. دڵنیام لەوەی پەیامەکەبەتەواوی ماناوە گەیشتووەو زۆر جوان ڕۆشن بۆتەوە، کە(کاك ئەحمەد) تـــاچەنێك بەشوێن لەقەب‌و ئیمتیازاتدا ڕایکردووە و هەوڵی بۆ داوە، بەڵام...نا... بەردەوام دەبین زۆر شتی دیکە ماوە دەبنە پاڵپشتی بەهێز بۆ ئەم قسانەی ئێستا.

ڕێگەیەکی دیکە. (کاك ئەحمەد) کاری لەسەرکردووە بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت لەخەڵکی ئاسایی جیاواز نییە و ئیمتیازاتی ناوێت، بریتییە لەوەی، کەخۆی ناوی دەنێت(قەیدی خۆ پارێزی)، واتە دروستکردنی پەرژێنێك بۆ خۆپارێزی،(موفتی زادە). ئەم (قەیدە) بە(دەرد و نەخۆشی) باسدەکات. لەیەکێك لەدانیشتنەکانیدا لەدوای(ئازادبوونی لەزیندان) دەڵێت"یەکێکی دیکە لەدەردەکان، دەردی (قەیدی خۆپارێزی)ە. دەهاتن دەیانووت"فلاّنەکەس هەروا لەخۆتەوە دەڕۆیتە دەرەوە لەوەخت و بیّ وەختدا، لەکاتێکدا تۆ ئەم گشتە شتەت هەیە". هەوڵیاندەدا

---

[1]) کاسێتی ژمارە(١٧)،مراسم مولودو سخنرانی‌نفی امتیازات و منع هر گونه لقب وامتیازی برا خود، A(٢٥٤).

قەید و پەرژین بەدەورمدا درووست بکرێت بۆئەوەی بمپارێزن. دەی ئاخر ئەوە بەکەڵکی چی دێت؟! واگیرام سەد ساڵ تەمەنمکرد؟ ڕۆژێك ئەرزشی هەیە کەوەك پێغەمبەران بچینە ناو خەڵکیەوە. خۆ لە(علی و عومەر) لەپێشتر نیم، دەی(حەزرەتی عومەر) چوو بۆ مزگەوت و کابرای تاوانبار هات و لەکاتی ئیمامەتدا دەدات لێی و شەهیدی دەکات، (علی) دەکەوێتە ڕێ بۆ نوێژی بەیانی و لەتاریکی بەیانیدا، چونکە پارێزەری نییە، ئەو بەدبەختە خۆی دادەشارێت و شەهیدی دەکات، ئەگەر ڕاستدەکەم ئەو ئەمانەتەی خوا(دین) بگەیەنمە ئەم ئەمانەتەی خوا-خەڵك-*، ئەوەیە دەبێت وەك ئەوان ڕەفتاربکەم، دەی ئاخر ئەم گشتە خۆپارێزی و قەبیر و قیودەچی لێبکەم؟! جاری وا هەبوو شەو سەعات(١٠ و ١٢) دەچوومە دەرەوە لەگەڵ دەهاتمەوە، دەبوو بەهاتو هاوار (ئای ئەوە فلانەکەس چۆن وا چویتە دەرەوە؟!). لەبیرتە (کاکە حەسەن)-مەبەست کاك حەسەنی ئەمینییە- لە(کرماشان)دا. پشۆێنەی ئەمنیتان دروستکرد بۆ ئەو خانوەی تێیدا بووین؟ لەوەو دوا من بەرنامەم بۆ دانان دەموت بەسەرە وەرن. ئەمە گوایە بۆ پارێزگاری! شەوێکیان دەوروبەری سەعات(دوو) گوێم لە(تەقە) یەك بوو لە دەرەوەی ماڵەکاندا. نیگەران بووم هەستام چووم ئەملا و ئەولا هەمووی گەڕام یەکێکیان خەبەری بوویەوە، وتم" بخەوە من گەڕاوم هیچ خەتەر نییە بەم دەوروبەرەدا".-واتە کاك ئەحمەد، ئەوەندە چاونەترس و بێ باك بووە، لەگەڵ ئەوەی کەسێك هەبووە بەناونیشانی پاسەوان و ئاگادار. کەچی لەحاڵێکی وادا ئەوان

---

*) بەڕای کاك ئەحمەدی موفتی زادە. خوای گەورە دوو دانە ئەمانەتی داوەتە دەستی کەسێك، کە (عالمی دین) بێت، یەکێك بەندەکانییەتی، یەکێکی دیکەیان (دین) خۆیەتی. کاسێتی ژمارە(١٦)،دیداری عمومی،(٢٤٧)-٢،B.

ئاگادار ناکات و خۆی دەڕوات بەشوێن هەواڵی ڕوداوەکەدا دەگەڕێت-. یان جارێکیان لە(تاران) بۆ (ئوتێل) دەچووین وتم" توخوا(کاك ئەمینی) سەرمەنێ سەرم باوەك بەنی ئادەم-ئادەمیزاد- بەئوتوبوس(پاص) بڕۆین، باوەك و مرۆڤ بڕۆین، بۆچی لەم عالەمە خۆمان جیابکەینەوە؟"[1]

لەم دوو نمونەدا، کەڕاستەوخۆ(کاك ئەحمەد) خۆی دەیانگێڕێتەوە بەتەواوی ئەوە ڕۆشندەبێتەوە ئەم پیاوە تــاچەند پێی شەرم نەبووە لەبەر هەر هۆیەك بێت خۆی لەخەڵکی ئاسایی و چینی هەژاران جیابکاتەوە، لەنمونەیەکی وەك ئەوەی، کەئامادە نییە بە(تەکسی) لە شوێنێکەوە بڕوات بۆ شوێنێکی دیکە و ئەم کارە وا سەیر بکات کەخۆی لە خەڵکی جیادەکاتەوە، دەتوانین بگەینە ئەو دەرەنجامەی ئامانج و مەبەستەکانی تەنها لەبەرئەوە بووە میللەتێکی مەزلومی وەك کورد بگەیەنێتە مەسیر و مەئوای خۆی، و ئەوەی لەپێش ئینقلاب بەڵێنیان پێدرابوو بۆیان بەدی بهێنێت، ئەگەر ئەم بەڵگانەش لای هەندێك لە(دڵ) کوێران و ڕاستی نەبینان جێگەی شكو گومان بێت، خۆ ئەوە هیچی تێدا نا هێڵێتەوە. کەلەڕۆژنــامــــەی(اطلاعات)ی ڕۆژی(١٧-٣-١٣٥٨)،وەك وتەیەکی ڕاستــەوخۆ (اقتباس مویاشر) لە(کاك ئەحمەد) وەرگیراوە و بڵاوکراوەتەوە تێیدا دەڵێت"قسەو باسی کاندیدبوونی من بۆ سەرۆك کۆمار، کەلەڕێگەی ڕادیۆی(مۆسکۆو لەندەن)ەوە بڵاو بۆتەوە، ڕاست نییە و ئەمە تەنها بۆ تێکدانی بیر و ئەفکاری گشتی خەڵکە، بۆئەوەی وا خەیاڵ بکەن من بۆبوون بە(سەرۆك کۆمار) ئەم هەموو هەوڵو ڕووبەڕوو

---

[1]) کاسێتی ژمارە(١٦)،دیداری عمومی،(٢٤٧)-٢،B.

بوونەوەیەم ئەنجام داوە، ئەم قسانە بە هیچ شێوەیەك ڕاست نییە و من ئەوەم قبوڵ نە کردووە"[1].

وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، ئەم نمونانە بەجۆرێك لە جۆرەکان دەبنە هۆکاری بەرچاو ڕونیمان لەسەر کەسایەتی(کاك ئەحمەدی موفتی زادە). بۆ زیاتر ڕونکردنەوەی ئەم بابەتە دەگەڕێینەوە بۆ قسەکانی(شەهید کاك فاروق فەرصاد)* لەوەلاّمی پرسیاری(بۆچی کاك ئەحمەدمان بەناونیشانی پێشەنگ هەڵبژاردو بەیعەتمان بەودا؟). ئەمەش بۆئەوەی هەوڵبدەین زیاتر لایەنەکانی کەسایەتی و پلەو پایەی(موفتی زادە) ئاشکرا بکەین و زیاتر سنورەکانی گومان لەم شۆڕشگێڕە ماندونەناس و دڵفراوانە تەسك بکەینەوە.

(لەوانەیە کۆمەڵێك کەس هەبن پرسیاری ئەوەیان بۆ پێشبێت، ئێمە بەچی دەلیلێك لەم جامیعەی خۆمان پشتگیریان بۆ(کاك ئەحمەد)مان بەڕێگەی دین زانی؟ بۆ هاوڕێی بووین لەتەك ئەوا؟ بۆچی خەلکی تر بانگدەکەین بەهاوڕێ بوون لەگەڵ ئەودا؟ بۆچی ئومێدەوارین هاوڕێبین و ئومێدیشمان هەیە لەقیامەتدا هەر هاوڕێی بین؟ ئەمە عیللەتی چییە؟ ئایا هەر پێخۆش بوونی سادەیە یان بەڵگەیەکی بەهێزی دینی لەپشت سەر ئەم بابەتەوەیە؟ئەمیشە دەکرێ بەحسێکی تولانی بوێت.

هەڵبەتە ئەوەی ئێستا باسی دەکەم بۆ هەموو کۆمەڵگایەك دەبێت، یانی لە هەر کۆمەڵگایەکدا ئەفرادێك گەرەکیان بێت ڕێگەی دروست بدۆزنەوە بۆ ئەوشتەی وا

---

[1]) بەهزادی خۆشحاڵی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو کوردستان، روزهای بحران ٤(ئیتلاعات-١٣٥٨/٣/١٧)

*) شەهید فاروق فرساد لەساڵی ١٣٤٠ ی شەمسی، لەشاری سەقزی سەر بە پارێزگای سنە چاوی بەدنیاهەڵهێناوە، خوێندی سەرەتایی و ناوەندی لە سەقز تەواوکردووە، پاشان بەهۆی ئەوەی باوکی شوێنی نیشکردنەکەی گۆڕیوە، لە سەقزەوە چونە سنەو خوێندنی دواناوەندی لە سنە تەواوکردووە...... درێژەی بابەتەکە لە پاشکۆدا بخوێننەوە.

خوادەستوری داوە و خوا پێیڕازییە ئەشێ تبقی ئەم زابیتە حاكم بێت، وەئیلا غەیری ئەمە باتڵە. قورئان لەدوو ئایەتدا باسی ئەمە ئەكات، ئەو دوو ئایەتە دەهێنینە پاڵیەكەوە لێمان ڕۆشن دەبێتەوە بەقەول كێ بكەین.

بۆ ئێمە وەقەول(كاك ئەحمەد)مانكرد، یانی بۆچی ئەومان بەعینوانی كەسێك زانی كەمەتبوعی(شوێنكەوتەی) بین؟ ئێمە تەبەعیەت لەئەو بكەین؟ ئەو تەبینە كەئەو ئەیكات لەئیسلام، ئێمە وەعینوان تەبینی دروست وەریگرین و وەحەرەكەت بكەین بەرەو ئەو مەسیرە كەئەو پێی خۆش بوو؟ ئەو بەدروستی ئەزانی؟ عیللەت چی بوو؟ قورئان ئەفەرموێت:{الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ أُولَئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ وَأُولَئِكَ هُمْ أُولُوا الْأَلْبَابِ }الزمر١٨

ئەفەرموێت"مژدەبێت بۆ كەسگەلێك كەوانین گوێچكەی خۆیان بگرن و حازرنەبن كۆمەڵێك قسەی موختەلف-جیاوازی لەوەی خۆیان دەیانەوێت-ببیستن، یەكێك لەسیفاتی بەندەی هیدایەت دراوی خوا ئەوەیە كەحازرە قسەی جۆراو جۆر بژنەوێ(ببیسێ). ئەساسەن و ئەوەڵەن وەصفی ئەمەسە(يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ)، هەر لەڕووی ئەمەیشەوە حاشییەیەكی تربێژم،(بزانن كۆمەڵگای ئیسلامی كۆمەڵگایەكە قسەی جۆراو جۆری تیابكرێ، ئیلا ئەگەر قسە یەك قسە بێت-هەموو یەك جۆر بیروڕا ببیستن و جیاوازی بیرو ڕابوونی نەبێت-. ئیتر(يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ) مەفهومێكی نییە، وانییە؟! ئەبێت قسەی جۆراو جۆر هەبێت تـائینسان بتوانێت گوێیان لێبگرێت و شوێن باشترینەكەیان بكەوێت، ئەگەر قەرار بێت هەرچی دەمە قرِوقەپ بێت و هەر یەك قسەبێ، ئیتر ئیمكانی نییە شوێنكەوتنی باشترین لە قسەكان دروست ببێت-واتە، ئەگەر ئێمە چەند جۆرێك قسەو باسمان نەبێت و هەندێك لەم

قسانە خراپ نەبن، ئیمكانی نییە شتێك دروستببێت بەناوی هەڵبژاردن لەقسەكانداو شوێنی باشترینیان كەوتن-.

هەر لە ڕووی ئەمەوە بزانن، كەجامعەی ئیسلامی یەكێك لە موهیمترین شتەكانی ئەوەیە، ئیمكانی ئیستماعی اقوال بۆ ڕاو بۆچونی تیابێ، تـابكرێت شوێن باشترینیان بكەوین.

دوای ئەوەی گوێ بۆ قسەكە دەگری، سیفەتێكی تریش باسدەكات، چونكە بیستن بەتەنیا مەترەح نییە، بیستن بۆ چییە؟ بیستن، بۆئەوەسە كەوا ئینسان شوێنی بكەوێت، ئەمما شوێنی چی بكەوێت؟ شوێنی(احسن)ی بكەوێت، واتەی لەنێوان كۆمەڵێك قسەدا كەدەیبیستێت، هەتا نافەرمێ شوێن خاسەكەی بكەوە، ئەفەرموێت شوێن خاسترینی(احسن)، یانی(خاسترینیان).

دوایش ئەفەرموێت، ئەمانە كەوا گوێچكە شلدەكەن بۆ قسەی موختەلیف، و شوێنی باشترینیان دەكەون، ئەمانەن ئینسانێك كە خوا هیدایەتی كردگن.

واتە یەكێ لەزەمینە گەلێك كەوا ئەبێت هۆكاری ئەوەی لەهیدایەتی خوا بەهرەمەند بین(أُولَئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ...)، ئەوەیە گوێ بگرین بۆ قسە و-باسی-جییاواز،و حازر بین ئیتیباع لە ئەحسەنەكە بكەین-ئامادەبین شوێنی باشترینیان بكەوین-.

(أُولَئِكَ هُمْ أُولُوا الْأَلْبَابِ)، ئەفەرموێت، لەناو بەندەگانیشا ئەوانە صاحیبی(لُب) بن، یانی صاحێو(خاوەنی)ی عەقڵبن، عەقڵێك خالص، بێ تیكەڵاوی هەواو هەوەس. لەجێگەیەكی تردا قەولی(احسن) تەفسیر دەكات، واتە-تەفسیركردنی ئەو چەمكەی-نەیداگەسە دەستخۆمان،-بۆئەوەی- هەر قەولێك مەیلمان بوو ناوی بنێین قەولی(ئەحسەن)، یان زابیتەی هەس، لەگەڵ ( شەرائیت ومەرج )ی قەولی

ئەحسەندا. لەقورئاندا موعەرِەفی ئەكات، -توخوا دیقەت بكەن ئەمە نوكتەیەكی زەریفە-، ئێژی كێ ساحێبی ئەحسەنە.

ئاخر قەولی ئەحسەن تەنیا(بێ گویەندەكە-ئەوكەسەی دەیڵێت) لەرِوی شەرعییەوە قابلی بەگوێگرتن نییە، بەڵێ ئەگەر علومی تەجروبی(زانستی ئەزموونی) ئەخوێنین لێرا پێویست ناكات بزانین ئەم بابەتی، ئەم بیرورِا هی كام لە(دانشمەندان) بیریارانە، هەر دانیشمەندێك كردویەتی تۆ بەشوێن ئەوەوەیت تێبگەیت ببیت، ئێستا مەسەڵەن دانشمەندێك(بیریارێك)ی بێ عەقیدە بێ،یان بەعەقیدەبێ، پیاو خاسبێ ، پیاو خراو بێ، لێرەدا موتلەقەن مەترەح نییە، لێرا (علم برایە علم) مەترەحە. وەلێ لەدینا ئەم مەتڵەبە نییە، لەدینا قەول بەعزێ خصوصیاتی هەس تا ببێتە قەولێكی باش، ئەمما ئەگەر هات و قائیلەكەی ئەو صیفات و خصوصیاتەی نەبوو نابێتە قەولێكی پەسەند یان قەولێكی ئەحسەن. قورئان، قائیلەكەی(گویەندەكەی)، باسی دەكات، كە ئێمە تێبگەین كێ خاوەنە باشترین قسەیە و بۆ ئەوە دەشێت شوێنی بكەوین. ئەفەرموێت{وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِّمَّن دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحاً وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ }فصلت٣٣

سێ سیفەتی بۆ زیكر ئەكات:

ئەفەرموێت ئەو كەسەی وا: یەك: ئەوەڵەن دەعوەت دەكات بەرەولای خوا، بانگەوازی بۆ خوایە، بەلاّم ئەگەر لەهەر كۆمەڵگایەكدا فەردێك دەعوەت بكات بەرەولای خۆی(بانگەشە بۆئەوەبكات شوێن ئەو بكەون)، دەعوەت بكات بەرەولای حیزبی، دەعوەت بكات بەرەولای ئەوەی رِەئی پێبدەن، دەعوەت بكات بەرەولای ئەوەی ئیمكانیاتی و دەستەلاّت و قودرەتێكی دەسكەوێت،و دەعوەت بكات بەشكم مەردم بباتە ژێر رِكێفی خۆی و بیانكاتە پێپلیكانەو بچێتە سەرشانان و خۆی

بەرزۆبێتو هیچكامیان ساحێبی قەولی ئەحسەننین. ئەوەڵێن وەصفی(قەولی ئەحسەن)،ئەوەیە دەعوەت بۆ خوابكات(دعی) بۆ كوێ ؟(الی الله).یانی مەردم (خەڵكی) لەگشت زیللەتگەلێك، كــەدوری لــە خــوا دەهــێــنــێـت بەسەریانا بانگەواز بكاتو دەعوەت بكات بەرەو لای عیزەت و خوا پەرستی. ئەمە مەرجی ئەوەڵە.

دووەم: تەنیا داعی و قسەو بانگەوازكردن نییە.

(وَعَمِلَ صَالِحاً) خۆیشی(عامل بەصالیحات)ە، واتە هەر خەیرێ هەرصەلاحێ، كەوا كۆمەڵگا بەرەولای ئەوە دەعوەت دەكات و خەڵكی بەرەولای ئەوە دەعوەت دەكات، لەسەرەتادا خۆی پەیڕەوی لێ بكات(تەتبیقی بكات )، خۆی ئیمانی هەیەپێی، ئەگەر ئیمانی نەبێ پێی و ئەنجامی نەیا و مونتەسیب(ڕێكنەكەوێت) نەوێ پێی، ئیتر ئەوەیە دەبێتە شۆخی-شتێكی بێ مانا-، چۆن ئەكرێت؟

{أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ}

خاسی بۆ خەڵكی وەلێ خۆمان هیچ! قانیت بەصالیحاتیش بێت.

(جاتوخوا دیقەتبكەن)، تــائیرە ئیحتیمالی هەیە زۆر كەس هەبێت لەگۆمەڵگادا-ئەم مەرجانەی تێدابێت-، شەرتی سێیەمی هەیە، كەپیاوی خۆی دەوێت.

(دَعَا إِلَى اللَّهِ) دەعوەت بەرەولای خوا دەكرێت، قامەت بەصالیحات بونیش هەر مومكینە.

وەلێ شەرتی سێیەمی هەیە:

ئەفەرموێت: (وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ)یانی چی؟ یانی هەرچەند من، هیچ نیم ئیلا فەردێك لە ئێوە(لە موسوڵمانانگەل) هیچ ئیمتیازێك، هیچ بان و ئیمكانێك، هیچ بەڵێ قوربانێك، هیچ قودرەتێكم لە ئێوە ناوێت نییە. من چیم؟ هیچ، ڕەهبەر،





مامۆستا؟ نەوەلا (إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ)(منیش كەسێكم لەموسولمانان)، منیش یەكێكم لەناو موسوڵمانان. دەی ئێسە بێ تەعەصوب صەمیمانە بێینەوە سەر ئەوەی مەبەستمان بوو لەسەرەتاوە بۆئەمە ئەم باسەمان دەستپێكرد-(بین و بین الله، بینكم و بینكم الله). (كاك ئەحمەد) دەعوەتی بۆ(خوا)كرد یان بۆ خۆی؟ عامل بە صالیحات بوو یان نەبوو؟ (ان من المسلیمن)ی بەتەواوی وجودیەوە ووت، یان یەك ئیمتیازی تەحەمولكرد؟ ئاخر فەرقی هەیە، كەسی واهەیە ئیمتیازی گەرەك نییە، وەلێ ئەگەر بیەی پێی قبولێ دەكات.

كاك ئەحمەد، تەحەمولی نەئەكرد ئیمتیازی بۆ قایل بێت،-با ئەم ڕوداوەتان بۆ بگێڕمەوە: ڕۆژێكیان-دوای ئازادبوونی لە زیندان-نەخۆش، نارەحەت، جەماعەتێك دەعوەت بوو بوون بۆ(تاران) سەردانی بكەن، لەو ژوورەدا بەو نەخۆشییە سەختەوە ئیسراحەتی نەكرد ئێوارە فەرموی"هەرچەند میوانتان دەعوەتكردگە فرە سەخت بێمە ئەیوو، حەتا سەلام و ئەحواڵ پرسیەك بكەم"، وەختێك دوای ئەوە كەقەرار بوو مەجلیس مەولوی تەشریع بوێت تەشریفی هاوردە ئەم دیوو، وەختێك هات ئاشكرا دیاربوو،هەركەس لەپشتەوە(كاك ئەحمەد)ی بدیایە ئەیدی كە(كاك ئەحمەد) چی پێهاتووە، چۆن ئەم ئینسانە قەوییە، یەكسەرە جسمی پێچرابوو بەیەكدا!

هاتە مالۆ، فەرمووی"ناتوانم (تەوقەو ماچ ماچێن)بكەم و دەست كەمە ملتان بەموصافەحەیەك‌و دەسدانەوەیەكی ئاسایی ڕازی بن. دوای ویستی تەشریفی دانیشێ فرە بەسەختی دانیشتە سەر پشتیەك، گەرەكی بوو بێتە خوارۆ دانیشێ یەكێ لەبراگەل ووتی پێی"با پەتویەك بخەینە ژێرت".

چوون جەستەی فرە ئوستوخانی بوو، فرە ئێشی پێئەگەیشت هەتا دائەنیشت، "با پەتویەك بخەینە ژێرت".

فەرمووی" نە ... پەتوم گەرەك نییە".

وتیان"قوربان، ئێمە گشتمان دانیشتوین، باپەتویەك بخەینە ژێرت. ئەمە عادییە و شتێك نییە!"

فەرموی" نە پەتوم گەرەك نییە".

دووبارە هەر تیکراریان کردۆ.

فەرمووی"ئەگەر کەسێك نەخۆش بێت ئەشێت بڕوات ئیسراحەت بکات، بەلاّم کەهاتە ناو خەلّکی دەبێت لە خەلّکی بچێت".

یانی هەتا حازرنەبوو ئیمتیازی پەتویەك، کە ئیمتیاز نەبوو بۆ ئینسانێکی نەخۆش، کەدانیشتن و هەلّسانەوەی بەشیدەت ئێشی پێ ئەگەیاند، هەتا حازر نەبوو لەناو جەمعێکا پەتویەکی بەنێ کەکەسێکی تر دانیشتووە و ئەو پەتووەی لەژێردانییە.

دەی(اننی من المسلیمین) چۆن ئەوێژرێت؟ کێ لەم جامیعەی ئێما چی کەسێکی تر ئاوا ئەو ئایەتەی وت؟ ئێستە ئێمە قسەی جامیعەکانی تر ناکەین.

سالّی(١٣٥٩)بوو ئەمەشە بابەتێکە هەر حەزدەکەم بیگێڕمەوە بەناونیشانی یادگارییەك. لە(تاران) بووین لەیەکێك ئوتێلەکانی خوار(مەیدان ئینقیلاب)ە کە زۆربەی کات دەچویە ئەوێ. شەو بوو(من بووم و کاك حەمەژیان و کاك ئەحمەد).

کاك ئەحمەد، فەرمووی(ئەو وەختە ماشینێکمان(ئۆتۆمبێل) بوو لەخوارەوە بوو)."

ئەو ماشینە ڕۆشنکەن بمبەن سەرێك مالّی مامۆم بدەم".(ئەو وەختە مالّی مامۆیەکی لەتاران بوو).

منیش ووتم: باش. ووتم تـا من ماشینەکە گەرمدەکەم تۆش تەشریف بێنە خوارەوە.




چووم و من ماشینەکەم ڕۆشنکرد، وەختێك هاتە خوارەوە بینیم ئوتێلەکە تاسەر شەقامەکە (سیاجی)هەبوو، دیار بوو هاتە خوارەوە، ئیتر ساڵی(٥٩) بوو منیش منالتر بووم لەئێستە، و میقدارێك شایەت موحیبەت و عیشق و عەلاقەی خۆمگەرەك بوو هەروا دەریببڕم، فرەش سادە نەوەك بێژی مەبەستم ئەوەبێت کەمەسەڵەن بەئیمتیازێك زیاتر قایلبم.... نەوەلا هەر بەو موحیبەت و صەمیمیەت کەوا حەزمەکرد پیشانی بدەم.

هەروا بەدەسم، زۆر ئاسایی ڕۆژگار کەوا دەرگا ئەکەنەوە بۆ کەسگەلێك، ماشینەکە ڕۆشنبوو دەرگاکەم بۆ کردەوە.

ئەویش هات، هات لەسەر پلیکانەکان وەستا، کە دی من دەرگاکەم کردۆ(ئەو وەختە نەشزانم(کاك ئەحمەد) هیچ کاتێك لەدواوە دانەدەنیشت، گشتمان هۆکاری ئەوەمان دەزانی، چونکە دواوە هەمیشە کۆمەڵێك کەس کەوا شتێکن، یام دەبن بەشتێك لەدواوە دادەنیشن، هەمیشە ئەو هەر عەمدەن نەدەچوویە دواوە، هەتا کاتی واهەبوو، وا ڕویدەدا لەناو ماشین و شتا کەسێکیشی دەخستە پاڵخۆی بۆئەوەی هەر تەواو لار دانیشێ و لەکەسێك نەچێت مەوقیعیەتی هەیە و کەسێکی تایبەتە!

تۆ فکری لێ بکەرەوە لە(پەیکان)*دا تۆ برۆیتە ناوەڕاستی دوو کەسەوە، ئیتر دانیشتنێك تەواو لارە، هیچ کەسێك بەهیچ پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بەوشێوەیە دانانیشێت. دەی ئەو بەوشێوەیە دادەنیشت، بۆئەوەی لە هاتووچۆ کردنەکەیدا شکڵی یەك پێگەی تایبەت و ئیمتیازات پەیدانەکات).

---

*) پەیکان: جۆرێك سەیارەیە لەشێوەی (نیسان تاك)دا بەو لە وڵاتی ئێران زۆر بەکاردەهێنرێت، سەیارەیەکی بچوکی تەسك و زۆرجار بۆ گواستنەوەی کەل وپەل بەکاردەهێنرێت.

دەرگای پێشەوەم كردبوویەوە، لەسەر پلیكانەكان وەستاو ئاوا كەنینێك لەگەڵ عەصابێتیاكرد و فەرمووی" دەرگاكە دابخەرەوەو خۆشت برۆ دانیشە".

دەرگاكەم بەست و خۆشم دانیشتم. لەولاوە بۆ خۆی هات دەرگایەكەی كردەوە و هات دانیشت. سەری هاوردە پێشەوە بۆ لای سەرم و (بەتەعبیر-دەربڕینی-ێك كەمن ئێسە ئەو تەعبیرە ناگەڕێنمۆ).

فەرموی"وادەزانی منیش نازانم دەرگا بكەمەوە؟!"

یانی هەڵبەتە بەتەعبیرێك توندتر پێیوتم من ئەوە ناگێڕمەوە، بەڵام مەبەستەكەی ئەوەی گەیاندن"هەتا ئەوانە وا دەرگایان بۆ دەكەنەوە خۆیان نازانن دەرگا بكەنەوە، بۆیە دەرگایان بۆ دەكەنەوە، من خۆم دەزانم دەرگا بكەمەوە".

واتە،حازر نەبوو تەحەمولی ئیمتیازێكی ئاوا بكات! كامتان دیتان لەو بنەمایانەی لەكتاب و سوننەت هەڵیجێنابوو بۆ ئێمەشی ڕونكردبوویەوە، پێچەوانەی ئەوانە كارێك بكات؟ لە هیچ كاتێكدا حازرنەبوو لەشوێنێكا بكەوێتە پێش كەسێكی ترەوە.

كێتان دیی ئیمتیازێك مادی داوابكات بۆخۆی؟ بینیتان ئیمتیازێ مەعنەوی داواكات؟ لەحاڵێكدا پێگەیەك كەوا(كاك ئەحمەد) بووی لە ئاستێكابوو، ئەگەر ئەو داواكاری فرە گەورەیەشی بكردایە و ئێمە جێبەجێمان نەكردایە، چونكە سەرك وسەبای ڕونبوو بۆمان.

ئەگەر(كاك ئەحمەد)، لەم ساڵانەی دواوە-سەردەمی ئازادبوون و نەخۆشییەكەی بۆ چاكبوونەوە-مەسەڵەن داوای فرەی لەئیمتیازاتی مادیشی لە هەركامان بكردایە گشتمان حازر دەبوین.(ئەصڵەن بەئیمتیازمان نەدەزانی).

داوای ئیمتیازاتی مەعنەوی لە هەركاممان بكردایە واقیعەن بەتەواو وجودۆ حازر ئەبوین بیدەینێ، ئەشماندا یانی زەمینەش فەراهەم بوو، لەحالێكا بەشیدەت موخالەفەتی ئەكرد و بەشتی ڕازی نەدەبووە.

ئەو ڕازی نەبوو، كاتێك خۆی حزوری نەبێت و لەغاییباتدا وشەی(گیانی) بۆ وەكار بووەن! لەنامەیەكدا نوسیبویان"(كاك ئەحمەد گیان) وای ووتگە".

دەیووت"وەختێك تۆ نامە دەنوسی و من خۆم نیم ئەم كەلیمەی(گیانە) بۆ كردوتانە بەلەقەب بۆ من؟! مەینوسن. مەتلەبێكم نوسیبوو، بریا بوویە خزمەتی هەلیسەنگێنێت، نوسیبووم"پرسیارێكمانكرد لە(كاك ئەحمەد)،و كاك ئەحمەد (ئاوای فەرموو)".

دوایی هەروەك ئەوەی ئیهانەم پێكردبێت خەتی هێنابوو بەژێر وشەی(ئاوای فەرموو).

فەرمووبووی"خودت فەرمودی"-خۆت ووتت-. جا ئەو(خودتە) لە كوردیا، كاتێك ئیهانەیەك بەكەسێك دەكەی ئێژی(خۆت)، ئەویش وەلامت دەداتەوە، یانی(فەرمودە)ی بەتەوهین زانی بوو....

دەی ئیتر خاس، ئەو وەختە ئەزانین(إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ) لەوتەو لەكردەوا بەتەواوی وجودۆ ئاشكرابوو. ئەیوت من هیچم، من یەكێكم لە موسولمانان.

(........دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحاً وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ)....

هەركەسێ ئەم(سێ وەصفیە)هەبوو، ئەوكاتە باشترین وتەشی دەبێت((وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِّمَّن دَعَا إِلَى اللَّهِ).

كێ لەهەرچی كەسە قسەی باشترە؟

كەسێ كە:



یەك/ بانگەواز(إِلَى اللَّهِ)بێ.

دوو/ (وَعَمِلَ صَالِحاً).

سێ/ (وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ).

ئەگەر وابوو ئیتر(الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ.....)) لەئەمیش و لە دیگەرانیش وەلێ ، فیتبعون احسن....

دەی خوا ئەیزانێ بەئەحسەن ئەقوالمان زانی، بۆیە شوێنیکەوتین و ئەحسەن ئەقوال. بەلاّم شوێنکەوتنێك شوێنکەوتنە لەسەر دەستوری قورئان بێت. وا تەصەور مەکەن ئەم شوێنکەوتنە هەروا پێخۆشبوونێکە، نەوەلاّ شوێنکەوتنێکە شەرعەن واجبە بەشارەتی ئیلاهی لەسەرە، وەعدەی بەهرەمەند بوون لەهیدایەت صاحیبی(لُب) بوون بەم شەرتە مەترەحە لەجامیعەی ئێما، بۆیە هاوڕێی بوون، بۆیە ئومێدمان هەس ئینشا الله هاوڕێ بین، لەقیامەتیشا ئینشا الله هاو مەسیرو هاوڕێ بین، بە ئیزنی خوا.

## پەیوەندی نێوان، ئیخوان موسلیمین و کاك ئەحمەدی موفتی زادە و مامۆستا ناصری سوبحانی





قسەکردن لەم بارەیەوە لە بابەتە ئاڵۆز و (ئاو کێشەکانە)، چ لەڕووی مێژووییەوە، چ لەڕووی کارو چالاکی و بنەمای فیکریەوە، بۆیە ئێمە لێرەدا هەوڵنادەین قسە لەبارەی مێژوو و وردەکاری دروست بوونی(ئیخوان موسلمین)ەوە بکەین لەئێران، ئەوەی گرنگە لێرەدا هەوڵدەدەین تیشکێك بخەینە سەرچۆنییەتی پەیوەندی و مامەڵەی(کاك ئەحمەد) لەگەڵ بزوتنەوەیەکی وەك(ئیخوان)دا، کەیەکێکە لەبزوتنەوە فراوان و فرە لایەنگرەکانی جیهان، بەپێی وتەی(یوسف نداء)* ئێستا لەجیهاندا(١٠٠ملیۆن) لایەنگری لە(٧٢) وڵاتی

---

*) ناوی تەواوی یوسف مصطفی علی نەدایە، لە ئەسکەندەرییە لە ساڵی ١٩٣١ لەدایك بووە، بازرگانێکی مصرییە و مفوظي پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکانی کۆمەڵی ئیخوان (مسلمینە). لە ساڵی (١٩٤٨) ەوە. لایەنگری کۆمەڵی ئیخوان موسلمینە ئەو کاتە تەمەنی ١٧ساڵان بووە لە سەرەتای ساڵەکانی(٥٠)دا لەناوچەی (سوێس) لەدژی بەریتانییەکان جەنگاوە، لەگەڵ زۆرێك لە ئیخوان موسلمیندا دەستگیرکراوە، دوای ئەوەی تۆمەتبار کراون بە هەوڵدان بۆ تیرۆرکردنی(جەمال عبدالناصر) لە مەیدانی مەنشیە لە ئەسکەندەریە لە ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩٥٦) دا ئازاد کراوە. دوای دەرچوونی لە زیندان چالاکیە بازرگانییەکانی دەست پێکردووە.

خوێندنی زانکۆی لە کۆلێژی کشتوکاڵی زانکۆی ئەسکەندەرییە تەواو کردووە..یوسف ندا هەڵگری ڕەگەزنامەی ئیتالیە و لە سەردەمی سەرۆك (حەبیب بورقیبە)ی هاوڕێی ڕەگەزنامەی تونسی وەرگرتووە. لە مانگی ٨ ی ساڵی ١٩٦٠ ندا بڕیاری کۆچکردنی داوە سەرەتا چووە لیبیا و پاشان چووە (ئەمسا). چالاکییە بازرگانییەکانی لە نێوان ئەو دوو وڵاتەدا بەرفراوان کرد هەتا لە کۆتایی (١٩٦٠) دا نازناوی(پاشای ئەحمەد)ی لە ناوچەی دەریای ناوەڕاستدا پێ درا.

تا ئێستاش لە(کابیۆنا)ی ئیتالیا دەژی. یوسف ندا وەك کەسایەتیەکی دور لە چاوی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن ماوەتەوە تا کاتێك لە ١٧/نۆڤەمبەی/٢٠٠١ دا (جۆرج بۆشی کوڕ) خۆی و دامەزراوەکەی بەوە وەسفکرد کە پشگیری تیرۆر دەکەن.لەو کاتەوە(نداء) لەهەمرو دونیاوە چاوی لەسەرە. لەدوای قسەکەی( جۆج بۆش)ەوە دەسەڵاتدارانی (سویسرا و ئیتالیا – CIA-لێکۆڵینەوەی فیدراڵی ئەمریکی و(١٢)دەوڵەتی دیکە لەم کارەدا پشتگیرییانکرد و هەستان بە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەکی چڕو پڕ لەو بارەیەوە، بەڵام هیچی لەسەر ساغ نەبوویەوە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن بە پیاوێکی (نارون نامظ) ناوزەندی دەکرد ئەو تەنها بازرگانێکی بەناوبانگ



جیاوازدا هەیە[1]، ئەمەش بۆ خۆی ژمارەیەكی زۆرەو مانای بوونی پێگەیەكی تایبەتە، هەروەها یەكلایكردنەوەی ئەوەی(كاك ئەحمەد) سەربە(ئیخوان موسلیمین) بووەو دەكرێت بەئەندامی ئەو حیزبە ئەژمارد بكرێت؟ دواجاریش قسەكردنێكی كورت دەربارەی ئەو پەیوەندیەی لەنێوان(شەهید مامۆستا ناصری سوبحانی*)و(كاك ئەحمە)دا هەبووە.

بەجۆرێك لەجۆرەكان، هەموو سەرچاوەكان كۆكن لەسەر ئەوەی سەرەتای سەرهەڵدانی(حركە ئیخوان موسلیمین) (بزوتنەوەی برایانی موسوڵمان) لەئێران بەگشتی و كوردستان بەتایبەتی دەگەڕێتەوە بۆ كۆتایی ساڵی حەفتاكان(١٩٧٩)، هۆكاری گواستنەوەی ئەم(تۆوە)ش. لەئەنجامی ئاوارەبوونی دەیان كەس لە

---

و سەرۆكی بانقی تەقوانییە كە سەرۆكی ئەمریكا بە پشتگیركردنی تیرۆر ناوی دەبەن، بەڵكو لە ماوەی ٢٥ ساڵی ڕابردووا ڕۆڵێكی گرنگی بینیوە لەناوكۆمەڵەی ئیخوان موسلمیندا، ئەو ڕێكخەرەی پەیوەندیەكانی نێوان ئیخوان و شۆڕشی ئێران بووە، هەروەها ئەڵقەی پەیوەندی نێوان (سعودیە — یەمەن. سعودیە — ئێران) بووە. هەوڵێكی لەتوانا بەدەریدا بۆ چارەسەركردنی كێشەی نێوان حوكمەتی جەزائیر و بەرەی ڕزگاری جەزائیر)، هەروەها ڕۆڵی هەبووە لە (تونس و عێراق و توركیا و كوردستان و مالیزیا و ئەندۆنیزیا). دەسەڵاتدارانی میصر لە ٢٠٠٨ بە شێوەیەكی ئاناماده حوكمی (١٠ ساڵ) زیندانیان بەسەردا سەپاند، دوای ئەوەی (حوسنی موبارەك) بابەتەكەی ناردە دادگایی سەبارەت لەگەڵ (٤٠) لە سەركردەكانی ئیخوان موسلمین لە (میصر).سەرچاوە WWW.GOOGLE.COM

[1]) یوسف نداو، احصاوات عن الئیخوان،یوسف نداو فی حوار مع جزیره،المصری الیوم(الحلقة الثالثة)،www.wikipedia.org.

*) خوێنەر دەتوانێت بۆ وەرگرتنی زانیاری دەربارەی ژیانی(شەهید مامۆستا ناصری سوبحانی) بگەڕێتەوە بۆ كتێبی(شەهیدی بیرو رای ئازادی)، كە دەزگای(بەرهەم)بۆ بەرهەمەكانی (ناصری سوبحانی) بڵاویكردۆتەوە. بۆ زانیاری دەربارەی لایەنی فیكری وبلیمەتی ئەو پیاوە سەردانی هەموو ئەو(كاسێت و سیدی)ە بكرێت، كەئێستا لە زۆرێك لە تۆمارگاكاندا بوونیان هەیە، یاخود كتێبی(دوایینەكانی) بەڕێز(مامۆستا تەحسین حمە غەریب) بخوێنرێتەوە...





ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە لەوڵاتی(میصر)ەوە بەهۆی ڕژێمی تۆتالیتارو چەپی (جەمال عبد الناصر)، هەروەها بەهۆی ئەو قوتابیانەی بۆ خوێندنی زانستە شەرعیەکان دەچوونە(میصر)و پاشان دەگەڕانەوە ناوچەکانی خۆیان بۆ نمونە، "-ئیخوان-بەهۆی(ئەحمەد زەهاوی و شێخ محمد سەوواف)ەوە هاتە(عێراق)و (کوردستانی باشور) و لەوێشەوە لە ڕێگەی چەند(فەقێ)یەکی (مەریوان و پاوە)یی کەلەکۆتایی شەست و حەفتاکاندا لەوێ دەیانخوێند، هاتە کوردستانی ئێران"[1].

دوای گواستنەوەی فیکری ئیخوان بۆ کوردستانی ڕۆژهەڵات لەوێ(مامۆستا ناصری سوبحانی) وەك کەسی یەکەمی ئیخوان دەردەکەوێت، بەڵام پێش دەرکەوتنی ناوێك بەناوی(ئیخوان)ەوە هەموو ئەوانەی دواتر وەك(کۆمەڵەی دەعوەو ئیصلاح) دەرکەوتن و درێژەیان بەکاری خۆیاندا، لەژێر چەتری(مەدرەسەی قورئان و دواتر مەکتەب قورئان)دا، بەسەرپەرشتی خودی(کاك ئەحمەد) کار و چالاکییەکانیان ئەنجامدەدا". ئەو چەند کەسە ئیخوانەی هاتنەوە بۆ کوردستانی ڕۆژهەڵات، لەگەڵ کەسایەتی سرنج ڕاکێشی(کاك ئەحمەد) ئاشنا دەبن و بەپاراستنی شوناسی فیکری خۆیانەوە و هاوڕێ لەگەڵ(کاك ئەحمەد) دەستدەکەن بە وانەوتنەوە لە(مەدرەسەی قورئانی مەریوان)دا و (کاك ئەحمەد)، ڕێزێکی زۆریان لێدەگرێت و ئەوانیش(کاك ئەحمەد)یان لەلا زۆر گەورە دەبێت"[2].

(کاك حەسەنی ئەمینی)یش، دەربارەی بوونی ئەندامان و لایەنگرانی(ئیخوان موسلیمین) لەڕیزی قوتابیانی(مەدرەسەو مەکتەب قورئان)دا،بەم شێوەیە دەدوێت

---

[1]) بارام صەفی زادە. ئیخوانەکانی ئێران گەورە لە دیموکرات و کۆمەڵە و ئەوانی دیکە دەبنە گۆڤاری (ئیسلام پۆست). ژ. ٧. ساڵی ٢٠٠٩، ل ١٨.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

"برێك لە هاوڕێیان لەو كاتەدا بەیعەتییان بە(ئیخوان) دابوو، بەڵام بەهەرحاڵ، ئەوكاتە جوڵەی(ئیخوان) لە كوردستانی ئێران زۆر چالاك نەبوو تـابتوانن سەربەخۆ كاربكەن، هەربۆیە ئەو برادەرانە بەشێوەی سەربەخۆیی و جیاجیایی كاریان نەدەكرد، ئەگەر پەیمانیشیان بە(ئیخوان) دابێت تەنها بەشێوەی(بەیعەت) پایەدار بوو، چونكە زەمینەیەك بۆ چالاكی دینی لەكوردستانی ڕۆژهەڵات وجودی نەبوو تا كەسانێك بێن لەو زەمینەیەدا كاربكەن، هەرچی كە پێویستبوو تـا كەسێكی موسوڵمان، یان بزاوتێكی دینی ئەنجامی بدات لە(كاك ئەحمەد)و بزاوتەكەیدا هەبوو.

بەهۆی ئەم دەلیلەوە هەركەسێك لەگەڵ هەر حیزب و كۆمەڵێكدا بوون دەهاتن لەگەڵ(كاك ئەحمەد) كاریاندەكرد، ئەو برادەرانەش-ئیخوانییەكان-بەشێوەی مامۆستاو هەندێكجار گوێگر لە دەرسەكانی ئێمەدا بەشدارییان دەكرد. لەناو كۆمەڵەی ئێمەدا ئامادە بوون‌و هەندێكجار دەبوونە ئەندامی شورا-(وەك مامۆستا ناصری سوبحانی(بە پاراستنی شوناسی جەمعی خۆی) هەزار ڕۆژی تەواو سەرپەرشتیاری لەئەستۆدا بوو"[1]. -دیارە دوای دەستگیركردنی(كاك ئەحمەد) لەلایەن ئێرانەوە-، هەروەها ئەوانیش خۆیان لەئێمە بەجیاواز نەدەزانی، بەلای (كاك ئەحمەد)ەوە هەموو موسوڵمانان و بیركردنەوەی ئەوان عەزیز و بەڕێز بوون، بەهیچ شێوەیەك جیاكردنەوە بوونی نەبوو، برادەرانی(ئیخوان) سەركردە پێشینەكانی ئیخوانیان بەچی ئەندازەیەك خۆشبوێستایە(كاك ئەحمەد)یشیان بەو ئەندازە خۆشەویست، چونكە(كاك ئەحمەد) شتێكی نەدەوت بەپێچەوانەی زەوقی

---

[1] بارام صەفی زادە: ئیخوانەكانی ئێران گرەو لە دیكرات و كۆمەڵەو ئەوانی تر دەبەنەوە ،!! گۆڤاری ئیسلام پۆست ، ژمارە حەوت ، ئایاری ۲۰۰۹.ل ۱۹-۱۸.





ئەوان بێت. لەكاتی دانیشتنەكانیشماندا ئەو برادەرانە خۆیان ئاشكرادەكرد دەیانوت(لەگەڵ ئیخوان بەیعەتمان كردووە). تا ئاستێك هەندێك لەوان پێشنیاریان دەكرد بەیعەتی خۆیان بشكێنن و بێن لەگەڵ(مكتب قران) و (كاك ئەحمەد) بەیعەت ببەستن، بەڵام(كاك ئەحمەد) قبوڵی نەدەكرد و دەیوت"لەسەر بەیعەتەكەی خۆتان بمێننەوە ئێمەو ئێوە لەگەڵ یەكتردا كار و چالاكی دینی خۆمان دەكەین"[1].

پێویستە لێرەدا ئاماژە بە ڕۆڵی(ئیخوانی كوردستانی باشور) بكرێت لەگەڵ كارو چالاكیەكانیان لەگەڵ ئیخوانی ڕۆژهەڵاتدا،و هەروەها پەیوەندی(كاك ئەحمەد)یش لەگەڵ ئەماندا. (بورهان محمد ئەمین)، كەبە(بورهانی ئەمینی) ناسراوە، یەكێكە لەئیخوانەكانی(كوردستانی باشور).كەڕێی دەكەوێتە ئێران و لەوێ بە(كاك ئەحمەد) ئاشنادەبێت و بۆ ماوەیەكی زۆر لەلای ئەوان دەمێنێتەوە، (مامۆستا بورهان) لەبارەی چۆنییەتی و هۆكاری ڕێكەوتنە كوردستانی ئێرانەوە بەم شێوەیە دەیگێڕێتەوە"پایزی ساڵی ١٩٧٩ بوو، لێرە(كوردستانی عێراق) وەزعمان لێ تەنگ بوویەوە، بەتایبەتی ترسی ئەوە هەبوو، كەئیحتیماله لەلایەن دام و دەزگای بەعسیەوە بگیرێین و ببرێین بۆ لێكۆڵینەوە. دوای مەشورەت و ڕاگۆڕینەوەیەك لەسەر ئەوە ڕێكەوتین من سەفەر بكەم بۆ ئێران، دوو نامەیان نوسی یەكێكیان بۆ برایەك كەلە(مەریوان)بوو،ئەوەی دیكەیان بۆ جەنابی(كاك ئەحمەد) منیش كەگەیشتمە (مەریوان) ئەو كۆمەڵەی سەر بە(كاك ئەحمەد) بوون، مەدرەسەی قورئان بوون و هەندێكیان سەر بەمەدرەسەی ئیخوان بوون، خەریكی كاركردن بوون، كەگەشتمە ئەوێ پاش ماوەیەك پێموتن، حەز دەكەم دەورێك ببینم و خزمەتی ئەم خەڵكە بكەم، وتم چۆنە من (ئیدارەی) مەدرەسە بكەم؟ زۆریان پێخۆش بوو، جارێكماندا

[1]) كاك حەسەنی ئەمینی: یاد ایام....(چاوپێكەوتن)،گۆڤاری راه ما،ژ.٩ بەخشی نۆ، ل ٢٥-٢٤.

لەڕادێوی مەریوانەوە، وتمان ئەوانەی پێیانخۆشە بەشداری بكەن -لە مەدرەسەی قورئاندا بۆ قورئان خوێندن- لەرۆژی شەممەوە پۆل دەكەینەوە، كەسوپاس بۆ خوا ژمارەیەكی زۆر بەشداری لەگەڵماندا كرد، تا ئەو كاتە هەر لە(مەریوان) بووم و (كاك ئەحمەد)، لەبەرئەوەی خوێنی نەڕژێت و میللەتی كورد سەرگەردان نەبێت، بڕیاریدا(سنە) بەجێبهێلێت و بڕواتە(كرماشان)، كەچووە(كرماشان)، ئێمەش لەگەڵ كۆمەڵێك برا، چوینە(كرماشان) سەردانمانكرد لەماڵێكی گەورەی كۆندا بوو، كەدەیانوت ماڵی جولەكە بووە، لەوێ بەخێرهاتنێكی گەرمی كردین،و پاشان نامەكەم پێداو دوای خوێندنەوەی دووبارە رێزێكی زۆری بۆ دەربڕین"[1]،و وتی "لە ئەیامێكی پڕ لە تقلباتی سەیردا هاتون. إنشاالله بەخێر و سەربەرزی هەموو لایەك دەیگوزەرێنین"[2]. بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین یەكەم پەیوەندی نێوان (ئیخوان موسلیمینی كوردستانی عێراق و كاك ئەحمەدی موفتی زادە) دروست بوو، هەروەك ئاماژەی بۆ كراو(مامۆستا بورهان)یش باسی دەكات،(كاك ئەحمەد) بەبێ بوونی هیچ كێشە و گرفتێك پەیوەندییەكی زۆر تەندروست و قوڵ و فراوانی لەگەڵ ئەو برادەرانەدا دروست دەكات و كار دەگاتە ئەوەی رەزامەندی دەردەبڕێت، كەسێكی وەك(مامۆستابورهان)وانەی(تەفسیری قورئان)بەقوتابیەكانی(كاك ئەحمەد) بڵێتەوە، ئەمە جگەلەوەی بە درێژای ئەوكاتەی لە ئێراندا دەبن و(كاك ئەحمەد) خۆی دەستگیر نە كراوە. (مامۆستا بورهانی ئەمینی) لەو ماڵەدا كەدەبێت خودی

---

[1]) چاوپێكەوتن، لەگەڵ مامۆستابورهانی امینی، هاوڕێی كاك ئەحمەدی موفتی زادە، دەربارەی پەیوەندی خۆی بە كاك ئەحمەدەوە ، مانگی دووی ٢٠٠٩.

[2]) بورهان محمد ئەمین، كاك ئەحمەد دڵسۆزی كورد و كوردستان، گۆ. پەیامی ڕاستی .ژ. ٧٩ بەهاری ٢٠٠٧. ل٣٧.

(كاك ئەحمەد) تێیدا دەژی و بۆ ماوەیەكی دوور و درێژ لە نزیك یەكەوە ژیان دەگوزەرێنن"[1].

دەبینین ئەم پەیوەندییە توند و تۆڵەی بەردەوام دەبێت، تـا كاتێك"گیروگرفتەكانی ناوخۆی(مەكتب قورئان) ڕەهەندێكی ئالۆزتریان پەیداكرد، (كاك ناسر)و باقی هاوڕێیانی لە(شورای مەكتەب) هاتنە دەرەوە و ئیخوانەكانی ڕۆژهەلات لەسالّی (١٣٦٤) وە بە شێوەیەكی سەربەخۆ و بەرێخستنێكی نوێ و بەرێبەرایەتیەكی نوێ كار و تێكۆشانی خۆی لەپێشدا كوردستان، پاشان لە هەموو ناوچەی ئێران كەسونێی لێیە درێژە پێدا"[2].

ئیخوانەكانی ئێران،هەموویان لەژێرناوی(كۆمەڵەی دەعوە و ئیصلاح)دا كۆدەبنەوە، پەیوەندیەكی پتەویان لەگەڵ ئەمینداری گشتی یەكگرتووی ئیسلامی كوردستان (مامۆستا صەلاحەدین محەمەد بەهادین)دا هەیە، بەپێی ئەو زانیاریانەی پێگەی(wikipedia) لەسەر زاری(مامۆستا عەبدول عەزیز سلیمی)ەوە بلاّوی كردۆتەوە، دەڵێت": (مامۆستا صەلاحەدین محەمەد بەهادین) لەپیاوە گەورەكانی بواری دەعوەیە لەئێران و پیاوێكی زاهید و مورشیدێكی ڕۆحانی دەعوەی ئیسلامی بووە. دوای ئەوە سالّی(١٩٩١) دەگەڕێتەوە كوردستانی عێراق. ڕێكخستنی دەعوەی ئێرانی دەدرێتە دەست كۆمەڵێك لە پیاوان و ناودارترینیان لەوانە:

١.عەبدول ڕەحمان بیّرانی، ئەمیری گشتی كۆمەڵەكەیە.

---

[1]) چاوپێكەوتن، لەگەڵ مامۆستابورهانی امینی، هاوڕێی كاك ئەحمەدی موفتی زادە، دەربارەی پەیوەندی خۆی بە كاك ئەحمەدەوە ، مانگی دووی ٢٠٠٩.

[2]) بارام صەفی زادە: ئیخوانەكانی ئێران گرەو لە دیكرات و كۆمەڵەو ئەوانی تر دەبەنەوە ،!! گۆڤاری ئیسلام پۆست ، ژمارە حەوت ، ئاياری ٢٠٠٩.ل ١٩

٢.ئیبراهیم مردوخی، لە پارێزگای کوردستان.

٣. عەبدول واحید شکر زهی، لە پارێزگای سیتان و بلوجستان.

٤. شێخ درزند، لە پارێزگای هورمزگان لە باشوری ئێران.

٥. عەبدول رەحیم خورشید، لە پارێزگای ئازربایجان.

٦. عەبدول عەبیز سلیمی، لە پارێزگای کرماشان.

ئەم کۆمەڵەیە تا ئێستاش لەکارەکانیان بەردەوامن و دوای هاتنە سەرکاری ریفۆرمخوازان بەسەرۆکایەتی(سەید محەمەد خاتەمی) لە(٢ی جۆزەردانی ١٣٧٦). هاورێ بوو لەگەڵ کرانەوی زیاتری کەش و هەوای سیاسی ئێران، لەوکاتەدا گەڵاڵەو پەیرە و پرۆگرامی ناوخۆی جەماعەت پێشکەش بە(وەزارەتی ناوخۆی ئێران)کراو داوای بەفەرمی بوونی یاسایی و تێکۆشانی تابلۆداریان وەکو جەماعەتێکی (فەرهەنگی سیاسی- قانونی) لەحوکمەتی ئیستلاح تەڵەبەکانکرد، بەڵام بەداخەوە تا ئیستا ئەو داوایە بێ وەڵام ماوەتەوە"[١].

لەراستیدا جگە لەو پەیوەندیەی لە نێوان(ئیخوان)ی ئێرانو (کاك ئەحمەد)دا هەبووە، لەماوەیەکدا پەیوەندی(ئیخوان) بە(موفتی زادە)وە دەگاتە پەیوەندی لەسەر ئاستی ئیخوانی عالەمی، (ئیخوان موسلمین) لەرێگەی(پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە) پەیوەندی بە(کاك ئەحمەد)ەوە دەکەنو لەگەڵی دادەنیشن، هەموو ئەم زانیاریانەش لەو چاوپێکەوتنەدا باسکرا. بەناونیشانی(شاهد علی العصر) لە، (٢٠٠٢/٨/١١)، (کەناڵی ئەلجەزیرە) بەرپرسی هەموو پەیوەندیەکانی (ئیخوان موسلمین)و (یوسف نداء) سازیکرد، کەلە چاوپێکەوتنێکی چڕوپڕی (٨ زنجیرە)یدا لەشێوەی پرسیار و وەڵامدا باس لەگرنگی و پەیوەندی ئیخوان

---

[١]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٠





بە(كاك ئەحمەد)ەوە دەكات. ئێمە هەوڵدەدەین لێرەدا ئەو بەشەی چاوپێكەوتنەكە، كەقسەكردنە لەسەر(كاك ئەحمەد) دابەزێنین، وەك بەڵگەیەكی مێژوویی دواتر قسە لەسەر ئەو خاڵەبكەین، كە(یوسف نداء) لە بارەی(ئیخوان)بوونی (موفتی زادە)وە باسی دەكات.

دیارە ئەم بابەتە لە زنجیرەی(دووەم)ی بەرنامەكەوە دەستپێدەكات[1]:

ئەحمەد منصور[*]: ئەحمەدی موفتی زادە یەكێكە لە سەركردە سوننییەكان.

یوسف نداء: خوا لێی خۆش بێت، تۆ بابەتێكت وروژاند لەگرنگترین ئەو بابەتانەی ئێرانە ئازارمدەدات .

ئەحمەد مەنصور: من هێشتا هیچ پرسیارێكم نەكردووە.

یوسف نداء: ناوت هێنا خوا لێی خۆشبێت. چونكە چیرۆكەكەی زۆر خوێناوییە.

ئەحمەد مەنصور: دەیناسی؟

یوسف نداء: دەیناسم، لە نزیكەوە دەیناسم. هەتا سەردانەكەشم بۆ لای(ئەحمەدی موفتی زادە) و كۆمەڵەكەی بوو.

ئەحمەد منصور: كەی ناسیوتە...؟ پێش شۆڕش یان دوای شۆڕش؟

یوسف نداء: لەرۆژانی شۆڕشدا، كۆمەڵەكەی كوردبوون، ئەو كاتە كوردەكان بڵاوبوون و تا ئێستاش هەر بڵاون. ڕاستڕەو شیوعی و كافر و ئیسلام لە ناویاندا هەبووە.

ئەحمەد منصور: ئەحمەدی موفتی زادە لە عەرەبە سوننەكانی ئێران بوو؟

---

[1] احمد منصور. شاهد علي العصر(العلاقات الدولية الأخوان كما يرا يوسف نداء. قناة الجزة. ۲۰۰۸/۸/۱۱ حلقة الثاني.

[*]) پێشكەشكاری بەرنامەی(شاهد علی العصر)لە كەناڵی ئاسمانی(الجیرە).

یوسف نداء: نەخێر.(ئەحمەدی موفتی زادە) لەکوردەکانی ئێرانە شوێنی لە(کرماشان) بوو.

ئەحمەدمنصور: لە خۆراسان بووە یان لە کرماشان؟ ببورە.

یوسف نداء: ئێمە کە سەردانمانکرد لە کرماشان بوو، کاتێك سەردانمانکرد کێشەکە ئەوە بوو یارمەتی شۆڕشی دەدا، لەگەڵ ئەوەی شۆڕش مۆرکێکی ئیسلامی هەبوو، کوردە ڕاستڕەوەکان و شوعییەکان بەشێکی زۆریان پێکهێنابوو کەلەلایەن ڕوسیاوە پشتگیری دەکران لە دژایەتی کردنیان لەگەڵ(شاه)دا...

ئەحمەد منصور: پێش ئەمە ناسیبووت یان دوای ئەمە؟

یوسف نداء: نەخێر. لەوکاتەدا ناسیم.

ئەحمەد منصور: چۆن بینیت؟

یوسف نداء: لەچیرۆکێکدا بۆت دەگێڕمەوە، کاتێك کێشە ڕوویدا لەنێوان (موفتی زادە) و حوکمەتدا. ئەو کاتە (ئەبو حەسەن بن صەدر) سەرۆك کۆمار بوو، لەگەڵ (بنی صدر) ڕێکەوتین. پێمانوتن لەبەرژەوەندی نییە ئێمە واز لە باڵی ئیسلامی بهێنین و شوعیەکان کەلێرە نین زاڵبن بەسەریاندا. ئەو دەوڵەتانەی وا دادەنرا یارمەتی شۆڕشی ئیسلامیان دابێت، بۆیە پێویستە شۆڕشی ئیسلامی بیانپارێزێت، مۆڵەتمان لێوەرگرت و چوین بۆ کرماشان، لەکرماشان چاومان پێی کەوت ئەو پیاوە-کاك ئەحمەد-وتی. من داواکاریم هەیە. من شەرمەزاربووم.

ئەحمەد منصور: گرنگترین داواکارییەکانی چی بوون؟

یوسف نداء: ئەو خۆی شاردبوویەوە. واتە کاتێك ئێمە چووین....

ئەحمەد منصور: قسەتان لەگەڵ کردوو ئەو خۆی شاردبوویەوە...؟

یوسف نداء: ئەو دیارنەبوو. لەبەر ئەوە...




ئەحمەد منصور: ئەو خۆی لەکێ شاردبوویەوە؟ لەحوکمەت یان....

یوسف نداء: لە هەردووکیان، لە هەڕەشەی شوعیەکان و لەحوکمەت.

ئەحمەد منصور: باشە، چۆن مۆڵەتت وەرگرت؟ چۆن مۆڵەتت لە(ئەبو حەسەن بەنی صەدر) وەرگرت، بۆئەوەی چاو پێکەوتن لەگەڵ پیاوێکی موختەفی بکەیت؟

یوسف نداء: لە بەرژەوەندی خۆی بوو-حوکمەتی ئێراني-.

ئەحمەد منصور: ئێوە چۆن توانیتان لەو ئاڵۆزیەدا ئەو پەیوەندیەتان دروستکرد؟

یوسف نداء: ئەرکێکی شەرعیمان بوو.

ئەحمەد منصور: من لە ڕووی شەرعییەوە ناڵێم.

یوسف نداء: من لە دیدگایەکی شەرعییەوە کار دەکەم..

ئەحمەد منصور: من لایەنی شەرعی دەزانم، بەڵام ئەم لایەنە کەسێکی دەوێت توانای هەبێت بەکاری بهێنێت بە شێوەیەك لە شێوەکان.

یوسف نداء: نەخێر، ئەو توانایی هەبوو لەسەر بەرگەگرتنی لە ناخۆشییەکان و ترسەکان.

ئەحمەد منصور: لەکاتێکدا هەموو دەوڵەتەکان توانایان نەبوو بێنە ناو ئەو بارە ئاڵۆزەوە، تۆ چۆن توانیت داغڵی ئەو بارەببیت و تەحەمولی بکەیت؟

یوسف نداء: ناتوانیت....باوادابنێین، هەروەها تا سنوری تواناکانی خۆمان دەڕۆین. ناتوانیت بڵێن پێت وەك دەوڵەتێك کاربکە، پەیوەندییە شەخصییەکانمان یارمەتی دەدایین ئەو کارانە بکەین. ئەوەی یارمەتی(بەنی صەدری) دەدا بۆ کارو باری کوردی لەئەمریکا دادەنیشت و کورد بوو پەیوەندیمان لە نێواندا هەبوو.

ئەحمەد منصور: سوننی بوو؟

یوسف نداء: بەڵێ. سوننی بوو، ناوی (بارتۆما) بوو (موزەفەر پارتۆما).





ئەحمەد منصور: تا ئیستاش لە ئێران دەژی؟

یوسف نداء: نەخێر. ئەو ئێستا لەئەمەریكایە و ئەمەریكیشە، تۆ داوام لێدەكەیت ئاماژە بە هەندێك ناو بكەم. ئەمەش دەبێتە ماڵ وێران كردنیان. خوا بیانپارێزێ.

ئەحمەد منصور: ئینشاالله واناب‌ێ.

یوسف نداء: خوا بیانپارێزێ، (پارتۆما) توانی بڕوات، لەبەرئەوەی ئەمان چاوەڕێیاندەكرد، ئەو پیاوی حوكمەتە، ئێمەش لە ڕێگەی پەیوەندی تایبەتەوە، كەچاوەڕێیان دەكردین بردینیان بۆ ئەو شوێنەی كە ئەو خۆی لێ حەشاردابوو.

ئەحمەد منصور: كێ پێشوازی لێ كردن؟

یوسف نداء: كۆمەڵەی براماں(ئەحمەدی موفتی زادە) خوا لێی خۆشبێ.

ئەحمەد منصور: واتە ئێوە لەپشتی حوكمەتی ئێرانەوە پەیوەندتان پێوەی كردبوو؟

یوسف نداو: نەخێر، حوكمەت دەیزانی پەیوەندییان پێوە دەكەین...بەڵام چۆن؟

ئەحمەد منصور: ئەگەر حوكمەت بیویستایە بیگرێت، دەیتوانی شوێن پێتان هەڵبگرێت؟

یوسف نداء: نا...نا..ئەوان لەو كاتەدا پێداگربوون، چونكە شوعییەكان هەڵگەڕانەوە، پێداگربوون لەسەر ئەوەی تێگەیشتن لە نێوانیاندا هەبێت.

ئەحمەد منصور: ئێوە هەڵدەستان بەگێڕانی ئەو ڕۆڵە؟

یوسف نداء: بەڵێ.

ئەحمەد منصور: واتە، ئێستا دەتوانین بڵێین، سەردانەكەی تۆ بۆ لای(موفتی زادە) زیاتر لە چەند ئامانجێكی هەبوو، یەكێكیان ئەوەیە تۆ دەتویست پەیوەندییەك لەنێوان ئەو و حوكمەتی ئێراندا دروست بكەیت؟

یوسف نداء: نەخێر، من دەمویست سوننەی ئێران بپارێزم.

ئەحمەد منصور. چۆن، ئەوەمان بۆ ڕوونبكەرەوە.

یوسف نداء: چونكە هەندێك لەشوعییەكان هەبوون، هەتا لەناو حوكمەتی ئیسلامیدا چالاكیەكان هەبوو، بەڵام بەناوی ئیسلامەوە، تەفرەقەیان لەناو شۆڕشدادەنایەوە، شۆڕش هەموو شتێكی تێدابوو، ئێمە یان...

ئەحمەد منصور: لەكوێ خۆی شاردبوویەوە؟ لە شاخەكان، یان.....

یوسف نداء: لە كرماشان.

ئەحمەد منصور: لە شاخ، لەماڵ لە...؟

یوسف نداء: نا... لە ماڵدا بوو...

ئەحمەد منصور: تۆ و كێ بوون؟

یوسف نداء: ئێمە كۆمەڵێك بووین. من (غالب)م لەگەڵدا بوو.

ئەحمەد منصور: لەهەموو پێویستیەكدا لەگەڵتا بوو؟

یوسف نداء: نەء...لە هەندێك شتدا لەگەڵمابوو. لەهەندێك شوێندا نە دەكرا هەردووكمان بڕۆین، پێویست بوو یەكێكمان ئاگای لەوی ترمان بێت، بەڵام لە هەندێك شوێندا هەردووكمان ئامادەی مردن بووین.

ئەحمەد منصور: خوانەكات ....فەرموو.

یوسف نداء: لەهەندێك شوێندا هیچ كاممان نە دەچووین، كەسێكی دیكەمان دەنارد.

ئەحمەد منصور: هەروەها....

یوسف نداء: بەڵێ. ئێمە هەردووكمان، ئێمە لەوكاتەدا هەموو شتێكمان بەكراوەی باسدەكرد، دوای ئەوەی هەموو شتێك تەواو بوو، نە مانتوانی شتێك بكەین.

ئەحمەد منصور: باشە.

یوسف نداء: دوای ئەوەی لەهەموو شوێنێكدا دەورە دراوین، نە مانتوانی بگەڕێین بەدوای خواردندا. دوای دوو هەفتە لەماڵەكە پرسیارمانكرد ویستیان شتبكڕن، من چووم بۆ بازاڕ. وتیان(پێنج كیلۆ) (ئارد)- لەكاتێكدا من(پێنج ملیۆن تەن) ئارد دەكرم، بەڵام لەو كاتەدا (پێنج كیلۆ)م كڕی.

ئەحمەد منصور: بگەڕێینەوە لای ئەحمەدی موفتی زادە.

یوسف نداء: بەڵێ.

ئەحمەد منصور: تۆ دەڵێیت چوم بۆلای؟

یوسف نداء: بەڵێ چووم. پێموت پێویستە تۆ هاوكاری حوكمەت بكەیت، ئەو كاتە هەوڵێك هەیە ئێمە بكەوینە نێوانتان. وتی من داواكاریم هەیە. پێشەكییەكەی ئەوەیە، ئەگەر داواكارییەكانت شتێك حەلبكرێت من هێزی خۆم دەخەمە كار.

ئەحمەد منصور: گرنگترین داواكاریەكانی چی بوون؟

یوسف نداء: داواكارییەكانی تێكەڵ بوون، ئێمە وەك (ئیخوان موسلمین)، هەردەم داواكاری ئیسلامان لەپێش داواكاری نەتەوەییەوە بووە، بەڵام ئەو داواكاری (نەتەوەی و ئیسلامی)شی، هەبوو.

ئەحمەد منصور: دەتوانیت بەكورتی داواكاریەكانیمان پێ بڵێیت. ئەوە دۆزێكی گرنگە، بابەتی(سوننە) لە ئێراندا تا ئێستاش شوێنی گومانە؟

یوسف نداء: یەكێك لەداواكارییە نەتەوەییەكانی(كرماشان) بوو، لەبەرئەوەی ناوچەیەكە(نەوتی) هەیە، ئەو دەیوت: بەشێك لەو نەوتەی لەلایەتی لەكرماشان بەكاری بهێنێت بۆ كوردەكان. بەسەر كوردەكان و بەسەر خوێندنگە و نەخۆشخانەو ڕێگا و بان و ئەو شتانەدا دابەشبكرێت.... ئەوان دەیان ووت: سەروەت و سامانی

وڵات هینی وڵاتە و پێویستە بەسەر وڵاتیشدا دابەشکرێت، نەك بەسەر ئەم ناوچەو ئەو ناوچەدا. نەك وەکو ئەو کۆمەڵەیەی لە (خۆزستان) بوون. دەیانوت، نەوت هینی خۆمانە و نابێت بدرێت بە ناوچەکانی دیکە، دۆزی دووەم، کەمافی خۆی بوو، ئەویش فێرکردنی(دینی) لەخوێندنگا سوننەکاندا، ئەو دەیووت: هەندێك لەپیاوە شیعەکان لە خوێندنگە(سونییەکاندا) وانە دەڵێنەوە ئەمە قبوڵناکرێت.

ئەحمەد منصور: واتە،ڕۆڵەکانی(سوننە) دەبێت ڕۆڵەکانی دیکەی(سوننە) فێربکات؟

یوسف نداء: بەڵێ، ئەو ئەمەی قبوڵ نە دەکرد و تێکەڵییەك هەبوو.

ئەحمەد منصور: نەخێر، جگە لەمانە داواکاری چی تری هەبوو؟

یوسف نداء: بابەتی مزگەوتی(تاران) بوو، دەیویست مزگەوتێکی(سوننە) لە (تاران) هەبێت، کە تا ئەو کاتەش هیچ مزگەوتێکی سوننەی تێدا نەبوو.

ئەحمەد منصور: تاران. تا ئێستاش مزگەوتێکی سوننەی لێ نییە.

یوسف نداء: تۆ باشتر دەزانیت. من زاکیرەم ناتوانێت وەڵامی هەموو پرسیارەکان زوو بداتەوە.

ئەحمەد منصور: ئینشاالله. بەڵام من لەوە لەگەڵتام چالاکم تێدایە، تائێستا هیچ مزگەوتێکی سوننە لەئێراندا نییە. ئەو ڕۆژە داوایاندەکرد.

یوسف نداء: بەڵێ.

ئەحمەد منصور: ئەحمەدی موفتی زادە نوێنەری ئیخوان بوو؟

یوسف نداء: بەڵێ. لەئیخوان بوو.

ئەحمەد منصور: دەتوانیت بڵێین لەئێران ئیخوان موسلمین هەبووە؟

یوسف نداء: بەڵێ، هیچ قسەیەکی لەسەر نییە، بەڵگە ئەویش.

ئەحمەد منصور: ڕێکخراو بوون؟

یوسف نداء: بەڵێ. هەتا کێشەشییان بۆ دروستکردن. جارێکیان پەیوەندییان پێوەکردم. وتیان چەند لێپرسراوێکی ئاسایش دەیانەوێت بتبینن. وتم با من چاوپێکەوتن لەگەڵ وەزارەتی دەرەوە بکەم، ئەمان منیان بانگکردووە، من پەیوەندیم بەوەزارەتی دەرەوە هەیە نەك ئاسایش.

یوسف نداء: بەدڵنیاییەوە.

ئەحمەد منصور: بگەڕێنەوە لای(موفتی زادە)و داواکارییەکانی، ئێمە تێگەیشتن لەوەی، کە (موفتی زادە) نوێنەری ئیخوان بووە لە ئێراندا ؟

یوسف نداء: خوا بیبەخشێت، گوناه بوو، ئێمە هەوڵماندا قەناعەتی پێ بکەین، هەتا خەریك بوو ئێمەش لەو سەردانەدا بکوژرێین.

ئەحمەد منصور: چۆن؟

یوسف نداو: دوای ئەوەی لەکارەکانمان بوینەوە، چوینەوە بۆ ئوتێل، بەیانی زوو فڕۆکەکەمان..

ئەحمەد منصور: ئوتێل لە کرماشان؟

یوسف نداء: لەکرماشان، شەو تا درەنگێك لەگەڵیدا ماینەوە، دواتر چوینەوە ئوتێل بخەوین، دوای(٥-١٠) دەقیقە، هەندێك چەکداری کۆمەڵەی ئەو(١٥)کەس دەبوون هاتن، وتیان لێرە مەمێننەوە پێویستە بتان بەین بۆ شوێنێکی ئارامتر، وتمان بۆ؟ "وتیان زانیومانە دەیانەوێت بتانکوژن." چوینە شوێنێکی دیکە تا بەیانی گەڕاینەوە.

ئەحمەد منصور: باشە، دەمەوێت بگەڕێینەوە سەر باسی داواکارییەکانی(ئەحمەدی موفتی زادە) تۆ تا ئێستا(سێ) داواکاریت پێ وتم، یەکێکیان بابەتی نەوت، بابەتی وتنەوەی وانە، بابەتی مزگەوتی سوننی لەتاران، داواکاری تری چی هەبوو؟





یوسف نداء: بابەتی زمانی کوردی، ڕێگەیان پێ بدەن هەندێك ڕادوێو تەلەفزیۆن دابمەزرێنن، واتە شتی نەتەوەییان تێکەڵ بەپێداویستیە ئیسلامییەکانکردبوو.

ئەحمەد منصور: واتە، هەموو کەمە نەتەوایەتییەك لەهەموو شوێنێك ئەم داواكاریانەی دەبێت.

یوسف نداء: بەڵێ.

ئەحمەد منصور: چی تر؟

یوسف نداو: لەوکاتەدا ئێرانییەکان گرنگترین شت لەمێشکیدا ئەوەبوو، ئێمە موسڵمانین، ئەوەی موسوڵمان لەیەکتری جیابکاتەوە ئەوەهەڵەیە، ئەوەی ئێرانییەکان لەیەکتری جیابکاتەوە ئەوە هەڵەیە، ئێمە بەدوای یەکێتیدا دەگەڕێین، لەگەڵ ئەم هەموو بانگەشە ئاشکرایانەدا لەشتەکاندا هەڵە هەبوو، واتە هیچ شتێك بێ هەڵە نابێت. ئێمە(تۆلێدانسمان)هەیە بۆ هەڵەکان. دەمانەوێت هەڵی مژینەوە نامانەوێت بیتەقێنینەوە.

ئەحمە منصورد: بەڵێ. ئێستا(ئەحمەدی موفتی زادە) گیراوە. چەند ساڵێکی لەسجن بەسەربرد.

یوسف نداء: گیرا.خستیانە زیندان.

ئەحمەد منصور: باشە تەواوی دەکەم*.

ئەحمەد منصور: لەبەرنامەی پێشودا لەسەر خاڵێکی گرنگ وەستاین(ئیخوان موسلیمین)، یان ئەهلی سوننە لەئێران و بەتایبەتی ڕێکخستنەکانی(ئیخوان

---

*) لێرە زنجیرەی دووەم لەبەرنامەکە تەواو بوو، زنجیرەی سێیەم لە (١٨|٨|٢٠٠٢) پەخشدەکرێتەوە و لەسەر چەند تەوەرەیەکی دیکە قسەدەکەن، لەنێوانیدا باس لە پەیوەندی تاران و(ئیخوان موسلیمین)وەزعی سوننە دەکرێت. لەوێشدا لەبارەی(موفتی زادە)وە قسەدەکرێت.





موسلیمین) لەئێران، هەروەها(ئەحمەدی موفتی زادە) سەركردەی(ئیخوان)لەوێ، ئەوەی كە چاوتێپێیكەوت و پاشان لەلایەن دەسەلاتدارانی ئێرانەوە دەستگیركرا، دوای دەرچوونی بەماوەیەكی كەم لە زیندان كۆچی دوایكرد.

چۆن دەسەلاتدارانی ئێران رێگە دەدەن بەدروستكردنی رێكخراوی (ئیخوان موسلیمین) كەپەیوەندی بەسەركردایەتی دەرەكییەوە هەیە، ئەو دەوڵەتێكە واخۆی دادەنێت، یان وابانگەشە دەكات دەوڵەتێكی ئیسلامییە؟

یوسف نداء: بەڕاستی ئەو بابەتە خاڵی لاوازییە. ئەم خاڵە لاوازەش تەنها لەئێراندا نییە. واتە دەكرێت هەموو دەوڵەتێك مافی ئەوەی بدرێتێ ترسی هەبێت لەهەر رێكخراوێك لەوڵاتەكەیدا، كەپەیوەندی بەرێكخراوێكی دەرەكییەوە هەبێت، بەلاّم ئەوان واڕاهاتون كە(ماسۆنییەت) لەهەموو شوێنێكدا ببینن، ڕاهاتون (ڕۆتاری)ببینن، وا ڕاهاتوون هەموو پێداویستییەكی گەورە ببینن كەبنەڕەتەكەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەمەریكاو غەیری ئەمەریكا، ئەم خاڵە لەماوەیەكی دوورو درێژدا لەلایەن ئیخوانەوە چارەكراوە، بەوەی هەموو رێكخراوە ئیخوانییەكان لەهەموو دەوڵەتەكاندا هەڵدەستن بەكاروباری خۆیان بەپێی ئەو بارودۆخەی لەو وڵاتەدا بوونی هەیەو ئەوانی تێدایە.

ئەحمەد منصور: ئایا ئەمە پەیوەندی نییە بەرێكخراوێكی دەوڵەتی، یان سەركردایەتییەكی بەكۆمەڵ، وەكو خۆت ئاماژەت بۆكرد؟

یوسف نداء: رێكەوتنی شتەكان پەیوەندی بەشتە ناوخۆییەكانەوە نییە، واتە بانگەوازێكی ئیسلامییە، وەك بانگەوازی ڕاست یان هەڵە، هیچ دەستكاری سیاسەتی دەوڵەت ناكات، ناوخۆیی بێت یان دەرەكی. هەرچی پەیوەندی بەئیسلامەوە هەبێت، وەكو ئیسلام، وەكو دین، وەكو بانگەواز، وەكو ئەمانە

پەیوەندی هەیە، بەڵام بەدەر لەمانە پەیوەندی بەسیاسەتی ناوخۆ یان دەرەكی، هیچ دەوڵەتێكەوە نییە.

ئەحمەد منصور: لەژێر ڕۆشنایی ئەو پەیوەندییە تایبەتییەیی، لەگەڵ ئێران هەتانبوو. دوای ئەوەی(ئەحمەدی موفتی زادە) دەستگیركرا چیتانكرد؟ ئایا...؟

یوسف نداء: لەڕاستیدا بابەتی(ئەحمەدی موفتی زادە) كاریگەری لەسەرمن زۆربوو، لەبەرئەوەی ئەوە خۆی بابەتی كاریگەری پیاوێك بوو(خوالێی خۆشبێت) ئێمە بڕوامان وایە، كەپیاوێكی ستەملێكراو بوو، كاتێك كەدەستگیركرا ئێمە هەوڵماندا تەدەخولبكەین، بەو واتایە، نا ئێمە جیاوازین، لەگەڵ ئێراندا لەبابەتی (ئەحمەدی موفتی زادە)و ئەوانی تردا، واتە ئێمە پەیوەندییەكانمان بپچڕێنین، ئەگەر ئێمە پەیوەندییەكانمان بەهەركەسێكەوە بپچڕێنین ناتوانین هەڵەیەك چارەسەربكەین، كەباوەڕمان وایە، دەبێت چارەسەربكرێت، باشتروایە پەیوەندییەكە بەردەوام بێت، واتە هاریكاری یەكتری بكەین لەوەدا لەسەری ڕێكەوتوین و پۆزش بۆیەكتر بهێنینەوە لەوەدا تێیدا جیاوازین. هەوڵدەدەین و بەردەوام دەبین لەهەوڵدان بۆ چارەسەركردنی ئەوانەی تێیدا جیاوازین، ئێمە هەوڵماندا هەتاكۆتایی یارمەتی ئەو پیاوە بدەین نەمانتوانی، داوای سەردانیشمانكرد لەزینداندا. ئەو بابەتە توشی شێوەیەك لەلەرزینم دەكات. كاتێك لەگەڵ تۆ باسی دەكەم.

ئەحمەد منصور:لەكێ داوای سەردانیتانكرد؟

یوسف نداء: لەوەزارەتی دەرەوە. بریتی بوون لەچوار پیاوی گەورە. بەیەكەوە نانمان خوارد.

ئەحمەد منصور: لەكوێ، لەئێران، یان لە....؟

یوسف نداء: لە تاران وتم پێیان حەزدەکەم سەردانی بکەم، وتیان دەکرێت شوێنەکەی ببینیت.

ئەحمەد منصور: بیرتە ساڵی چەندبوو؟

یوسف نداء: نەخێر.

ئەحمەد منصور:باشە. بەنزیککراوەی پێم بڵێ .

یوسف نداء: نا... ناتوانم پێت بڵێم، لەتوانایی مندا نییە...، ئەگەر بمتوانیایە ڕونیبکەوەوە....

ئەحمەد منصور:باشە، باڵەگەڵت بێنمەوە بەیەکەوە، بۆئەوەی بگەینە بەروارێکی نزیك، چونکە بەروارەکان بەلای منەوە زۆر زۆرگرنگە، واتە دەتوانین. لەکۆتایی (٨٠)کاتدابووە؟

یوسف نداء: لەوانەیە.

ئەحمەد منصور: ٨٩ ـ ٩٠

یوسف نداء: دەکرێت(٨٩ ـ ٩٠)دەکرێت.

ئەحمەد منصور: ٨٩

یوسف نداء: لەوانەیە٨٩ .

ئەحمەد منصور: توانیمان ماوەیەکی گرنگ. دیاریکەین و بگەینە ئەنجامێك لەجیاتی ئەوەی ماوەکە گشتگیربێت.

یوسف نداء: بەڵێ... بەڵێ

ئەحمەد منصور: واتە دەتوانین بڵێین لەساڵی(٨٩) سەردانی(ئەحمەدی موفتی زادە)تکرد لەزیندان؟





یوسف نداء: نەخێر. سەردانم نەكرد، من داوامكردو بەڵێنیاندامێ، كەئەو بابەتەم بۆ رێكبخەن، دەشیانزانی من ناتوانم لە هیچ شوێنێكدا ماوەیەكی درێژ دانیشم، دەیانزانی كەمن دەتوانم، تەنها دوو رۆژ دانیشم، لەرۆژی دووەمدا، واتە رۆژێك پێش سەفەرەكە داوامانكرد. وتیان ناكرێت، ناتوانین ئەو دەرچووە، بەلاّم نەمانتوانی ناونیشانەكەی بزانین.

ئەحمەد منصور:ئاه....لەزیندان دەرچووە؟

یوسف نداء: بەڵێ. نەمانتوانی ناونیشانەكەی دەستخەین، باشە ئێوە(ئێران)، وەكو دەوڵەتێك، وەكو وەزارەتێك ناتوانن شوێنی لەكوێیە؟ پێموت ئێوە ناتوانن، من دەزانم لەڕاستیدا لەلای ئەوان دەرچووم بارودۆخەكە گۆڕا، بەیەكەوە دەرچووین و دابەش بووین.

ئەحمەد منصور: ئێوە دابەش بوون، ئێوەكێ بوون؟

یوسف نداء: ئێمە دووان بووین.

ئەحمەد منصور:تۆ و كێ؟

یوسف نداء: واز لەوەبهێنە، من زیاتر چاوم لەسەر بوو، ئەوەی لەگەڵماندا بوو رۆیشت، رۆیشتنی پەرجوو(موعجیزە)تێدابوو، چونكە ئەوەی لەگەڵماندابوو كەسی نەدەناسی، جگە لەیەك كەس و یەك ناونیشان، ئەویشی پێ نەبوو بیری كردەوە تەكسییەكیگرد، تەكسییەكە لەو شوێنە وەستا كە ئەوی بۆ چووبوو. دوایی دابەزین نەیدەزانی بۆ كوێ بڕوات پیاوێكی بینی و چوو بۆلای...

ئەحمەد منصور: كێ،(ئەحمەدی موفتی زادە)، یان ئەوەی بەشوێنیدادەگەڕا؟

یوسف نداء: نەخێر، ئەوی تریان...ئەوی تریان، بەلاّم گرنگ ئەوەیە سلاّوییان لەیەكتری كرد، وتی من بەخاتری ئەوەهاتووم(ئەحمەدی موفتی زادە) ببینم،

وتی(بەخوا)ئەوەی من دەزانم، ئەو هەفتەیەك لەمەوپێش لەم ماڵەدابوو، بەلاّم ئێستانا..بابگەڕێین. بردیو(دوو-سێ)شەقام گەڕان،گەیشتنە کۆلاّنێك دەرنەدەچوو. کەمێك بەدەوری خۆیاندا سوڕانەوەو ماڵەکەیان دۆزییەوە ڕۆشتنە ژوورەوەو (ئەحمەدی موفتی زادە)یان بینی: کاك ئەحمەد، وتی پێی"سوبحانەاللە، ویستم سەفەربکەم، بەلاّم تەندورستیم ڕێگەی پێنەدام ناچاربووم سەفەرەکەم بۆماوەی دوو ڕۆژ دوابخەم، ئەمەش فەزڵی خوا بوو".

ئەحمەد منصور: واتە، ئێوە سەرەڕای ئەوەی بەسەردانێکی فەرمی لەئێران بوونو ئێران دەزگایەکی باشی(هەواڵگیری)هەیە، کەچی توانیتان بگەنە نەوماڵەی (ئەحمەدی موفتی زادە)ی لیّ یە؟

یوسف نداء: بەڵێ..بەڵێ..بەس ئەوەشنا.شتێکی زۆرم لەبارەی پەیوەندییەکانەوە بەدەستهێنا،(خلیج و سعودییەو عێراق)هەموویان بەوە تاوانبارمان دەکەن ئێمە بەکرێ گیراوی ئێرانین، هەروەها ئێرانیش بەو چاوەوە سەیرمان دەکات کەبەکرێ گیراوی(خلیج و سعودییە و عێراق)بین. ئێمە لەنێوان ئەم( چەکوش و بندان)ەداین، بەلاّم ئێمە ئامانجمان هەیە، پەیوەندی بە بارودۆخی ئیسلامەوە هەیە، ئێمە هیچ بەرژەوەندییەکی تاکە کەسیمان نییە.

ئەحمەد منصور: ئێوە نە دەترسان سەردانەکەتان بۆلای(ئەحمەدی موفتی زادە) ئاشکرا ببێت، لەگەڵ ئەوەشدا کاریگەری هەبێت لەسەر پەیوەندییەکانتان لەگەڵ ئێراندا؟

یوسف نداء: پێش ئەوە کێشە ڕویدا بوو، من جارێك لەجارەکان چوومە ناو ئێرانەوە ئەوان دەیانزانی من گەیشتوم، واتە(کەمال غەرازی) دەیزانی.

ئەحمەد منصور: (کەمال غەرازی) لەو کاتەدا وەزیری دەرەوە بوو؟

یوسف نداء: نەخێر، وەکیلی وەزیری دەرەوە بوو.

ئەحمەد منصور: من تێبینی ئەوە دەکەم، پەیوەندی تۆ بەوەزارەتی دەرەوە...؟

یوسف نداء: من پەیوەندیم بەسەرۆکایەتی و وەزارەتی دەرەوە هەبوو، پەیوەندیم بەهیچ کەسێکی ترەوە نەبوو.

وەك ئاماژەی بۆکرا، ئەم گفتوگۆی نێوان(یوسف نداء و ئەحمەد منصور) بەچەند زنجیرەیەکی(تەلەفزیۆنی) کۆتایی پێهات، ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگ بوو، ئەوباسە تایبەتەی بوو لەسەر(کاك ئەحمەد).وەك لەوەلامەکانیشدادەردەکەوێت(یوسف نداء) بەو ناحەقیەیی بەرامبەر(موفتی زادە) ئەنجامدراوە زۆر ناڕەحەت بووە و یەکێك بووە لەو ڕوداوانەی کاری تێکردووە و بەلایەوە گرنگ بووە. شایەتی دانەکانی (یوسف نداء) زۆر ڕون و ئاشکرایەو پێویستی بەهیچ کۆمێنتێك نییە، بەلام ئەوەی جێگەی هەڵوێستە لەسەرکردنەوەی پێویستە بۆ(یوسف نداء) خوێنەرانو مێژووش ڕاست بکرێتەوە بابەتی(ئیخوان )ی بوونی(کاك ئەحمەدی موفتی زادە)یە. لەڕاستیدا(یوسف نداء) لەم بابەتەدا نە بێکاوە کاتێك(کاك ئەحمەد) بە(ئیخوان موسلمین) ئەژماردەکات و زۆر ڕاشکاوانە دەڵێت"بەڵێ، ئیخوان بووە." پێویستە لێرەدا ئەوە بووترێت بە(ئیخوان) دانەنانی(کاك ئەحمەد) لەبەرخراپی(ئیخوان) نییە،و هەوڵبدرێت ئەو لەو خراپانە دوربخرێتەوە، بەڵکو تەنها لەبەرئەوەیە (کاك ئەحمەد) زۆر لەوە فراوانتر بیریکردۆتەوە بکەوێتە ژێر سەیتەرییەیی ڕێکخراوێکی دیکەوە، ئەم قسەیەش دەتوانین لەهەڵسوکەوت و هەوڵدانەکانیدا زۆر بەڕونی هەستی پێبکەین. شتێکی بەڵگە نە ویستە سەربەخۆی بوون بۆ کەسێکی بلیمەتی چاو نەترسی وەك ئەو،پێویستییەکی گرنگی قۆناغەکەی بووە،(کاك ئەحمەد) بەدەلیلی کۆنگرەی(بیستی خرداد) و (تەئسیسی شورای- شمس-)و

دانیشتنەكانی، لەگەڵ لایەن و كەسایەتییەكاندا، كاری بۆ ئەوەكردووە یەكڕیزی بەتەواوی مانەوە دروستبكات، یەكڕیزییەك بێت ناوەڕۆك و ڕوخساری جێگەی گومانی هیچ كەس و لایەنێك نەبێت، ئەو لەدانیشتنە كۆتاییەكانیدا، لەگەڵ قوتابییەكانی بەم جۆرە دەربارەی خۆجیاكردنەوە قسەیان لەگەڵ دەكات"برا موسوڵمانەكان، خوشكە مسوڵمانەكان، چەنێك ئاگاداریم داوە، ئەگەر كەسانێك بیانەوێت(گروهگەرای و فیرقەگەرای) بكەن و ئەم خەصڵەتە تەشكیلاتزەدەگی و حیزب پەرستییە لەناوموسوڵمانانا موتەئەسیفانە ڕیشەی داكوتاوە بییانبێت، من بەریم لەوان و ئەوان لەمن بەرین، لەقیامەتدا مەسئولیەتی ئەمانە ناگرمەسەرشان.-لەقیامەت بپرسن-كە(ئەحمەد) تۆ بۆچی هاتی ژمارەیەك لەمسوڵمانانت جیاكردەوە لە خەڵكی تر بەناوی(گروهـ ودەستەیەك). بەرنامەی من ئەمە نییە براكانم، خۆم خەجاڵەتباری لای خواناكەم، خود خواهی(خۆویستی) ئێوە. ئێوە بڵێن، ئێمە موسوڵمانگەلی مەكتەبی جیاین لەمەردم، خۆمان لەخەڵك جیادەكەینەوە. بەرپرسیارێتی لەئەستۆی خۆتانەو چەندەها جار وتومەو ئێستایش ئەیڵێمەوە. ئەوە وامن گەرەكمە ئەمەیە، بەڕاستی بەتەقوابن، ئەمە مەسئولبن لەبەرامبەر خۆتان و لەبەرامبەر بەندەكانی خواوە، لەبەرامبەر دینی خوا، لەپێشدا جوان جوان خۆتان پەروەردە بكەن و ڕێگەی ئیسلام بگرن و لەوەودوا هەوڵبدەن بەشكوم مەقام و ئیمتیازێك پەیدابكەن"[1].

وادەزانین بەم وتەیەی(موفتی زادە)خۆی دەگەینە وەڵامی پێچەوانەی قسەی(یوسف نداء)، چونكە كەسێك نییە پێچەوانەی ئەوە بسەلمێنێ چوونە ناو هەرحیزب و ڕێكخراوێكەوە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ئاماژەیەكە بۆ خۆجیاكردنەوە لەو جۆرە

---

[1]) كاسێتی ژمارە(١٣)، راگە زن و شوهر، زمان ازدواج، حزب سازی وجودای از مردم.(٢١٧).B.

لەحەرەكەت كەلەوكاتەدا لەكۆمەڵگادا هەیە. دەربارەی دروستبوون یان دروست نەبوونی حیزب لە دیدی(كاك ئەحمەد)ەوە لەناو ئیسلامدا باسێكە دەكرێت لەكاتی خۆیدا قسەی لەسەربكرێ*.جگەلەوەش لەوكاتەدا،كە(یوسف نداء)ئەو قسەیەی كردووە بۆ ڕۆژی دواتر لەپێگەی(ئیخوان موسلیمن)دا، چەندین كەسایەتی بەرپەرچی ئەو قسەیانەیان داوەتەوە و ئەوەیان ڕەدكردۆتەوە(كاك ئەحمەد) ئیخوان بووبێت.

هەروەها(كاك حەسەنی ئەمینی)ئەندامی باڵای شورای(مكتب قورئانی كوردستان) لەنامەیەكی تایبەتیدا وەڵامی ئەوە دەداتەوە، ئایا(كاك ئەحمەد) سەربە(ئیخوان موسلیمن)بووە، ئەو بەم جۆرە دەنوسێت"سەبارەت بەپەیوەندی(كاك ئەحمەد)، لەگەڵ(ئیخوان موسلمین)دا ئەوەی ڕاستی بێت(كاك ئەحمەد) هەرچەند توانیبێتی یارمەتی هەموو كەس‌و كەسایەتی‌و تاقم‌و ڕێكخراوێكی ئیسلامی و ئینسانی بێ خیانەتی ئەدا، وەك بۆخۆی‌و خۆمان دڵسۆزی دەكرد. لەم ڕوانگەوە بەبرایانی (ئیخوان) پتر لەهەر تاقم و ڕێكخراوێك پەیوەندی و هاوكاریان هەبوو، چونكە ئەوكاتە، هەم لەلایەنی باوەڕی دینییەوە،و هەم لەبواری كۆمەڵایەتی و ڕامیارییەوە زۆر بەیەكەوە نزیك بووین. ئەو(من و تۆ)یەیی ئێستا هەیە ئەو كاتە لەبەینا نەبووە، ئەوەی(كاك ئەحمەد)دەیكرد و دەیوت، هەموانیشی فێركردبوو خزمەت بەدینی ئیسلام و گەلی ستەم لێكراوی كوردو هەموو ئینسانێكی ماف خوراو زەلیلكراو بكەین، بەڵام هیچ كات، هیچ كامێكیان(نەمكتب و نەئیخوان) وازمان لەناو و ئیش و دەرس و تێكۆشانی تایبەتی خۆمان نەهێنا. بەكورتی بوین

*) لەكتێبی(٢)دا لەوبارەیەوە بابەتێك بلاَوكراوەتەوە.





بەیەك"[1] .لەڕاستیدا پێویستە،ئەوەش بوترێت هەرئەوكاتەی خودی(كاك ئەحمەد) - خوادا لەژێر ڕەحمەتی خۆیدا بیحەسێنێتەوە- لەژیاندا بووە، یەكێك لەو ڕەخنانەی ڕوبەڕووی كراوەتە، ئەوەیە، كە بۆچی ئەو لەكاتی قسەكانیدا باسی(سەید قوطب و حەسەن بەنا...)-رەحمەتی خوایان لێبێت- ناكات و ئاماژەیان بۆناكات؟ یان بۆچی ئاماژە بەكتێب و نوسراوەكانیان ناكات؟ خۆی لەوەلآمێكدا، كەپێویست ناكات هەموو بنوسین-دەكرێت خوێنەر سەردانی ئەو كاسێتەبكات، كەلەم بارەیەوە پرسیاری لێكراوە-چەند هۆكارێك باسدەكات،و دەڵێت، لەو زەمانەی لە(تاران) بووە كتێبی ئەو جەماعەتەی موتالەعەكردووەو بەیەكێك لەكتێبە زۆر باشەكان باسیدەكات، هەروەها زۆر بەگەورە باس لە(سەید)و هاوەلآنی دەكات بەئەندازەیەك ئاماژە بۆئەوەدەكات شیعرێكی هەیە، وشەیەكی بەكارهێناوە لەوێدا ئەو وشەیە مەبەستی(سەید قوطب)ە. جا ئەمە لەو باسانەیە لەكتێبی(٢)دا ئامادەیی هەیە...

لێرەدا بەئەنجامگیری لەو بەلگانەی هێنامانەوە دەگەینە ئەوەی(كاك ئەحمەدی موفتی زادە)، ڕۆژێك وەك ئەندامێكی(ئیخوان موسلیمین) كاری نە كردووەو نەبۆتە بەرپرسی بالآی ئەو ڕێكخراوە لە ئێران، بەلآم زۆر لەنزیكەوە لەگەڵ ئەندامەكانیدا تێكەڵ بووەو پێكەوەكاریان كردووە و بەجدی بۆهێنانەدی مەبەست و ئامانجەكانیان هەوڵیانداوە. دڵسۆزی و خۆشەویستی و ڕێزگرتن و یەك ئامانجی، ئەو خالآنە بووە. بۆتە هۆكاری لێك نزیك بوونەوە و تێكەڵ بوونی(كاك ئەحمەد)و ئەندامانی (ئیخوان)ە. ئەو ڕێزو خۆشەویستییەی لەنێوان(كاك ئەحمەد) بەناونیشانی بەرپرسی

---

[1]) وەلآمی نامەیەكی عضوی شورای (مكتب قرانی كوردستان)،مامۆستا حەسەنی ئەمینی)، تایبەت بەو بابەتە،سنە،٢٠٠٨/١٢/٢٢ز.

(مكتب قورئان) و (ناصری سوبحانی) بەرپرسی یەكەمی باڵی ئیخوان لەئێراندا هەبووە شایستەی باسكردن و تێڕامانە. تێڕامانێك، كەدەبێتە پێویستی و ئەركی هەموو ئەوانەی بانگەشەی ئیسلامی بوون دەكەن و لەواقیعی ئێستادا چەمكی بەرپرسیارێتییان هەڵگرتووە و بانگەشە بۆئەوە دەكەن، دەبێت ئیسلام كەپەیامی خوداییە لەسەر زەویدا بچەسپێت و كاری پێ بكرێت، بەڵام ئەگەر لەهەرچی شتاهەیە گومانمان هەبێت، لەوەدا زۆر بێ گومانین هیچ بەرنامەیەك لەسەر زەویدا،(بەتایبەت بەرنامەی ئیسلام) نزیك نابێتەوە لەچەسپان و پیادەكردن، ئەگەر ئەو خۆشەویست ڕێزەی لەنێوان(كاك ئەحمەد) و (مامۆستا ناصر)دا، بەناونیشانی دوو سەركردەی بزوێنەری كۆمەڵگا هەبووە.نەبێت! دەی باڵێرە بەدوا زۆر بەكورتی و لەچەند نمونەیەكدا باسی ئەو موحیبەتە بخوێنینەوە، كەئەو دوو پیاوەی بەستوە بەیەكەوە.

# پەیوەندی نێوان
# كاك ئەحمەد و مامۆستا ناصری سوبحانی



سەرەتا پێویستە ئەوە بووترێت، بەداخەوە سەرچاوەیەكی وا لەبەردەستانەبوو باس لەسەرەتای یەكتر ناسینی ئەم دوو پیاوە بكات، ئەوەی لەبەردەستدایە زیاتر لەوكاتە قسە لەسەر پەیوەندییەكانیان دەكات،كەسەرەتای ئینقلابەو (كاك ئەحمەد) لە(سنە) خەریكی ئاگادار كردنەوەو جولاَندنی خەڵكییەو (مامۆستا ناصر)یش لە(پاوە)بەهەمان شێوە بە وتارو ئامۆژگاری و بەیاننامە، لەگەڵ خەڵكی ناوچەكەدا سەرقاڵی دەركردن و لەناو بردنی(شاه)ن.

بەپێی سەرچاوەكان، چ لەسەرەتایی ئینقلاب،و چ پێش ئینقلاب پەیوەندی نزیكایەتی لەنێوانیاندا هەبووە، ئەویش لەڕێگەی كردنەوەی(مەدرەسەی قورئان) لەناوچەكانی(پاوە).لەكاتی ئینقلابیشدا(مامۆستا ناصر)و هاوڕێكانی بەبەردەوامی (كاك ئەحمەد)یان لەو گۆڕانكارییانە ئاگاداركردۆتەوە كەڕویداوە، ئەوەتا (كاك ئەحمەد) سەبارەت بەو ڕوداوەی ڕۆژی (١٩٧٨/١٠/٢٧) لەشاری (پاوە) ڕویدا،و تێیدا سوكایەتی بەزانایان و خەڵكی هەژار و پیرۆزییەكانیان كراوە، نامەیەكی نارەزایی بەرز كردۆتەوە بۆ(ئەنجومەنی شورای میللی ئێران)و (ئەنجومەنی سەنا) و (دادگای مەركەزی ) و (ڕۆژنامە مەركەزییەكانی تاران)و (كۆمەڵەی داكۆكی لەمافی مرۆڤ) و (كۆمەڵەی مافناسان) و (بەرپرسانی پارێزگای كوردستان)، ڕاشكاوانە ئیدانەی ستەمكارییەكانی بەرپرسانی ڕژێمی كردووە لەشارەكاندا، بەتایبەتی ئاماژەی كردوە بەپەلاماردانی چەكدارانی ڕژێم بۆسەر خەڵكی(شاری پاوە)و





سوكایەتی كردن بەزانایانو قورئانی پیرۆزو جەماوەری(پاوە). لەیاداشتنامەكەدا(موفتی زادە) دەڵێ"بەو بۆنەیەوە هەموو بەرپرسان ئاگادار دەكەمەوەو داوایان لێدەكەم دەست لەم یارییە ترسناكە هەڵگرن، چونكە جەماوەری خۆڕاگرو بێدارو ڕاپەڕیوی ئەو شارانە لەوە زیاتر ستەمكاری قبوڵناكەن،و تازە ماهییەتی سیاسەتی شەرمهێنەرەی ڕژێمیان بۆ دەركەوتووە"[1].

ئەو پەیوەندییەی لەنێوان(كاك ئەحمەد) و (مامۆستا ناصر)دا هەبوو، لەسەر ئەساسی خۆشەویستی و ڕێزێكی ڕیشكداكوتاو بوو، ڕیشكێك خۆراكی لەقولایییەكانی دینەوە وەرگرتووە و بەهەموو لق و پۆپەكانیدا بلاوبۆتەوە، خۆشەویستی ئەودوو زانایە دواتر درێژ بووەتەوە بۆخۆشەویستی ئەندامو لایەنگرانو هەمووئەوانەی،وەك قوتابی لەبەردەمیاندا دانیشتوونو زانیارییەكانیان وەرگرتووەو گواستویانەتەوە. لەبارەی ڕێزو خۆشەویستی(كاك ئەحمەد) بۆ (مامۆستا ناصر)، (مامۆستا سیف الله حوسێنی)، كەهاوڕێییەكی نزیكی سەردەمی فەقێیایەتیو خوێندنی(مامۆستا ناصر) بووەو یەكێك بووە لەو مامۆستایانەی لەكاتی دەستگیركردنی(مامۆستا ناصر)دا، لەگەڵ هاوڕێكانیدا هەوڵ و تەقەلایەكی زۆریانداوە بۆ ئازادكردنی. (حوسێنی)لەبارەی ئەو خۆشەویستیو ڕێزەوە چیرۆكێكی خۆی بەم شێوە دەگێڕێتەوە"لەساڵی(١٣٦١) من دور خرامەوە بۆ شارێك لەشارەكانی(پارێزگایی كرماشان) ناوی(كەنگاوەر)ە، لە(ئامادەیی شەریعەتی

[1]) دەزگای بەرهەم: شەهیدی بیروڕا مامۆستا ناصری سوبحانی چاپی یەكەم، ٢٠٠٦، ل٣٩

کەنگاوەر) وانەی(عەرەبی و مەنتیق و جیهانبینی دینی و ئەدەبیات)م دەوتەوە. خوالێخۆشبوو(کاك ئەحمەد) لەوکاتەدا لە(سنە)وە کۆچی کردبوو بۆ(کرماشان). ڕۆژی(٣خوردادی١٣٦١) نزیك سەعات(١٠:٣٠ بۆ١١) تاقیکردنەوەی قوتابییەکانم تەواوکردو وەرەقەی تاقیکردنەوەکانم هێنایەوە بۆ(جوانڕۆ)و هات بەخەیاڵمدا بڕۆم سەرێك بدەم لە(کاك ئەحمەد).چوم بۆ(کرماشان)و لەوێ سەردانی(کاك ئەحمەد)م کردو دوای سەلام و ئەحواڵ پرسین ماوەیەك دانیشتین، چی لەپڕ یەکێك زەنگی دەرگایی لێداو(کاك ئەحمەد) بەعینوانی خاوەنماڵ تەشریفی برد دەرگاکەی کردەوە، چی دیمان(کاکە ناصری سوبحانی)ئەویش لە(پاوە)وە هات، هاتە سەرەوە و( سێ نەفەری)دانیشتن و دەستکرا بەگفتوگۆو قسەکردن، دوای قسەو باسی دەربارەی بارودۆخی(پاوە) و ئەو ڕوداوانەی بەسەریدا هاتووە هەمووی بۆ گێڕاینەوە، پاشان(کاك ناصر) ئایەتێکی قورئانی خوێندەوە ئایەتی(أَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي)طه١٤. ماوەیەك تەوزیحیدا و باسی نوێژی کرد، ئەگەر نوێژ واقیعەن یادی خوای تێدانەبێت بەمانایی واقیعی ئیتر ئەو نوێژە نوێژی ڕاستی نییە، هەروەکو خوا دەفەرموێت (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى حَتَّىَ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ...)[1] واتە(لەحاڵەتی غەفلەت و مەستیدا نزیکی نوێژ مەکەونەوە،

[1] يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى حَتَّىَ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ وَلاَ جُنُباً إِلاَّ عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىَ تَغْتَسِلُواْ وَإِن كُنتُم مَّرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاء أَحَدٌ مِّنكُم مِّن الْغَائِطِ أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاء فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء فَتَيَمَّمُواْ صَعِيداً طَيِّباً فَامْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَفُوّاً غَفُوراً }النساء٤٣،

بەڵكو بەجۆرێك نوێژ بكەن بزانن چی دەڵێت...) لەوكاتە(كاك ئەحمەد) باوەشی پێداكردو وتی"تۆ موجتەهیدی"، ئەویش موتەوازیعانە وتی"قوربان نەخێر، من ئیدعام نییە، ئەمە هەرشتێكی شەفافە و ڕۆشنە و هەرنەفەرێك پێویستە بیزانێت"، جا ئەوكاتەی(كاك ئەحمەد) پێیوت تۆ"موجتەهیدی"، ساڵی(١٣٦١) بوو، جا لەدواتر تا ساڵی(١٣٦٨) جیاوازییەكی زۆری هەیەو دیارە(كاك ناصر) لەوماوەی(٧) ساڵەدا زانستی زۆر زیادیكرد. تائەوێش ئاگاداریم هەیە،(كاك ناصر) بەنیسبەت (كاك ئەحمەد)ەوە ئەوەندە موتەوازع بووە بەناونیشانی(ناصحی ئەمین) كاك ئەحمەدی موعەرەفی دەكرد،وشەی(نوصحی، ناصحی ئەمین)بۆ پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێرازیبێ) دەوترێ، بەڕاستی بەو هەموو عیلمەوە كەهەیبوو لەبەرامبەر(كاك ئەحمەد)ەوە بەوجۆرە بوو"[1].

لەكاتێكدا،(كاك ئەحمەد)دێتو (مامۆستا ناصر)، وەك كەسێكی گەورەی (موجتەهید) تەماشادەكات،و تائەو پلەیە بەرزیدەكاتەوە لەولاشەوە، جگەلەو هەموو تەوازوعەی(مامۆستا ناصر) دەینوێنێت، لەبەرامبەر(كاك ئەحمەد)ەوە، بەوەشەوە ناوەستێت(مامۆستا بورهانی حاجی هادی)، یەكێك بووە لەهاوڕێ نزیكەكانی(مامۆستا ناصر) لەبارەی دیدو بۆچوونی(مامۆستا ناصر)ەوە بۆ(كاك ئەحمەد)بەم جۆرە دەگێڕێتەوە"(مامۆستا ناصر)بەجۆرێك (كاك ئەحمەد)ی خۆشدەویست و بەڕێز بوو لەلای، ئەگەر كەسێك لەپاڵیدا

---

[1]) چاوپێكەوتنی نوسەر، لەگەڵ (مامۆستا سیف اللە حسینی)، ڕۆژی ٢٠٠٩/٨/٢٩، جوانڕۆ، مزگەوتی (خاتم امبیا).





بیوتایە(ئەحمەدی موفتی زادە)زۆر زۆرپێی بێ تاقەت دەبوو دەمووچاوی گرژدەبوو، دەتووت ئیهانەت بەخودی(مامۆستا ناصر)خۆی كردووە، هەمیشە دەبوایە بتوتایە(كاك ئەحمەدی موفتی زادە) بە بەردەوامی(مامۆستا ناصر) دەیگوت"ئەگەر شورایەك دروستبكرێت بۆ هەموو ئومەی ئیسلامی دەبێت(كاك ئەحمەد)ببێتە سەرۆكی ئەو شورایە، ئەگەر نەشكرێتە سەرۆكی دەبێت ئەندامێكی گەورەی ناو ئەو شورایەبێت"[1].

(كاك ئەحمەد)ئەوەندە دڵنیا بووە لەو عیلم و ئیمانەی لای(مامۆستا ناصر) هیچ گومانی لە (موجتەهید)بوونی نەبووە. دەگێڕنەوە، كاتێك لەزینداندا بووە هەندێك هەڵوێستی مامۆستا ناصر گەیەنراوەتەوە بە كاك ئەحمەد، گوایە بەپێچەوانەی ڕاو بۆچوونی ئەوەوە بووە، و ژمارەیەك لەدۆستان و لایەنگرانی كاك ئەحمەد پێیان گران بووە، بەلاّم كاك ئەحمەد وتوویەتی"كاك ناصر موجتەهیدە، هەرچی وتبێ وەك زانایەكی موجتەهید وتویەتی.."[2]، هەروەها جگە لەو پەیوەندییە خۆشەویستییەی لەنێوان ئەو دوو زانایەدا هەبووە، پەیوەندییەكی زانستیش لەنێوانیاندا هەبووە، واتە پەیوەندییەك هەیە، كەدەتوانین ناوی بنێین(پەیوەندی عیلمی) پەیوەندییەك لەڕووی زانستەوە، هەوڵیانداوە لەكاتی قسەو باسەكان سود لەزانستەكانی یەكتری وەربگرن و برەوی پێبدەن، (تەحسین حمەغەریب)توانیویەتی، ئەگەر بەكورتیش بووە قسە

---

[1]) چاوپێكەوتنی نوسەر لەگەڵ ( مامۆستا بورهانی حاجی هادی ). سلێمانی ٢٠٠٩/١/١٠

[2]) عبدالله عبدالعزیز عەبدی: ژیاننامەی زانای گەورەی كوردستان مامۆستا ناصری سوبحانی، چاپی یەكەم، ل٨٩.





لەسەر ئەم پەیوەندییەکان بکات،"قسەکانی کاك ئەحمەد زۆربەیان میتۆد(ڕێباز)ن، مامۆستا ناصر زۆرێك لەبۆچوونەکانی کاك ئەحمەدی هێناوە کردوونی بەسیستەمێکی گەورە، جائەم قەریحە فەلسەفییەی موفتی زادە وایکردووە کەشتەکانی ئەو میتۆدی بن(الموازع المنهجیه و القواعدیه)، دواتر مامۆستا ناصر سودی لێ بینیوون و لەقورئاندابۆیان گەڕاوە"[1].

کاك مەنصوری برای مامۆستا ناصر دەڵێ"ساڵێ پاش شۆڕش لەگەڵ برای شەهیدم کاکە ناصر چوینە خزمەتی کاك ئەحمەد، هەندێك قسەو باسی زانستی چوو بەنێوانیاندا. کاکە ناصر عەرزی کاك ئەحمەدی کرد:"پێم باشە کەمێك زیاتر موتالەعەی فەرمودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بکەیت. ئەویش فەرمووی بەچاوان... بەچاوان"[2].

کۆتا شتێك لەبارەی پەیوەندی ئەو دوو زانایەوە دەمەوێت بیڵێم، بریتییە لەو نزا پڕ لە ئیمان وحەسرەت و چۆشەی شەهید مامۆستا ناصری سوبحانی لە ەکێك لە کۆتایی باسەکانیدا بۆ شەهید کاك ەحمەدی موفتی زادەی دەکات، کە ئەگەر بەڕاستی هەرکەسێك لە ئێمە بەئیمان و دڵەوە گوێ لەو نزایەیی مامۆستا ناصر بگرین ئیتر بەسدەبێت بۆئەوەی بزانین ئەو دوو زانایە تا چی ئەندازەیەك موئمینانە یەکتریان خۆشویستووە!!

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو،ل١٨٩

[2]) عبدالله عبدالعزیز عەبدی: ژیاننامەی زانای گەورەی کوردستان مامۆستا ناصری سوبحانی، چاپی یەکەم، ل٨٩





مامۆستا ناصر، لە موحازەرەیەكیدا كە بەبۆنەی یادی لەدایك بوونی پێغەمبەرەوە(ﷺ) وتوویەتی، وەك پیشەی هەمیشەی لە كۆتایی باسەكەیدا لە لەتكەی بەرزی ئیمان و بەدڵێكی پڕلە حەسرەتو بە دەنگێكی پڕ لە تاسەی دیدارەوە، تاسەیەك وەك تاسەی دڵی ئەو دایكەی كە ڕۆڵەكەیان لەبەرچاوی هەڵگرتووەو ئێستا جگەلە نزای خێر هیچی لەدەست نایەت بۆی بكات، ئا بەو ئاوازەوە دەستەكانی بۆ ئاسمان بەرزدەكاتەوەو وەك پێغەمبەرێك كە هەستدەكات بەرامبەر هەمووبەشەرییەت بەرپرسیارە لە پەروەردگاری داوادەكات[1]" لە خوای گەورە داوا ئەكەم كە جارێكی تر لە ئاوا مەجلیسێكدا (كاك ئەحمەد) بێ دانیشێت". دیارە كاتێك مامۆستا ناصر ئەم نزایە دەكات، كاك ئەحمەد لە زینداندایەو ئەمیش بە شێوەیەكی شاراوەو هەرجارەی لە ماڵ و شارێك دادەنیشێت و ئەدای مەسئولییەتی خۆی دەكات...

لەكۆتای ئەم باسەدا، زۆر بەئاسانی دەتوانین هەست بەخۆشەویستی ئەو دووسەركردە بكەین، كەیەكیان سەركردەو ڕابەری ڕۆحی و فەلسەفەی ئەهلی سوننەی كوردستانە لەسەردەمی شۆڕشدا، لەهەمانكاتدا بەرپرسو دامەزرێنەری(مكتب قورئان)ە و ئەوی دیكەیان زانا و موجتەهیدو لێپرسراوی باڵی(ئیخوان مەسلیمین) و دامەزرێنەری یەكەمی ئەو ڕەوتەیە لەئێران لەژێر ناوی(كۆمەڵەی بانگەواز و ئیسلاح )[2].

---

[1]) مامۆستا ناصری سوبحانی: لادانەكانی بەشەرییەتو ژیانی مونمینامە. سەروەت عەبدولا، چاپی یەكەم، ٢٠١١، چاپخانەی سیما،ل٨٦.

[2]) جاعە الدعوە والاصلاح فی اران.www.wikipedia.org.

# بەشی دووەم

## کاك ئەحمەدی موفتی زادە و مەسەلەی کورد (خودموختاری) بە نموونە

کوردستانی جوانم

چەنای چەن ساڵ کوردستانی جوانم      لە دووریت عالەمم لێ بۆتە زیندان

مەگەر ناوت لەناو ڕۆژنامە موچرك    بخاتە گیانو چاو بێنێتە گریان

وڵاتی خۆشەویستم یاخودا قەت    شەڕی زۆركارو خوێری لێت نەكاكار
خودای ئەو خەڵكە خۆتو ڕۆڵەكانت    بپارێزیٚ لە فێڵ و داوی بەدكار

لە هەورامانو سارالْت لەبارتر    لەكویٚ بێرم كە پیٚ خۆشكەم دڵی خۆ
گرانە تا بەهەشتی خوا پەیاكەم    كەژو كێوی بە جوانی ناویەری تۆ

لە دڵ، تارانو دەورەی، ناگریٚ جیٚ    سنەو مەسناوو گریاشانو قارت
بەڵیٚ ڕاسە شەمێران خۆشە ئەما    هەموی قوربانی بستیٚ دەیەزارت

نە بەندی، گەر وەكی باپیرە گەورەم    بەئازادیش ببم میوانی تاران
دڵم ئێژیٚ: قەزای بەردێكی سەخناخ    لەسەر تا خواری تارانو شەمێران*

ئەمن فاشیستو بەدخوای خەڵكی تر نیم    موبارەك بیٚ لە هەركەس نیشتمانی
بەڵام بۆمن هەمو ئێران بەمولكی    فدای وێڵەی سنەو مەسناوی جوانی
وەتەن ئەلحەق بەهەشتی روی زەوینی    -گەلت-داخی بەجەرگم-زۆر هەژارە-
زەلانی پاییزی نامانییەت بۆ    دڵی ژاكاوی دوری، بای بەهارە

بەڕاس لایەقتە كوردستانی جوانم    گەلیٚ ژیرو نەترسو كرژی نیمان
لەگوێت هەر نەبڕیٚ یاخوا دەنگی صەلْوات    لەبۆ پێغەمبەرو بۆ ئال و یاران

١٣٦٨/٧/١٦(لە كوچە تاریكەكانی زیندانندا نوسراوە)

# دەروازەیەك بۆ موفتی زادە و كورد و كوردستانی

*) ناوی یەكێكە لە گەڕەكەكانی شاری(تاران).

یەکێك لەو بابەتانەی زۆر بە زەحمەت دەتوانرێت حەقی خۆی پێ بدرێتو تەواوی ڕاستیەکان باس بکرێت، بریتیە لە مەسەلەی(کورد) و کاری(کاك ئەحمەد)، وەك ڕەهبەرێکی دینی لەم بوارەدا، کە پێشمان وایە یەکێك لەو لایەنانەی (کاك ئەحمەد) زۆر ڕووبەڕووی ڕەخنە دەبێتەوە تێیدا هەر ئەم مەسەلەیەیە.

گومانیش نییە لەوەدا، هۆکاری ڕەخنە گرتن لە(موفتی زادە) لەم ڕوانگەیەوە ئەوەیە، ئەو مامەڵەی لەگەڵ دۆزی کوردو لایەنی نەتەوایەتیدا(مامەڵەیەکی فیکریانە)بووە و لەسەر ئاستێکی زۆر قوڵ و بەرپرسیارێتیەکی تەواو مێژوویی‌و ئەخلاقی‌و ئینسانییەوە لەمەڕ ئەم بابەتە جوڵاوەتەوە، نەوەك مامەڵەیەکی سۆزداری(عاتیفیانە). بەڵگەش لەم بارەیەوە زۆرەو ئەوەی وورد مامەڵەی لەگەڵدا نەکات ئاسان ناتوانێت بەئەنجام بگات، ئەوەتا لە نامەیەکدا بۆ(ئیمام خومەینی) ڕاستەوخۆ و بەبێ پەردە لەوە ئاگاداری دەکاتەوە ئاستی بەرپرسیارێتیان لەچی پلەیەکدایە،"ئێستا لەم قۆناغە ناسکەی مێژووسازی ئێمە، نەك تەنها لەبەرامبەر جیهانی ئیسلامییەوە، بەڵکو لەبەرامبەر مرۆڤایەتیی‌و مێژووی ئایندە بەرپرسیارێتیمان هەیە"[١]. ئاشکرا دیارە کاتێك کەسێك لەسەر ئەم ئەساسە بیربکاتەوە ناکرێت تۆ بێیت لە بابەتێکی ئاوا فراوان و فرە ڕەهەندا بێ ویژدانانەو بەبێ حساب کردنێك بۆ ئایندە، کەتۆ چەنێك لێپرساو دەبیت بەرامبەر قسەو بۆچون و نوسینەکان، سەرلەبەری ماندوبوونی چەندین ساڵەی(شۆڕشگێڕێکی) ئاوا بخەیتە بەر ڕەخنە،و تەنها خاڵێك نەدۆزیتەوە مایەی دڵخۆشیت بێت.

---

[١]) تلگرافی ئەحمەدی موفی زادە بە ئیمام خومەینی. بەهزادی خۆشحاڵی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو کوردستان، روزهای بحران ٤.

دیارە ئەم جۆرە لەبیرکردنەوەو کارکردن بەم میتۆدە بۆ تەواوی سەرکردە سیاسیەکان دەبێتو پێویست دەکات لەسەر ئەم بنەمایە کاربکرێتو ڕەخنە بگیرێت، هەر لەبەر ئەمەشە هەوڵدراوە لە ڕووانگەی کارو هەوڵەکانی(کاك ئەحمەد) بۆ بەدیهێنانی(خودموختاری) بۆ کوردەکان بابەتەکە بنووسرێت، بۆئەوەی هیچ نەبێت نزیك بینەوە لەوەی حەقێك بدەینە بابەتەکە، ئەمەش بە لەبەرچاوگرتن و ورووژاندنی چەند باسێکی دیکە، کەلە ڕاستیدا دەبێت بۆ قسەکردن لەسەر هەر یەك لەو باسانە توێژینەوەی سەربەخۆ ئەنجام بدرێت، بەڵام کاری ئێمە لێرەدا ئەوەیە، ئەگەر زۆر بەکورتیش بووە ئاماژەیان پێبدەین.

کاك ئەحمەدی موفتی زادە، لەسەرەتای دیوانە شیعرییەکەی(دیاریە بۆ یاران)دا بە(شیعر)ێك دەست پێدەکات(مافی نیشتمان)*، ئەگەر هەر کەسێك ئەو شیعرە

---

* مافی نیشتمان

نیشتمان ئەی خاكو خۆڵی تۆ کلەی چاوانمە　　نیشتمان ناوی بەرێزت هێزی ڕۆحو گیانمە

نیشتمان ئەی بەربەیانت ڕۆشنی ئیمانمە　　نیشتمان نێوارەکانت خەڵوەتی غیرفانمە

نیشتمان قوربانی کوێستانت دڵی پڕ دەردی من

نیشتمان حەیرانی گەرمێنت هەناسەی سەردی من

نیشتمان سەرمەشقی بەرزە هیمەتە کۆماری تۆ　　مەرگەزی زانستیو غیرفانە لادێو شاری تۆ

نیشتمان باغاتی فیردەوسە هەموو گوڵزاری تۆ　　عیزەتو فەخرە هەمو نەخشی دەرو دیواری تۆ

نیشتمان ئەی شاخو داخانت نومێدی دڵ هەمو

نیشتمان دەشتو بیابانت بەهەشتی ئارەزو

نیشتمان شەرتە کە تۆزی ڕێت بە ئەم دنیا نەدەم　　شەرتە تاماوم لەشەرتی گیان فیدایی لا نەدەم

نیشتمان شەرتە لەعیشقی پاکی تۆ سەر بانەدەم　　شەرتە قەت گوێ بۆ ڕەقیبو وەس‌وەسەی ئەعدا نەدەم

نیشتمان ئەی فێنکی قەلبم شنەی کوێستانەکەت

نیشتمان ئەی ناوی ژینم خاکی کوردستانەکەت

بەوردی و قوڵی بخوێنێتەوە لە ڕادەی تێگەیشتن و ئامانج و ترسەکانی(موفتی زادە) بۆ (کورد و کوردستان) حاڵی دەبێت و بەجۆرێك لەجۆرەکان بەرچاو ڕوونییەکی بۆ دروست دەبێت.

هەرکاتێك کەسێك بیەوێت لەبارەی(کاك ئەحمەد)ەوە بابەتێك بنووسێت پێویستە سەرەتا خاڵێك هەیە زۆر لای ئاشکرابێت، ئەویش ئەوەیە کارەکانی(کاك ئەحمەد) بەبێ پەردە بووەو هەموو ئەو شتانەی پێویست بوون بە ڕاشکاویو بەبێ گوێدانە ڕازیکردنی دڵێك و زویرکردنی دڵێکی تر وتوونی، ئەمەش یەکێکە لەو خاڵە

---

نیشتمان ئێحسانی تۆیە خوێنی باوباپیری من    هێزی شانو نسوری دیدەو قودرەتی تەدبیری من

نیشتمان گەر خوێنی من پاکەو حەلاڵە شیر من    هەر لەسەر ڕێی خۆشەویستی تۆیە بڕوا و بیری من

نیشتمان دایم لەسەر ئاواتی بەرزی ناوی تۆم

خاتر جەم بێ بەلاگەردانی خاكو ئاوی تۆم

لاوی کورد ئەر پاکە شیرت هەستە وەك شێری ژیان    ڕاکە مەیدان بۆ بەجێ هێنانی مافی نیشتمان

ڕۆڵەی صوڵتان سەلاحەدین ئەخۆی گۆڵی کەسان    ڕوکنی ئیمان خۆشەویستی نیشتمانە بێ گۆمان

لاوی کوردم خوەت نەکەیتە داردەستی دوژمنت

دوژمنت نەت باتە مەیدان بۆ برای خۆ کوشتنت

کوردە قەت نەنوی بەلای دوژمنی عەیارەوە    شێری دوژمن تێکەڵە حەتمەن بە ژاری مارەوە

ڕەنگ نەکەی داوێنی ناموست بە لکەی عارەوە    نیشتمانت دایکتە، نەیدەی بە دەس ئەغیارەوە

ڕەنجی باوباپیری تۆ ئەم نیشتمانەی دا بە تۆ

کوردە وریابی نەکەی باپیرانت ڕەنجەڕۆ

کوردە دینو نیشتمانە مایەی بەرزی ژینی تۆ    دوژمنی هەر دوکیانە دوژمنی بێ دینی تۆ

هەر بژی تۆو نیشتمانت، هەر بژی ئاینی تۆ    با لە داخا شەق ببا بەدخاهی تۆ بەدبینی تۆ

هەستە سا، هەروەك تریشقە ڕیشەکەن کە دوژمنت

تا بە فێڵو کەن لە ڕیشەی دەر نەهێناوە بنت

(دیوانی شیعری کاك ئەحمەدی موفتی زادە، دیاری بۆ یاران، مافی نیشتمان،لا۲۷)



جەوهەریانەی موفتی زادە جیادەكاتەوە لەكەس و سەركردەكانی سەردەمی خۆی، هەروەها مەسەلەی نە ترسان و بێ باكی لەو ڕووداوانەی ڕوو دەدەن، وەك پێشتر ئاماژەی بۆ كرا.

بەپشت بەست بەم دووخاڵە دەگەیتە خاڵی سێیەم،كە(ڕاستگۆیی)و درۆ نەكردنییەتی لەگەڵ نەتەوەكەیدا، بەڕای ئێمە لەناو ڕابەرانی دۆزی كورددا لاوازترین خاڵیان هەمیشە ئەم سێ خاڵە بووەو زۆرترین لەتمە لەكورد دراوە لەم سێ دەرگایەوە بووە!

كاك ئەحمەدی موفتی زادە، زۆر زیرەكانە دەركی بەوەكردووە، كەدەكرێت ئێمە بەناوی كار بۆ نەتەوەوە(درۆی باڵدار) بكەین و ئاسان هەر كەسێك بمانەوێت فریوی بدەین.

یەكێك لەو(ناونیشانە) تازانەی موفتی زادە هێناویەتیە ناو فەرهەنگی ڕۆشنبیری كوردییەوە لەماوەیەكی كورتدا قسەی لەسەركردووەو ڕوونی كردۆتەوە، مەسەلەی (هەستی نەتەوایەتی درۆ)-(حسی میللی درۆ)، هەركاتێكیش لەسەر ئەم ناونیشانە قسەدەكات بە دەردێكی زۆر كوشندە ناوی دەبات و بەخاڵێكی لاوازی سەردەمی ئینقلابی دەزانێت."زۆر كەس كەبەدڵ كەسێكیان خۆشدەوێت زۆر لەقسەو هەڵسوكەوتیاندا دەكرێت زاهیری نەبێت و-ناوەڕۆكی-دەرنەكەوێت، بەڵام ئەگەر مەبەستێك ناپاكانە لەدڵیاندابێت، (ماڵێك، مەقامێك، پارەیەك، شتێكیان) بوێت، ئەگەر خۆشەویستیەكەیان درۆبێت ئەوەندە دەیڵێنەوە، كەئیتر ئینسان ڕقی لێی بێتەوە. لەم سەردەمی ئینقلابەدا كۆمەڵێك كەس، كەزەمانێك پێیان عەجیب بوو

بەكوردی لەگەڵ ماڵ و منداڵیاندا قسە بكەن(واتە هەر بەزمانی* فارسی قسەیان كردووە) گشتی هات و (جلو بەرگ)ی كوردی پۆشیوكەواو شەرواڵو دەسماڵیان لەبەركرد، ئێمەی فەقیر هەر لەدورەوە جێماینو هەر نەدەگەیشتین بەقولیاندا! ئەمەش بۆئەوەی بڵێن ئێمە فرە كوردین، سوێند بەخوا هەرگیز بڕوات پێناكەم-مەبەست ئەوەیە، باوەڕ بەو كەسانە ناكات زەمەنێك بەفارسی قسەیانكردووەو ئێستا هاتوون لەڕێگەی پۆشینی جلی كوردییەوە كوردایەتی بە(كاك ئەحمەد)و ئەوانەی وەك ئەوبوون دەفرۆشنەوە-، پانتۆڵە تەسك و قسە فارسیەكانت لەناو ماڵا هەروا لەبەر چاوم، چونكە ئەم كورد بوونەت درۆیەو زیادە ڕەوی زۆری تێدادەكرێت، ئەوەی دەڵێم وا لەناو چینی ڕۆشنبیراندا بۆتە نەخۆشی، ئەمەیە-چینی ڕۆشنبیر وادەڵێن-" كەزمانی كوردی دەبێت پاك بكرێتەوەو تۆزی غەیرە كوردی تێدا نەمێنێت"، پاشان كۆمەڵێك بڕوایان پێدەكەن، كەخۆشم زەمانی(تارانم) لەوانە بوم، نەك بەدڵ قبوڵم كردبێت، زمانی كوردی پاك بكرێتەوە، بەلام لەڕۆژنامەی (كوردستان) لەساڵی(١٣٣٥) كەدواتر ڕاوەسێنرا، وتارم دەنوسیو وامدەكرد كوردی پەتی بنوسرێت،-وشەی-غەیرە كوردی تێدا نەبێت .... <u>ئەو دەردەی كەوتۆتە ناو ئێمەی كورد، ئەوەیە دەبێت بەشیعارو قسە بانگەشە بكەینو كوردبوون بۆتە شیعارو كەلیماتی زلە زلە</u>. ئەوەی زمانی كوردی پاك بكرێتەوە ئەمەش جگەلە قسەو خیانەت بە(نەتەوە) هیچی دیكە نییە، ئەمەش دیارە كاری داگیركەران بوو،

---

*) كاك ئەحمەدی موفتی زادە، دیارە لەبارەی زمانەكان بەگشتی و زمان و ڕەچەڵەكی زمانی كوردییەوە زانیارییەكی ووردو قوڵی هەبووە، لە پەراوێزی بابەتێكیدا، زۆر بە كورتی لەبارەی زمانی كوردییەوە قسە دەكات، لە ڕاستیدا كۆمەڵێك ڕوونكردنەوە دەدات، كە جێگەی خۆیەتی بەهەند وەربگیرێت و دیراسەی ووردتر و خوێندنەوەی قەوڵتری بۆ بكرێت، هەرلەبەر گرنگی بابەتەكەی ئێمەش لێرەدا وەكخۆی لەبەشی پاشكۆدا بلاومانكردۆتەوە.......

بۆئەوەی تەفرەقە بخەنە ناو میللەتەوەو خەڵكی لە قورئان دوور بخەنەوە، دەیانوویت ووشەی عەرەبی لاببەن(لاشیان دەبرد)، بەڵام ووشەی فەرهەنگەكانی دیكە قەیناكا، ئەم كارانەش تەنها بۆ ئەوەبوو بێگانەمان بكەنەوە لەئیسلام، تاوەكو باش بتوانن حوكوم بكەن بەسەرماندا. هەر كات دڵەكان پەیوەندیان بەئیسلامەوە نەما، پاشان ئەو بەرنامەیەیی خۆیان بێنن بەناوی ئازادییەوە بیسەپێنن بەسەرماندا، ئەوكاتە زۆر ئاسان دەتوانن سواری ملی ئەم میللەتە بن"[1].

(كاك ئەحمەد) لەناو زیندانی كۆماری ئیسلامی ئێراندو لەژێر ئەو هەموو ئەشكەنجەو ئازارەدا میللەت و زمانەكەی خۆی بیر نەچۆتەوە، لەیەكێك لەباسەكانی دوای مەرەخەس بوونی لەناو ناڵەی ئێش‌و ئازارو قوڵپەی گریانی بۆ ئەو هاوڕێیانەی سەردانیان كردووە، باسی ئەو دەردەیان بۆ دەكات، كەخۆی ناوی ناوە(نەخۆشی حەسی میللی درۆ). لەوێدا دەڵێت"لەناو زینداندا هەمیشە بیری ئەوەم دەكردەوە ئاخۆ ئێستە بڕۆمە ناو شارو گوێچكە شل بكەم،كابرای كرێكارو برای خۆشەویستی خزمەتگوزارم، (كەقەزای كەل و پەل و كۆڵەپشتیەكەی ناو شانی ئەخەم لە هەزار پانتۆڵی ئەشرافی پڕ شەوق‌و زەوق)،برای حەماڵم چۆن قسە دەكات، كاتێك خەریكە بارێك هەڵدەگرێت، بۆئەوەی بیگەیەنێتە ماڵان؟

كۆمەڵێك شت كەبێگانەیە لەناو زمانی خەڵكیدا،نەك ئەوەی لەناو زمانی خەڵكێدا هەیەو بێیت ئاڵو گۆڕی كەیت(عەرەبی لاببەریت و ئینگلیزی) دابنێیت بەناوی پاك كردنی زمانەوە-زمان جیابكەیتەوە لەو خەڵكە، ئائەوە خیانەتە، دەمووت ئاخۆ ئەو(پەتا) چەپەڵە بەو ڕیشە داگیركارییەوە ماوە لەناوخەڵكا، دەبێ هەر كوردی قسە بكرێت بەناوی كورد دۆستی، بەڵام بۆ بەدبەختكردنی كوردو بۆ ئەوەی(دین و

---

[1]) كاسێتی ژمارە(١٦)، دیداری عمومی، (٢ – ٢٤٧).B





ئیمان) لەكورد بسێننەوە، بۆئەوەی باش بتوانن زەلیل و خوێڕی بێت لەژێر چەپۆكی داگیركەراندا، ئاخۆ ئەو پەتا ماوە؟!

ئێستا ئەگەر بمەوێت، وەك مرۆڤ، وەك كابرا ووتی"یەك نەفەر خەریك بوو لەگەڵ زانایەكدا مناقەشەی دەكرد، ئەو حەقی بوو زاناكە ناحەقی بوو، زاناكە خستیە ناوكۆمەڵێك چەمك و دەستەواژەی ئەستێرەناسی، و فەلەك وا دەڵێ و فەلسەفە وادەڵێت، كابرای فەقیریش ئەمانە نازانێت، دەڵێت توخوا كاكە بەم قسە زلانە مەمترسێنە،(من حیلمم نییە، حەقم هەیە). بەڕاستی ئەم قسە زلزلانە جیایە لەزمانی كوردی هێنراوەو داغلكراوە، كەخۆیانی پێ بەرنەپێشەوە... دەموت ئایا هەر وەكو جاران ماوە؟

ئەمانە زۆر ئازاریان دەدام زۆربە دورو درێژی لەسەر هەر یەكەیان لەم باسانە بیرم كردۆتەوەو عەزێتم بووە"[1]

كارو تەقەلای(موفتی زادە) بۆ گەڕاندنەوەی مافە نەتەوەییەكانی كورد بەگشتی و لەناو هەموویاندا ئازادكردنی زمانی كوردی لەو هەولانەیە، دەبێت بۆ هەمیشە میللەتی كورد گەورە تەماشایان بكات و پیرۆز ڕایانبگرێت.

(كاك ئەحمەد)، بەپێی قسەو باسەكانی ئەوەندە لە گرنگی زمان و جل و بەرگ پۆشین تێگەیشتبوو بۆ نەتەوەیەك،ئەگەر بیەوێت ڕزگاری ببێت. دەبینیت لەزۆر لەشوێنەكاندا لەم بارەیەوە قسە دەكات و هۆشداری دەداتە میللەتی كوردو ئەوانەشی لەگەڵ كورددا دەژین، دەیوت ئێمە خاوەنی زمان و جل و بەرگ و ڕەسەنایەتی خۆمانین.

---

[1] سەرچاوەی پێشوو .

وادەزانم، ئەگەر(كاك ئەحمەد)بە درێژایی خەباتی ژیانی خۆی تەنها ئەو(شۆڕشە فەرهەنگی)یەی لەناوچەكانی كوردستاندا بەرپایكردو و بەسەركەوتن گەیشت، ئەگەر تەنها ئەوە لەبەر چاوبگرین بەسە بۆئەوەی لە هەموو كوچەیەكی ئەم نیشتمانەی كورداندا بەگەورە ناوی بهێنرێت، وەك هەموو شۆڕشگێڕەكانی دیكەی دونیای خەباتی كوردی یادی بكرێتە.

لەڕاستیدا، هەروەك ئەوەی(موفتی زادە)كاری بۆ دەكرد ئەوەندەی(شۆڕشێكی فەرهەنگی) گرنگەو پێشینەیە بۆسەركەوتن و بەردەوام بوونی(شۆڕشێكی چەكداری) بەپێچەوانەكەیەوە گرنگ نییە. هەر لەبەر ئەم خاڵەشە دەبینیت(كاك ئەحمەد) هەر لەسەرەتای(ئینقلابی ئیسلامی)یەوە نائومێدی و بێتاقەتییەكی پێوە دیارەو زۆر جەخت لەسەر ئەوەدەكاتەوە ئەم(ئینقلابە) ڕوویدا كاتەكەی زۆر زووەو هێشتا میللەت تەواو ئاگادار و هۆشیارنەكراوەتەوە، -ئەم بابەتەش هەر لەناو ئەم كتێبەدا باسكراوە و خودی(كاك ئەحمەد) بەوردی باسی بێتاقەتی خۆی بەرامبەر ئینقلاب دەكات-.

كاك ئەحمەدی موفتی زادە، لەو وتارەیدا كەبە(ووتاری بۆكان) بەناویانگە. وەك سەركردەیەكی وشیار زۆر بەئاگایانەوە جارێكی دیكە باسی زمان و گرنگی زمان و هەوڵ و ماندوبوون و ئازارو ناڕەحەتیەكانی میللەتی كورد، وەبیری خەڵكی ئێران دەهێنێتەوە، لەو وتارەیدا بۆ گرنگی ئازادی زمانی كوردی گفتوگۆیەكی خۆی لەگەڵ چەند توێژەرێكدا دەگێڕێتەوە."لەبیرمە جارێكیان لیژنەی لێكۆڵینەوە لە(سەنتەری زانستی تاران)ەوە هاتبوون بۆلای من بۆ(سنە)، لەبارەی كوردستانەوە كۆمەڵێك پرسیاریانكرد یەكێك لە پرسیارەكانیان، ئەوە بوو، ئەرێ كوردەواری بۆ دانشمەند(بیریار) و زانای گەورە گەورەی كەمی لێ هەڵكەوتووە؟

ووتم، تۆ چی دەڵێیت؟! بەچی بەڵگەیەك وا دەڵێیت؟!

ووتی، بەپێی ئەوەی دوای خۆیان بەجێیان هێشتووە-مەبەست ئەو بەرهەمو بڵاوكراوانەیە نوسەرە كوردەكان بەجێیانهێشتووە(نوسەر)-... باسی زۆرم بۆ كردن، بەڵام ووتم براله:

لەوانەیە من بەقەد زۆرێك لەوانەی وا لە(تاران)دا دەنوسن، خوێنەوارم و زیاتریش لەوان، بەڵام بۆچی نانوسم؟

ووتم، حاڵی خۆمت پێدەڵێم. كەسێك بەزمانی كوردی دەنوسێت یەك زەحمەتی هەیە بیردەكاتەوە و بیرەكەی خۆی دەخاتە ناورِستەوە، بەڵام ئەگەر كەسێك بەزمانی خۆی نەنوسێت و بەزمانێكی دیكە بنوسێت، دوو زەحمەت دەكێشێت.

زەحمەتی یەكەم، (بیركردنەوە و دارِشتنی لە رِستەدا)بەئیزافەی زەحمەتێكی تر.

مرۆڤ بە شێوەی ئاسایی عادەتی وایە، شتێك كەلەفیكریدایە دەیخاتە ناو زمانی دایك و باوكییەوە، ئەمە یەك زەحمەت، دواتر دەبێت بێت ئەو رِستانە وەربگێرِێت بۆ زمانەكەی تر.

ووتم، زەحمەتی كوردەواری ئەوەیە، من كەمیقدارێك توانایم هەیە قەڵەم بەدەستەوە بگرم و بنوسم ئارەزووم ئەوەیە بەكوردی بنوسم، چونكە زەحمەتی كەمترە...

ووتم، من كاتێك خەریكم بەكوردی دەنوسم، چەمك و دەربرِین و خوازراوەكانی زمانی خۆم هەمووی دەرك دەكەم، جوان جوان دەتوانم هەمووی بخەمە سەركاغەز، بەڵام ئەگەر موكەلەفبم بەوەی، لەجیاتی زمانی خۆم بەزمانی فارسی بنوسم، ئەو تواناییەم لەدەست دەچێت، بۆ؟

چونكە وشەو چەمك هەیە بەكوردی زیاتردەیزانمو دەتوانم ماناكانی پێ برِازێنمەوەو بەفارسی نایزانم و پەكم دەكەوێت.

ووتم، کاکە گیان مەسەلە ئەوە نییە کوردەواری زانای لێ هەڵنەکوتووە، هەر ئێستا کتێبی گەورە گەورەی زۆر هەن لەکتێبخانەکاندا-دەسنوسن-کەوتوون و تۆز دەیانخوات، ئەگەر بە فارسی نەینوسیت چاپ ناکرێت..."[1].

موفتی زادە،بەمجۆرە لەسەر گرنگی زمان قسەدەکات،دەربارەی جل و بەرگی کوردو گرنگییەکەی لای(کاك ئەحمەد) لەشوێنی دیکەی ئەم کتێبەدا قسەکراوەو ئەوە باس ناکەین. لەهەموو بوارەکاندا کارو پێداگری ئەو بۆ ڕزگارکردنی(نەتەوەیی کورد) تا ئاستێك دەڕوات، ئەوکاتەی نوێنەری(ئیخوان موسلیمین) لە(کرماشان)(کاك ئەحمەد)دەبینێت تێبینی ئەوە دەکەن، ئەم پیاوە لەسەر(نەتەوە) زۆر پێداگری دەکات و داواکارییەکانی تێکەڵن،"داواکارییەکانی تێکەڵ بوون، ئێمە وەك(ئیخوان موسلیمین) هەردەم داواکاری ئیسلامیمان لە پێش داواکاری نەتەوەییەوە بووە، بەڵام ئەو داواکاری(نەتەوەیی و ئیسلامی)شی هەبوو"[2].

لێرەدا ئەو هەوڵانە بەجێ دەهێڵین کە(کاك ئەحمەد) بۆ نەتەوەیی کوردی داوە، چونکە بێماناترین کار ئەوەیە تۆ بێیت(هەوڵی دینی و هەوڵی نەتەوەیی) لەیەکتری جیابکەیتەوە، ئەوەشی تا ئێستا نوسراوە لەسەر کاری(کاك ئەحمەد) بۆ(کوردستان) بەمانای ئەوە نایەت کاتێك(کاك ئەحمەد) دەربارەی زمانی کوردی،یان جل و بەرگ و فەرهەنگی کوردی قسەی کردووە هەڵگری هیچ ناوەڕۆك و پەیامێکی دینی نەبووە، بەڵکو کارەکانی ئەو تێکەڵەن لەو دوو چەمکەو ناکرێت بە دابەشکردنییان سنور تەسك بکرێنەوە.

---

[1]) کاسێتی ژمارە(٦)، سخنرانی بۆکان، (٤٥)B

[2]) چاوپێکەوتنی کەناڵی(الجزیرە)لەگەڵ(یوسف نەدا)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.



# كاركردنی كاك ئەحمەد بۆ هێنانەدی خودمختاری

یەكێك لەو بابەتانەی لای(كاك ئەحمەدی موفتی زادە)، جێگەی گرنگی پێدان بووە و لەهەموو دانیشتن و كۆبوونەوە ڕەسمی و ناڕەسمیەكاندا كاری بۆ كردووەو ویستوویەتی هیچ نەبێت بەشێكی مافە خوراوەكانی میللەتی كورد لەو ڕێگەیەوە بسێنێتەوە، بریتیە لە(خودمختاری)-خۆبەڕێوەبردن-، ئەو خودموختارییەی (كاك ئەحمەد) كاری بۆ كردووە، بریتیە لە(خودموختارییەكی ئیسلامیانە)، چونكە ئەو لەسەر ئەو خودموختاریەی باسی دەكرێتو لەدەرەوەی بەرنامەی ئیسلامە تێبینی هەیە،و بە ڕێگەیەكی تەواوی نازانێت بۆ لابردنی ئەو هەموو زوڵمو زۆرەی بەدرێژایی مێژوو لەمیللەتی كورد كراوە،"میللەتی كورد ئەوەی دەوێت ئەو(سێ) جۆرە ستەمەی لە كۆڵبێتەوە-(ستەمی نەتەوەیی- مەزهەبی- چینییەتی)-، كەجۆرێك لەستەمەكان(ستەمی نەتەوەییە)،ئەمەش لەسەردەمی(كۆرش) تاكۆتاییەكانی(پەیمانی ئاریامهر) بەردەوامی هەبوو. كەخەڵكی لەمافە نەتەوەییەكانی بەهەر شێوەیەك بێت لەشێوەكان بێبەش كراون، ئێستا ئەو مافانە بە(خودموختاری)تەعبیردەكرێت. دیارە تێگەیشتنی جۆراو جۆریشیان هەیە بۆ ئەم چەمكە،بەڵام لەڕوانگەی ئیسلامەوە كەمێك بەرز ترەو مەسەلەی(مافی یەكسانی) مەترەحەو هەموو نەتەوەكان بەئەندازەیەك مافیان هەیە. لەسیستەمی بەڕێوەبردنی مەركەزیدا كەبە(خودموختاری)دەناسرێت، یەك حوكومەتی مەركەزی بوونی هەیەو یەك(ماف) بەڕەسمی بۆ میللەت دەناسرێت، بەڵام لە(مافی یەكسانی ئیسلامیدا) یەكەم نەتەوەكان هەن، دواتر ئەمان(شورای ناوچەی)(محەلی) دروست دەكەن، واتە




لە(خوارەوە بۆ سەرەوە)، نەك لە(سەرەوە بۆ خوارەوە)، ئەمەش جیاوازی(مافی یەکسانی ئیسلامی)یە، لەگەڵ(خودموختاری)دا"[1].

بۆیە دەبینین، هەرکاتێ کاك ئەحمەد لەسەر(خودموختاری) قسەی کردووە. هەرگیز نە یگووتووە ئێمە بەتەنها بە بەدەستهێنانی(خودموختاری) ڕازی دەبین و دەست لە داواکارییەکانمان هەڵدەگرین، بەڵکو هەمیشە بەجۆرێك قسەدەکات کە (خودموختاری) بە نیسبەت میللەتی کوردەوە مافێکی زۆر کەمە، بەڵام بۆ ئەم قۆناغە دەکرێت ئەوەندە قبوڵبکەین.

ئەوەتا لە چاوپێکەوتنەکانی دوای(ئینقلاب)و ئەو کاتەی قسەو باسی(خودموختاری بۆ کوردەکان) تەواو گەرم بوو بوو، دەربارەی ڕادەی بەدەستهێنانی مافەکانی کورد لە سیستەمی خودموختاریدا دەڵێت"ئەمە-خودموختاری-لایەنی کەمی دابینکردنی داواکارییەکانی میللەتە، واتە بەشەرعیو لە دیدگای ئیسلامەوە پێش خودموختاری، ئێمەش مافمان هەیە، بەڵام ئەمە ڕادەی کەمییەتی، لەئێستادا دەبێت ئەم(مافە کەمە) تەئمین و(جێگیر ببێت)، دواتر ئەگەر لە ڕووانگەی ئازادیو دەرکی دیمکراتییەوە بەرەوپێش چووین، بەقۆناغێك دەگەین دەتوانین لە(خودموختاری) زیاتر داوا بکەین"[2].

وەك دیارە(کاك ئەحمەد) بەدەستهێنانی(خودموختاری)بۆ کوردەکان بەکەم دەزانێت، بەڵام وەك خۆی ڕوونی کردەوە پێویستە سەرەتا لە بەدەستهێنانی ئەم مافە سەرەتاییە دڵنیابین دواتر هەنگاو بەرەو پێشتر بنێین، پێداگری(کاك ئەحمەد) لەسەر

---

[1]) چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەوانی لەگەڵ(کاك ئەحمەد)، بەهزادی خۆشحاڵی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو کوردستان، روزهای بحران ٤.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو .





بەدەستهێنانی(خودموختاری) تا ئەو ئاستە دەڕوات لەچاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ڕۆژنامەی(کیهان)دا دەڵێت"لە ئاست خودموختاری کوردەکان نابورین".

کەڕۆژنامەکە ئەم وتەیەی(کاك ئەحمەدی) کردۆتە(مانشێت)ی چاوپێکەوتنەکە، ئەو لەدرێژەی چاوپێکەوتنەکەدا دەربارەی خودموختاری بەم جۆرە قسەدەکات "خودموختاری مافی سروشتی و ئاسایی کوردستانە، ئەو داوای سەرەتایترین مافی مرۆڤی خۆیکردووە، دەربارەی چۆنییەتی خستنەڕووی داواکارییەکان لە ڕووی پلە بەندییەوە، (کاك ئەحمەد)، پێیوایە خستنە ڕووی داواکارییەکان پلە بەپلە دەبێت، بەلام دانپێدانان بەمافەکاندا نابێت پلە بەپلە بێت، دەبێت یەکجار بێتو براوە بێت"، هەروەها لە وەلامی پرسیاری(خودموختاری کوردستانی ئێران، لەگەڵ ئەوەی کوردەکان لە تورکیاو ئێران و عێراقدا دادەنیشن و بلاوبوونەتەوە، پێشەکی دروست بوونی مەرزی تازە نییە بۆ وولات(ئێران)، ولاتی ئێران نابێت خەمی ئەم پێشهاتەی هەبێت؟)، دەڵێت" لەدیداری پێشوومدا، لەگەڵ(ئیمام خومەینی) لەبارەی مەسەلەی کوردەکانی ئێران و(جەلال تالەبانی) گفتوگۆمکرد، عەرزمکرد دەتوانن(جەلال تالەبانی) بانگهێشت بکەنو پێیان بلێن، کەوولاتی ئێرانی موسوڵمانی ئازاد دەتوانێت پاڵپشتی هەموو لانەوازو ستەملێکراوەکانی دونیا بێت، لەوانەش میللەتی ستەملێکراوی کورد، کە لەمافی میللی و فەرهەنگی خۆی بێبەشکراوە، ئەمەش بە واتای گۆڕینی سنورە جوگرافییەکان نییە، نەخێر، ئێران بەردەوام هەر ئێرانە، بەلام دەتوانێت پاڵپشتی موسوڵمانی(فلیپینی)و پاڵپشتی موسوڵمانی(فەلەستینی)بکات، هەروەها پشتیوانی موسوڵمانی (ئەمریکای لاتینی و ئەفەریقا) بکات".

هەر لەو چاوپێکەوتنەدایە، پرسیاری لێدەکەن،(گوایە میللەتەکان و ویلایەتە سەربەخۆکان بەگشتی لە ڕووی ئابوورییەوە سەربەخۆن، واتە سەربەخۆیی ئیداری و فەرهەنگی و پاڵپشتی سەربەخۆیی ئابووریان بووە، کوردستان تواناو دەسەڵاتی وای هەیە؟) ئەو بۆ ئەم پرسیارە دوو وەڵام دەداتەوە:

یەکەم: هەروەك بە ڕۆژنامەنوسە بیانییەکان و نوێنەری(لۆماند)م ووت، لە ڕابردوودا سەروەت و سامانی ووڵات بەتاڵان چووە، ئەگەر ئەوەی لەکوردستان یان هەر ناوچەیەکی دیکەبەدەست دەهات بۆ ئاوەدانکردنەوە و پێشکەوتنی ئەم شوێنانە بەکاربهاتایە هەر یەك لەم ناوچانە لە ڕووی ئابوورییەوە دەیتوانی سەربەخۆ بێت، لەگەڵ زانینی ئەم ڕاستیەدا، ئێستا ئەگەر سەربەخۆی تێکەڵ بەبواری ئابووری بکەین ستەمانکردووە.

دووەم: لە ڕوانگەی دەقی قورئانی (خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً...)[1] تەواوی ئەوەی لە زەویدایە بۆ مرۆڤەکان دروست کراون، لە سوچێکی ئەم زەوییەدا، ئەگەر دەوڵەتێکی ئیسلامی بلاَونەبوو، هەر سەروەت و شتێك کەبەدەستی دەهێنن بۆ هەموو مرۆڤایەتییە، میللەتە بچوکەکانی ئێران کە لەژێر ناونیشانی ووڵاتی ئێراندا لەیەك نەخشەی جوگرافیدا کۆبوونەتەوە بەلایەنی کەمەوە جێبەجێکردنی ئەم یاسا قورئانییە کەهەر سەروەتێك لەم ولاَتەدا بەدەست بێت دەبێت بۆ هەموو میللەتی ئێران سەرفبکرێت"[2].

---

[1] {هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاء فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ }البقرة٢٩

[2] ) چاوپێکەوتنی رۆژنامەی(کیهان)، لەگەڵ کاك ئەحمەدی موفتی زادە. بەهزادی خۆشحاڵی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو کوردستان، روزهای بحران ٤

كاتێك دەگەڕێیتەوە بۆ ئەو دۆكۆمێنتانەی لەبارەی هەوڵو كۆششەكانی (كاك ئەحمەد)ەوە نوسراونو لەبەردەستدان دەبینیت، بیركردنەوەو داواكارییەكانی (موفتی زادە) بۆ بەدەستهێنانی خودموختاریو سەربەخۆیی كوردستان بەساڵ لەپێش ڕوودانی ئینقلابی ئێرانو گەڕانەوەی(ئیمام خومەینی)یە بۆ ئێران، (كاك ئەحمەد) خۆی دەڵێت" ساڵێك پێشترو، ئەو كاتەی(ئیمام) لە(نەجەف) بوو، من پەیوەندی ناڕاستەوخۆم لەگەڵی ئەنجامداوەو لەبارەی ئەم مەسەلانەوە قسەم لەگەڵ كردووەو ئەو پێشوازی لێكردوون، ئەوكاتەش گەڕایەوە بۆ ئێران، لەیەكەمین چاوپێكەوتنمدا، دووبارە ئەم بابەتەم تەرحكردەوەو ئەویش هەروەك ئەوكاتەی لە(نەجەف) داوامـلێكرد بوو قبوڵی كرد، هەروەها دوای ڕووخانی ڕژێمی لەچاوپێكەوتنە دواترەكاندا، چ لەگەڵ ئەوان،و چ لەگەڵ تەواوی مەقاماتی سیاسی دەربارەی ئەم بابەتە پێداگریم كردووە. دڵنیاشم كاتێك سیستەمێكی نوێی ئینقلابی دروست دەبێت، دەبێت سەرەتا پێیەكانی مەحكەم بێت تا ئارام ئارام بەرەو پێش بڕۆین، تائەو كاتەی دەگەین بەمەسەلەی گرنگ تر"[1].

لەگەڵ ئەو هەمووە پێداگرییەی(كاك ئەحمەد)و ڕازی بوونی بەردەوامی (ئیمام خومەینی)و سەرانی شۆڕش، كەچی لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت، ئەویش ئەوەیە، باشە، دەی ئەگەر(ئیمام) ئەوەندە وەعدی بە(كاك ئەحمەد)داوە، كەخودموختاری بەكوردەكان بدات، دواتر بۆچی ڕێگری كراوە و كۆسپی دروست كردووە لەڕێگەی ئەم پرۆسەدا؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە پێویست دەكات وتەی(كاك ئەحمەدی موفتی زادە)، خۆی بگوازینەوە"ڕاستییەكەی ئەمەیە

---

[1]) چاوپێكەوتن لەگەڵ( كاك ئەحمەد). بەهزادی خۆشحاڵی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو كوردستان، روزهای بحران ٤.





هەندێك نەگونجان(ناهەماهەنگی) لەناوخۆماندا بووەتە هۆی دروست بوونی ئەمە، چەند بابەتێك هەیە، پێویست ناکات ئاماژە بەهەموویان بکەم. بۆ نمونە، ئێمە لە(تاران) سەرگەرمی ئەم بابەتانەو لێکۆڵینەوە بووین دەربارەی ئەو بابەتانەی لە بارەیانەوە جیاواز بووین، لە ڕۆژنامەکاندا بلاّوەدەبوویەوە و دەبوویە مایەی ترس لەلای خەڵکی. زانیاریتان هەیە-مەبەستی ئەو ڕۆژنامەنوسەیە چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ سازداوە-، کەخودی(بەڕێز موهەندیس بازرگان) خۆی پەیوەندی دروستکرد کەئەم بابەتی(خودموختارییە) دەبێت بدرێت بەدەوڵەت، هەربەوشێوەیە کاتێ بەڕێز(تاڵەقانی) لێرە بوو نزیکەی دوانزە سیانزە ڕۆژ، ڕادیۆو تەلەفزیۆن بانگهێشتیانکردم بۆ بابەتەکانی کوردستان و هەروەها لەلایەن(شورای ئینقلابەوە) بەتەلەفۆن بانگهێشتکرابووم بۆ داڕشتنەوەی دەستوری ئەساسی، کەبەگشتی لەم بابەتەدا کاری باش و بەهێزنەکرا، ئەمە جگە لەوەی کاتێك(بەڕێز تاڵەقانی) لێرەبوو لەلایەن ڕۆحانییەکانەوە بابەتێکی(٢٧) ماددەی ئامادەکرا، ئەمەش بەناونیشانی زەمینەسازی بوو، نەك بەناونیشانی تەرحی کۆتایی، چونکە تەرحی کۆتایی دەبێت لەلایەن زانایانی میللەتەوە ئامادەبکرێت، کەکاتێك کاری پێکرا قابیلی ڕەخنەو ئیعتیراز نەبێت، بەگشتی هەرچەندە کۆتایی مانگی(اسفند)* هەوڵمدا، بەلاّم ئەو هۆکارانە هاتنەپێشەوە، کەدانیشتنەکانمان لە(سەقز) تێکچوو، لەبەرئەوەی بڕیار بوو یەکەم جار(ڕۆحانییەکان) کۆببنەوە و بۆچوونەکانی خۆیان یەکلایی بکەنەوە، پاشان بانگهێشتی کۆمەڵەکانی دیکە بکەن و ئەوانیش پێشنیارەکانیان پێشکەش بکەن، لەکۆی ئەم پێشنیارانەش، یەك بابەتی کولی ئامادەبکەن و یەك دەستەی نوێنەران بنێرن بۆ(تاران) و لەسەر ئەو بابەتانەی پێیانە کاریکەین، لە(سەقز)لەسەر ئەم بابەتە کارم دەکرد کە(دەستەی

*) اسفند: ڕەشەمێ، سێیەمی مانگی زستان، مانگی دوازدەهەمی ساڵی ئێرانی. فرهنگی فارسی – کوردی، دانشگای کردستان، ح ١ – لا ١٨٠.

نوێنەران) دیاری بکەین، بەڵام ڕووداوی کوردستان ڕوویداو کاری ئێمە دواکەوت. دوای ئەوەی کە(موهەندیس بازرگان) ڕەزامەندی خۆی دەربڕی، سەبارەت بەم بابەتەو دووبارە منی پێش لەهەڵبژاردن بانگهێشتکرد، ویستم تەلەفۆن بۆ بەڕێز(قاسم لۆ) بکەم، بەڵام تەلەفۆنی پێنەبوو، (بەڕێز حسەینیش) تەلەفۆنی پێنەبوو، بەڵام کەسێکم ڕاسپارد لەگەڵ ئەو بەڕێزانەدا قسەبکات تا لەشوێنێکدا کۆببینەوەو قسە بکەین، بەڵام بابەتەکانی کۆبونەوەکەی (سنە) بووە هۆی ئەوەی دووبارە کارەکەی ئێمە دوا بکەوێت. هەر لەو کاتەدا دووبارە کەسێکم نارد بە دەلیلی ئەوەی ژمارەیەك لە برادەرانی کوردی(شیعە) لەمەڕ ڕووداوەکانی ڕیفراندۆمەوە نارازی بوون و ژمارەیەکیان هەر بەشدارییان نەکردووە، هەتا زانیاریان هەیە خەڵکیان کۆکردۆتەوە،و وتویانە کەئێمە نامانەوێت لەگەڵ کوردەکاندا بین، ئەم کۆمەڵە بابەتانە بەگشتی پێشنیارمکرد، کەشوێنی کۆبوونەوەمان لە(کرماشان) بێت، هەم ئاشتکردنەوە بێت، هەم ئەوەی(کرماشان) گەورەترین شاری کوردستانە. وا بیردەکەمەوە ئێستا کێشە زۆر لە لایەنی دەوڵەتەوە نەبێت دەربارەی بابەتی خودموختاری، دەبێت لە لایەن ئێمەوە بە جدی هەوڵی بۆ بدەین، پاشان باسی بکەین"[1]. وا دەزانین لێرەدا ڕوون بوویەوە هۆکاری بەدەست نەهێنانی(خودموختاری) کوردستان، لەسەرەتادا پەیوەندی بەیەکرِیزی سەرکردایەتی کوردەوە هەبووە، کەئاسان نەیانتوانیوە لەسەر داواکارییەکانی کورد ڕێك بکەون و لەبەرامبەر سەرانی شۆڕشەوە یەك قسەبن. لەڕاستیدا دوای ئەو هەوڵانەی، کە پێشتر لە زاری(کاك ئەحمەد)ەوە گواستمانەوە، دەربارەی بەدیهێنانی(خودموختاری)، ئەو تەنها بەو هەوڵانە دەست لەم داواکارییە گرنگ و سیاسیە هەڵناگرێت، بەڵــکو دێت لەڕێگەی بەستنی کۆنفرانسێکەوە (۲۰ خرداد/۱۳۵۸) لەشاری(سنە) بەسترا، دووبارە ئەو باسە

[1]) چاوپێکەوتنی(کاك ئەحمەد)، بەهزادی خۆشحاڵی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو کوردستان، روزهای بحران




دەوروژێنێتەوەو دەیەوێت بەهەر جۆرو نرخێك بووە، ئەو خودموختارییە لەو قۆناغەدا گەورەترین دەسكەوتە بۆ ناوچە كورد نشینەكان بەدەستی بهێنێت.

بۆ ئەم مەبەستە(كاك ئەحمەد) دێت، لەڕێگەی دەعوەتنامەوە تەواوی سەركردایەتی ئەوكاتەی كوردو هەموو ڕێكخراو و لایەنی پەیوەندی دار بەو بابەتەوە ئاگادار دەكاتەوەو داوایان لێدەكات لەو كۆنفرانسەدا بەشداری بكەن. (كاك ئەحمەد) لەدەعوەت و ئاگاداری نامەكەیدا، كەلە ڕۆژنامەی(ئیتلاعات) ژمارەی ڕۆژی(١٣٥٨/٣/١٨)دا بلاّوكراوەتەوە، بەم شێوەیە داوادەكات بەژداری كۆنفرانس بكەن:

## بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

هاونیشتمانییە خۆشەویستەكان! ئەو گرفتاری‌و مەحرومەتیانەی میللەتی كورد لە زەمانی بەردەوام بوونی دەستەلاّتی ستەمكارانی شاهنشاهی لە كورشەوە تا ئاریان مهر تەحەمولی كردووە و بەرگری كردن و كۆششی ئەم میللەتە لەپێناوی لابردنی زولم و زۆر زیاتر لەوەیە وەسف بكرێت. ئێستاش كە هەستانەوەی میللەتە موسلّمانەكانی ئێران بە بەرهەم گەیشتووە و لەجیاتی سیستەمی ستەمكاری شاهنشاهی سیستەمی دادپەروەری جمهوری ئیسلامی جێگیربووەو لێپرسراوانی كۆمەلّگا لەبەرامبەر داواكارییەكانی میللەتی كورد، لەوانە پرۆژەی مافی خودموختاری، پشتگیری خۆیان دووپاتكردۆتەوە، هەر تاكە مرۆڤێكی وشیارو دلّسۆزی كورد بەرپرسیارە كە ئەوپەڕی توانایيەكانی خۆی لە ڕێگەی بەكارهێنانی دروست و سەركەوتن و بۆ خۆشی و مسۆگەری ئایندەی میللەتی كورد بەكاربهێنێت.

ڕون و ئاشكرایە، كە لەم جۆرە پرسانەدا تاكێك یان چەند كەسێكی میللەت حەقی بڕیاردانیان نییە، بەلّكو تەنها ڕێگەی لۆژیكی كۆبوونەوەی چەند تاكێكە لە هەموو گروپ و توێژە سیاسیە جیاوازەكان، تا لەم ڕێگەیەوە كۆمەلّێك بۆ نوێنەرایەتی



هەڵبژێرن. ئەم کۆمەڵە پرۆپۆزەڵی پێویست بۆ وتوێژکردن لەگەڵ گەورە لێپرسراوانی میللەت ئامادەدەکەن، ئەو کەسانەی لەم ڕێگەیەوە هەڵدەبژێرێن دەتوانن خۆیان بە نوێنەری میللەت بزانن، بەنوێنەری میللەت لە خەیرو خۆشی ئەواندا. بۆ هێنانەدی ئەم پرسە گرنگەو دروستکردنی ئەم جۆرە گروپە جارێك لە(سەقز)و جارێك لە(کرماشان) هەوڵی بۆ درا، کەبەداخەوە هەندێك ڕوداو بوونە هۆی بەنەتیجە نەگەیشتنی کۆتا، بەلاّم بەهەرحاڵ ناتوانرێت لەبەر هەندێك ڕوداو چاوپۆشی بکرێت لەوەی مایەیی ئازادیو خۆشگوزەرانی میللەتی کوردە. بەناچاری جارێکی تر لەبانگهێشت نامەیەکدا هەموو کەسایەتییە دڵسۆزەکانی کورد بانگهێشت کرانەوە، کەلە (٢٠ خورداد)ی مانگی ئایندەدا ئامادەبنو پاش موناقەشەو لێکدانەوەی بیرو بۆچوونە جیاوازەکانو هەڵبژاردنی باشترینی ئەوان، کۆمەڵێك وەك نوێنەر هەڵبژێرێن، بۆئەوەی باشترین پرۆپۆزەڵ بۆ هێنانەی دی داواکارییە جۆراوجۆرەکانی میللەت، لەوانەش هێنانەدی مافی خودموختاری کوردستان لە چوارچێوەی جمهوری ئیسلامی ئێران بێتەدیو چاودێری بکرێت. بەم شێوەیە داوا لە هاونیشتمانییە کوردە خۆشەویستەکان دەکەین، کە بەشداری بکەن و لەهەموو جۆرە کینەو ڕا جیاوازە تایبەتەکانی خۆیان چاوپۆشی بکەنو بەرژەوەندی میللەتی کورد لەپێش هەموو تێبینییەکانی ترەوە ڕەچاوبکەنو لە کۆنفرانسی ڕۆژی(٢٠ خورداد) بەشداری بکەن.

بەشداربووان دەبێ لەکاتژمێر(٧:٣٠)سەرلەبەیانی (٢٠ خرداد) لە مزگەوتی(جامعە) ئامادەبن، شوێنی کۆبوونەوەو پێشوازی و حەسانەوە پێشتر ئامادە کراوە.

**وسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته**

**براتان/ ئەحمەدی موفتی زادە**

**١٣٥٨/٣/١٨**





وەك دیارە(كاك ئەحمەد) لەو دەعوەت نامەیەدا زۆر بەجوانی مەبەست و نییەتی خۆی لەگرتنی ئەم كۆنفرانسەو گرنگی كۆنفرانس بەنیسبەت كوردەوە دەخاتەڕوو، زمانی نوسین لای(موفتی زادە) یەكێكە لە بابەتە گرنگەكان، كەدەكرێت لەبارەیەوە توێژینەوەی گرنگ ئەنجام بدرێت. لەم دەعوەتنامەیەو زۆرێك لەو ئاگادارنامەو كتێب و وتارانەی نوسیویەتی گرنگی بە زمانی نوسین و چۆنییەتی خستنە ڕووی داواكاریەكانی داوەو مەبەستی بووە لە ڕێگەی بەكارهێنانی كەمترین ڕستەو ووشەوە زۆرترین پەیام بگەیەنێتە كەسی بەرامبەر.

هەروەك لە پێشتریشدا لە بارەیەوە قسەكرا، (كاك ئەحمەد) دڵنیابووە بەهەوڵ و لێدوان لەو دۆخەی ئەوكاتەی كوردستانی تێكەوتووە مافی خودموختاری دەستەبەر نابێت، بۆیە دەبینیت-بەتایبەت لە ناوچەیەكەوە سەفەردەكات بۆ ناوچەیەكی دیكەو بەوپەڕی هێزەوە هەوڵ دەدات مەسەلەی خودموختاری و مافە تایبەتی و گشتیەكان ڕوون بكاتەوەو هۆشداری بداتە خەڵكی، كە لەبەردەم چی گۆڕانێكی گەورەی مێژوویدان. لێرەدا گرنگە ئەوە بوترێت، یەكێك لەو سیفاتە گرنگانەی لەناو(كاك ئەحمەدی موفتی زادە) بەناونیشانی خەمخۆرو سەركردە ڕەنگی داوەتەوەو زۆر ئاسان دەتوانرێت دەركی پێ بكرێت، مەسەلەی ڕۆشنبیركردن و ئاگادار كردنەوەی هەموو چین و توێژەكانی خەڵكیە لەوبابەتانەی ڕۆژانە ڕوودەدات. ئەمەش دەبێتە گرنگترین خاڵێك، وای كردووە(موفتی زادە) ئاسان دەركەوێت و بەدیارترین و جەماوەریترین سەركردەی كوردی ئینقلاب ئەژمار بكرێت، هەرچەند خۆی لەم بارەیەوە دەڵێت"تائێستا سەرژمێرییەك لەبەردەستدا نییە ئەوە بسەلمێنێت..."[1].

---

[1]) چاوپێكەوتنی ڕۆژنامەوانی لەگەڵ كاك ئەحمەدی موفتی زادە. بەهزادی خۆشحالی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو كوردستان، روزهای بحران ٤

دیارە ئەم وەڵامە لە ئەنجامی پرسیاری یەكێك لە ڕۆژنامەنووسەكانەوە دێت، كاتێك دەربارەی زۆری لایەنگری كوردەكان بۆ(كاك ئەحمەد) لەوانی دیكە زیاترە.

بەمجۆرە دەبینین، (موفتی زادە) بۆ ڕوونكردنەوەی حەقیقەتی خودموختاری‌و وەڵامدانەوەی ئەو تەنگەژێیانەی بۆ ئەم بابەتە گرنگە دروستكراوە هەمیشە لەسەردانكردنی شارەكاندا بووەو بەبەردەوامی لە ڕۆژنامەكاندا چاوپێكەوتنەكانی بلاوكراوەتەوە.

لەسەفەرێكیدا كە چەند ڕۆژێك پێش ئەنجامدانی كۆنفرانسەكەی(سنە)یە، بەسەردان دەچێتە(كرماشان) و لەوێ لەكۆبوونەوەیەكی جەماوەریدا لە(مزگەوتی شافعی) دەستدەكات بەڕوونكردنەوەی بابەتی خودموختاری و مەسەلەی(دەستور)ی وولات‌و گرنگی‌و پێگەی میللەت لەم دەستورەداو زۆر بە ڕاشكاوانە ئەوە دووبارە دەكاتەوە، ئەوە مافی موسوڵمانانی ئێمەیە كەقانونی ئەساسی لە ژووره داخراوەكاندا قبوڵ نەكەن، بۆیە بڕیاردراو لەهەر پارێزگایەك دوونەفەر بۆ ئەو مەبەستە دیاریكرا...، هەروەها دەربارەی خودموختاری دەڵێ"خودموختاری، تەنها بۆ كوردستان نییەو كۆماری ئیسلامی‌و هەموو چینەكانی(بلوچ-عەرەب-كورد- توركمان‌و فارس) دەگرێتەوە، ئەمەش پایەی ناسیۆنالیستییە"[1].

هەروەها، ڕۆژنامەی(ئیتلاعات) نوسینگەی(سنە)ی، دەربارەی گەڕانەوەی (موفتی زادە) بۆ(سنە)و كۆششەكانی بۆ ڕوونكردنەوەو قسەكردن لەسەر خودموختاری كوردستان بەمجۆرە هەواڵەكە بلاودەكاتەوە"عەلامە موفتی زادە، دوای(بیست و پێنج) ڕۆژی دووری لەكوردستان گەڕایەوە(سنە)، لەلایەن ژمارەیەكی زۆری خەڵكی شارەكانی كوردستانەوە پێشوازی لێكرا، ئەو لەناو پێشوازی كەران‌و لە(میدان ئازادی)(سنە) و دەوروبەری(زانكۆی كوردستان)، دەربارەی خودموختاری ئەو

[1]) هەواڵی ڕۆژنامە(ئیتلاعات) ڕۆژی(١٣٥٨/٣/١٩)، بەهزادی خۆشحاڵی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو كوردستان، روزهای بحران ٤





پارێزگایە قسەی کردوو ئاشکرای کرد،"خودموختاری هەموو پارێزگاکانو بەتایبەت کوردستان ئەبێت لەقانونی ئەساسیدا پێش بینی کرابێت، پێشنیاری بابەتی خودموختاری لە هەندێك ناوچەی کوردستان بۆتە هۆی خاڵی جیاوازی نێوان برادەرانی(شیعەو سوننە) من چوومە ئەو ناوچانەو ڕوونم کردەوە، کەلەناوچەی بەرفراوانی کوردستاندا(سوننی و شیعە) پێکەوە ژیان دەگوزەرێنن و خودموختاری کوردستان بۆ هەموو خەڵکی ئەو ناوچانەیە".

ووتیشی" لە بنەڕەتدا خودموختاری بەو مانایە نییە، کەئێستا بڵاوبۆتەوە ئەوانەی کوردنین لەکوردستاندا مافی ژیانیان نییە. ئەم شیعارانە لە لایەن دوژمنانی کوردو نەژاد پەرستەکانەوە بڵاودەکرێتەوە، تــاهەستی نەتەوەیی خۆتان بۆ پارێزگاری کردن لە کوردستان بپارێزن، بەڵام غێر کوردەکان تا ئەو کاتەی دەیانەوێت لە کوردستاندا بژین، پێڵاویان لەسەر چاوانە خزمەتگوزاری و دابینکارییەکانی ئەوان بۆ ئێمە جێگەی گرنگی پێدانە"[1].

[1] ڕۆژنامەی(ئیتلاعات)(١٣٥٨/٣/١٧)، بەهزادی خۆشحاڵی: عەلامە ئەحمەدی مرفتی زادەو کوردستان، روزهای بحران ٤

# ڕۆژی دەستپێكردنی كۆنفرانس

دوای ئەو هەموو ڕوونكردنەوەو داواكاریو باسكردنەی سەبارەت بەگرنگی (كۆنفرانسی سنە) بۆ بەدەستهێنانی(خودموختاری) بۆ كوردستان،بەئامادە نەبوونی ژمارەیەك لەسەركردەو كەسایەتی دیاری بزوتنەوەی سیاسی كوردستان لە ڕۆژی خۆیدا(٢٠ی خوردادی ١٣٥٨) كۆنفرانس بە ووتارێكی(كاك ئەحمەدی موفتی زادە) دەستی پێكرد.

بەپێی ئەو زانیاریانەی ڕۆژنامەی(كیهان) لە ڕۆژی(١٣٥٨/٣/٢١)، واتە ڕۆژێك دوای كۆنفرانسەكە بلاْویكردۆتەوە، ئەو لایەنانەی بەشداریان لەكۆنفرانسەكەدا نەكردووە و كورسیەكانیان بەخالْی دانراوە، بریتی بوون لە:

(سەید عیزالدین حسینی، كۆمەڵەی مامۆستایانی كوردستان، كۆمەڵەی پارێزگاری لە ئازادی و ئینقلابی كوردستان، شورای هاوكاری كۆمەڵەكانی كوردستان، ڕێكخراوی چریكەكانی فیدای خلق شاخ كوردستان، ڕێكخراوی ئینقلابی زەحمەت كێشانی كوردستان و خوێنكارانی زانكۆ و خوێنكارانی پێشەنگ).

ئەو لایەنو ڕێكخراوانەشی، لەگەڵ ئەنجامدانی ئەم كۆنفراسەدا بوونو بەشداریان كردووە بریتی بوون لە: (گروپی عەدالەت ویستانی كوردستان، گروپی ئیسلامی نەصر، ئەنجومی ئیسلامی بازاڕەكانی سنە، ئەنجومەنی ئیسلامی"دانش اموزان"، ئەنجومەنی ئیسلامی گەنجان، ئەنجومەنی ئیسلامی خوێندكارانی زانكۆ)[1]،

---

[1] ) ڕۆژنامەی(كیهان) ڕۆژی ١٣٥٨/٣/٢١ (كونفرانس با سخنان موفتی زادە شروع بە كار كرد). بەهزادی خۆشحالْی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو كوردستان، روزهای بحران ٤.

هەرچەندە بڕیاریش بووە خودی(د. عبدالرحمان قاسملو) لەو كۆنفرانسەدا بەشداری بكات.[1] بەلاّم بەداخەوە ئەویش لەبەر هەر هۆیەك بووە ئامادەی كۆنفرانس نەبووە.

"دەوڵەت داواكاری ئەوە بووە كەپێشنیاری گشتی بۆ(خودموختاری كوردستان) لەلایەن نوێنەرانی خەڵكی كوردەوە بخرێتە ڕوو، تـادوای شیكردنەوە و لێكۆڵینەوەو خوێندنەوەی تەواوی، لەولاّتدا بێتە هەڵبژاردن یان ڕەدبكرێتەوە، هەربۆیە كۆنفرانسی ئەمڕۆمان ئەنجامداوە، بابەتی سەرەكی ئەم كۆنفرانسە خستنە ڕووی پێشنیاری خودموختارییە لەلایەن نوێنەرانی هەڵبژێردراوی خەڵكەوە، بەلاّم وەبیرهێنانەوەی ئەم خاڵە گرنگە، ئەگەر ئەنجامی واقیعی و داواكاری گشتی خەڵـكی كـورد لەم كـۆنفـرانسەدا نـەیەتە بـەرهـەم ئامـادەی ڕێكخستنی كۆنفرانسگەلێكی ترین لەهەر نوقتەو شوێنێكی كوردستان تاهەر كەس فیكرو تێبینی و پیشنیارێكی بۆ خودموختاری هەیەتی بەبێ پەردە بیخاتەڕوو، تەنانەت ئەگەر لە ئاستێـكی مـوخـالـیفیشدا بێت"[2] ئەمە وتـەی دەست پـێـكی (كاك ئەحمەدی موفتی زادە)یەلە كۆنفرانسی(بیستی خرداد) لە شاری(سنە).

ئەو لەو وتارەیدا كە بۆ بەدەستهێنانی خودموختاری ڕێكی خستووە تیشكی خستۆتە سەر زۆر مەسەلەی گرنگ، هەر لەسەرەتای قسەكانیدا ئاماژە بەوەدەكات هۆكارێكی دەمارگیر لەپشتی دیاری كردنی شاری(سنە)وە نییە بۆ ئەم كۆنفرانسە، "دەبێت بڵێم هەڵبژاردنی(شاری سنە) بە ناونیشانی شوێنی ڕێكخستنی كۆنفرانسەكە،بەهۆی دەمارگیری شاری، یان لەپێش بوون‌و بانگەشەی

---

[1]) ئەحسین حمە غریب، دواییینەكان، چاپی یەكەم، ٢٠٠٧، ل ١٩٦.

[2]) كونفرانس بە سخنان موفتی زادە مشروع بە كاركرد، بەهزادی خۆشحاڵی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو كوردستان، روزهای بحران ٤.

ئایدۆلۆژیایەكی تایبەت یان كەسێكی تایبەت نەبووە، بەڵكو مەسەلەی دابینكردنی خواستەكانی گەلی كوردە، هەر كەسێكیش دڵسۆزی گەلی كورد بێت خوازیاری ئەم جۆرە كۆبوونەوانەیە"[1].

لەڕاستیدا گرنگە ئاماژە بەوە بكەین(كاك ئەحمەد) لە چاوپێكەوتنێكیدا، لەگەڵ ڕۆژنامەی(تهران مصور) دەربارەی سەنتەری كوردستان لە كاتی بەدەستهێنانی خودموختاریدا؟ ئەو دەڵێت"من خوازیارم شاری قارەمان، شاری(كرماشان) بەناوی(سەنتەری ایالن) خودموختاری كوردستان هەڵبژێردرێت، هەر بۆ ئەم بابەتەش لە خاوەن بیرو بۆچوونانی كورد داوامكردووە بۆ ڕێكخستنی پێشنیاری كۆتایی خودموختاری لە(كرماشان) كۆببینەوە-دیارە ئەم چاوپێكەوتنە مانگێك دوای-كۆنفرانسی سنە- ئەنجام دراوە-، كوردەكانی ناوچەی(كرماشان) لە ڕووی حەماسی و میللیەوە بێئەندازە بەهێزو پەیوەستن"[2].

(كاك ئەحمەدی موفتی زادە) لە درێژەی قسەكانی كۆنفرانسدا، باسی جیاوازی خودموختاری لە سیستەمی ڕۆژئاواو سۆسیالیستی، لەگەڵ خودموختاری لەسیستەمی ئیسلامیداكردووە، ئەو بەمشێوەیە جیاوازی لە نێوان ئەو دوو سیستەمەدا بۆئامادەبوان ڕوونكردۆتەوە،"ئاساییە كەئەم پێشنیارە-پێشنیاری خودموختاری- لەسەر بنەمای فەلسەفەی سیستەمی ئیسلامی بێت، لەبەرئەوەی نە لەسیستەمی خۆرئاوایداو نەلەسیستەمی سۆسیالیستیدا پێشنیاری خودموختاری تەواو دیمكراتی و لەسەر بنەمای مافی میللی و محەلی نییە، چونكە

---

[1]) سەرچاوەی پێشوو.

[2]) ڕۆژنامەی(تهران مصور) چاوپێكەوتن لەگەڵ علامە موفتی زادە،(١٣٥٨/٤/٣)، بەهزادی خۆشحاڵی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو كوردستان، روزهای بحران ٤

لەم جۆرە سیستەمەدا هێز (لەسەرەوە بۆ خوارەوە) دەنوسرێتەوە، بەلاّم لە سیستەمی ئیسلامیدا لە لای میللی و چینایەتی كاریگەرییەكی نابێت، هێز لەدەستی(شورا) ناوچەییەكاندایەو لەكۆتایدا فەرمان لە شورای بەرزدەبێت، ئێمە هەوڵی خۆمان دەدەین، یەك پێشنیاری گشتی بخەینە بەردەم دەوڵەت، كەتەواوی مافەكانی خەڵكی كورد دابینبكات لە ڕووی خودموختارییەوە"[1]. ژمارەی ئەو نوێنەرانەی بەشداریان لە كۆنفرانسەكەداكرووە زۆربووە، هەر كەسێكیان بەپێی پێگەو توانی خۆی لەكۆنفرانسەكەدا قسەی كردووە و دەربارەی بەدەستهێنانی خودموختاری پێشنیاری خستۆتە بەردەم ئامادە بووان، هەروەها لەو كۆنفرانسەدا هەر نوێنەرێك لە پاڵ پێشنیارەكانیدا بۆئامادەنەبوونی تەواوی نوێنەری گروپ و لایەنەكانی دیكەی كورد ئەسەفی دەربڕیوەو ئومێدیان خواستووە ئامادە نەبوونیان نەبێتە مایەی نانەوەی جیاوازی و تەفرەقە دروستكردن و هۆكاری دیكە لە پشتی ئامادە نەبوونەكەیانەوە بێت .

(ئایەتوڵا جلیلی)، كە نوێنەرێكی خەڵكی(كرماشان) بووەو لەو كۆنفرانسەدا بەشداری كردووە، لەكۆتایی قسەكانیدا لەپاڵ گرنگی و یەكرِزی و یەكێتی بووندا، ئەسەفی دەربڕیوە بەهۆی ئامادە نەبوونی هەموو نوێنەرەكانەوە.

(پریوش ڕەجبی)، نوێنەری ژنانو ئەنجومەنی ئیسلامی سنە، لەبەر ئامادە نەبوونی هەندێك لە گروپ و كەسەكان زۆر گلەیی كردوو،وتی"ئەم بەشداری نەكردنانە بۆ من بەناونیشانی یەك كەسی ئازادیخواز دەلیلێكی باوەڕ پێكراوی نییە، مەسەلەی گرنگی چارەنوسی گەلی كوردە، نەك ناكۆكی باوەڕو فیكری".

---

[1]) اغزیە كنگرە سنندج, روزنامە انیگان, ۱۳۵۸/۳/۲۱، بەهزادی خۆشحاڵی: عەلامە ئەحمەدی مرفتی زادەو كوردستان، روزهای بحران ٤

هەروەها (عەزیز عەبدول قادر پور شەریعەت)ووتی"هیوادارم بەشداری نەکردنی (ئایەتوڵلاّ حسینی) لەم کۆنفرانسەدا نەبێتە هۆی دووبەرەکی لەگەڵ ڕابەرەکانی دیکەدا، تـا ئەو کاتەی(کـاك مـــوفـتــی زادە) داواکارییەکانی خەڵکی کورد لـە حوکومەتی مەرکەزی دەکات، بەدڵێکی پڕ لە خۆشەویستی بۆ(مەهاباد) بڕواتە دیدار لەگەڵ(ئایەتوڵا حسینی) سازبکات"[1].

دانیشتنی یەکەم ڕۆژی کۆنفرانسی(سنە) بۆ خودموختاری کوردستان، بەدیاری کردنی(١٠٠) نوێنەر لەو نوێنەرانەی بەژداری کۆنفرانسەکەیان کردبوو کۆتایی هات. بۆ ڕۆژی دواترو لەکۆتایی دانیشتنەکەدا، لەنێوان(١٠٠هەڵبژێردراو)ەکەدا (١٥) کەسیان بەناونیشانی نوێنەری خەڵکی بۆ دانیشتنو پێدانی موزەکەرات بەدەوڵەت دیاریکران"[2]. لەگەڵ ئەوەی حوکومەتی ئەوکاتەی(ئێران) هیچ هاوکاری و ئاسانکارییەکی بۆ ئەم کۆنفرانسە گەورە نەکردووە، بەڵکو هەمووی لەسەر ئەرکی سەرشانی(کاك ئەحمەد) و ئەوان بووە، پارێزگاری(سنە)ش بەژداری لە کۆنفرانسەکەدا نەکردووە، (دکتۆر یونسی) هۆکاری بەشداری نە کردنەکەی دەگێڕێتەوە بۆئەوەی ئەو فەرمان بەرێکی دەوڵەتەو، وەك فەرمانبەرو کاربەدەستی دەوڵەت ناتوانێت بەشداری لەکۆنفرانسی وادا بکات،"من یەك پلەی دەوڵەتیم، لەبەرئەوەی حوکومەت نایەوێت لەم جۆرە کۆبوونەوانەدا، کەتایبەتە بەخەڵکی خۆیان دەستتێوەردان ئەنجام بدات، بۆیە بەشداریم نەکردووە، بەلاّم بەناونیشانی کەسێکی ئازاد، نەك پارێزگار، دەڵێم دەبوایە ناکۆکیەکان لەناوببرێت و هەموو

---

[1]) ڕۆژنامەی(ایندەگان)١٣٥٨/٣/٢١، بەهزادی خۆشحالی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو کوردستان، روزهای بحران ٤.

[2]) سەرچاوەی پێشوو

گروپەكان لەم كۆبوونەوەدا بەشداریان بكردایە تا رێگە چارەیەكی كامڵتریان دەدۆزییەوە، ئەمەش رەئی شەخصی خۆمە.

نوێنەران لەم كۆنفرانسەدا لەبارەی بابەتێكەوە قسەیاندەكرد كەلەدیدی خەڵكییەوە بایەخ پێدراوە...."[1].

وەك دەستوری هەموو كۆنفرانس و كۆبوونەوەیەك، دوای دانیشتنەكان بەشداربووان، لەگەڵ رۆژنامەو میدیاكاندا بەگشتی دەكەونە گفتوگۆو لەبارەی چۆنییەتی بەرێوەچوونی كۆنفرانسەكەوە بیروڕای خۆیان بەجەماوەر دەگەیەنن.

كاك ئەحمەدیش، بەعینوانی هەڵسوڕێنەرو رێكخەری كۆنفرانسەكە،بۆ وەڵامدانەوەی چەند پرسیارێكی گرنگ لەگەڵ رۆژنامەی(ایندەگان) دەكەوێتە گفتوگۆ، ئەو سەرەتا دەربارەی، ئەنجامی بەدەست هاتووی كۆنفرانس، تا چی ئەندازەیەك دەتوانێت لەدابینكردنی داواكانی خەڵكی كورد كاریگەری بەجێ بهێڵێت؟ دەستی بەقسەكردوو وتی"تاقە كۆنفرانسێ دەتوانێت بانگەشەی نیشتمانی و خەڵكی هەبێت، هەر ئەو كۆنفرانسەی ئێستای(سنە)یە، لەبەرئەوەی ئەگەر بەشێوەیەكی تەدریجی هۆكاری خەفەكردنی پێشوو تواناى كۆبوونەوەی فراوانی بەتەواوەتی لە رووی نەفسییەوە جێ بەجێ نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا داغڵ بوونی گروپەكانی خەڵكی لەدورترین خاڵەكانی باكور و باشوری كوردستان گرنگی پێدانی خەڵكە بەپاشەرۆژی خۆیان و دڵنیاییە بەئیشی ئەم كۆنفرانسە".

دووەم پرسیار كە( موفتی زادە) لەبارەیەوە لێدوان دەدات و بەراشكاوی بیرو بۆچوونی خۆی دەردەبڕێت، پرسیارە دەربارەی هۆكاری بەشداری نە كردنی هەندێك

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

لە نوێنەری گروپ و لایەنە سیاسیەكانی كورد لەم كۆنفرانسەی بەدەستهێنانی خودموختاری كوردستان؟

"هیوادارم بەشداری نە كردنی هەندێك لە برادەران هۆیەك نەبێت زیان لەسودەكانی خەڵكی كورد بدات، هەڵبەتە بە بۆچوونی من خوگرتنە بەو تەفرەقەی(٢٥٠٠) ساڵەوە كەبەشێوەیەكی ئاسای رێگەپێدانی كۆبونەوەی گشتی لەخەڵكی دەگرت، ئەمەش بۆ یەكەمجارە لەمێژووی میللەتی كورد شێوە كۆنفرانسێكی بەو شێوە بێتەدی، هەر لەبەرئەم هۆیەش شوێنی بەڕێوەبردنی كۆنفرانسەكانی ترمان كەهەموو خاوەن بیرەكانی كورد بتوانن بەشداربن بە كراوەیی هێلاۆمانەتەوە، واتە شوێنی كۆنفرانسەكە دیاری نەكراوە".

یەكێكی دیكە لەو بابەتانەی بووبوویە جێگەی پرسیارو ئەو گروپانەی بەشداریان لە كۆنفرانسەكەدا نەكرد، كردوویانە دەسكەلای خۆیان و هێرشیان پێدەكردە سەر كۆنفرانس و لە دژی كۆبوونەوەكە بەیاننامەیان بلاۆدەكردەوە، بریتی بوو لەبابەتی(٨ مادده)ی داواكاری خەڵكی كوردستان.

ڕۆژنامەی(ایندەگان) لە بارەی ئەم بابەتەوە، بەمشێوەیە پرسیارەكەی ئاڕاستەی (كاك ئەحمەد) كردووە:

"وەلاّمتان لەبارەی بلاۆكردنەوەی بەیاننامەكانی هەندێك لەگروپەكانی دەوروبەرەوە، كەتەئكید لەسەر(هەشت مادده)ی داواكارییەكانی خەڵكی كورد دەكەن؟

جیاوازی داواكارییەكانی ئەم كۆنفرانسە لەگەڵ(قەتع نامەی ٨ ماددەی) لەچەند لایەكەوەیە:

**یەکەم:** داواکاری ئەم کۆنفرانسە ئەوەیە، بابەتی خودموختاری کاملترو بەشێوەیەکی هەمەلایەنە تر بخاتە ژێر شیکارییەوە.

**دووەم:** ئەوەی لە(قەتع نامەی ٨ ماددەی)دا بۆ زەحمەتکێشان تەنها پشکێك لەئیدارەی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا دانراوە، لەکاتێکدا ئەم کۆنفرانسە بە پشت بەستن بە حوکمی قورئان:

١- حوکومەت تەنها بەحەقی لاوازەکان و زەحمەت کێشەکان دەناسێت.

٢- بەوشێوەیەیی کەسەریح پیشاندراوە، ئەم کۆنفرانسە هەوڵی دەسەبەرکردنی ووردی سیستەمی ئابووری و کۆمەلاّیەتی ئیسلامی دەدات، واتە کەمترین جیاوازی چیانەیەتی، چ لە ڕووی ماددییەوە، چ لەڕووی مەعنەوییەوە لەکۆمەڵگادا نەبێت.

جیاوازییەکی دیکەی ئەم کۆنفراسە، لەگەڵ ئەو کۆمەڵەیەی بڕیاریان لەسەر(هەشت ماددە) دەدەن ئەوەیە، لە(قەتع نامەی هەشت ماددەیدا) ژمارەیەك کەسی کەمی لەوەو پێش دیاریکراو لە دەوری یەك کۆبوونەتەوە بێ ئەوەی میللەتی کورد لەو ڕووەوە ئاگاداربێت، بەلاّم بنەمای پێکهاتەی ئەم کۆنفرانسە بانگهێشتی ئاشکراو گشتیە، کەهەموو چین و گروپە جۆراو جۆرە مەزهەبی سیاسیەکان تێیدا بەشدارن ئێمە ئەم کۆبوونەوەیەش بەناونیشانی هەوڵێکی سەرەتایی دەیناسین "[1]. لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵە مەدەنی خوازانەی(کاك ئەحمەد) بۆ دەستەبەرکردنی مافی نەتەوەکەیی و ڕزگارکردنی میللەتی کورد لەوجەور و ستەمەی ساڵەهایە بەبێ گوناه دەرهەقی ئەنجام دەدەرێت، لەبەر نـــایەکرێزی گروپ و ڕێکخراو و حیزبە

---

[1]) گفتوگو با علامە موفتی زادە، روز نامە(ایندگان) ١٣٥٨/٣/٢١، بەهزادی خۆشحاڵی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو کوردستان، روزهای بحران ٤.

سیاسیەكانی كورد لەناو خۆیاندا ، كە بەبۆچونی(كاك ئەحمەد)هۆكاری ئەم ناوەحدەتیەی ناوخۆی میللەتی كورد پەیوەندی بە ولاّتانی دەرەوە هەیە، كە تەوجیهی گروپ و حیزبەكان دەكەن بەئاڕاستەی سودی خۆیان، نەك میللەتی كورد لەلایەك، لەلایەكی دیكەوە ناپاكی لەنییەتی كاركردنی هەندێك لە پێشەنگانی گروپ و حیزبە سیاسیەكاندا بۆ گەلی كوردی ستەم دیدە بۆتە هۆكاری بەدەست نەهێنانی خواستەكانی ئەم نەتەوەیە، ئەمە بەلەبەرچاو گرتنی ئەو هۆكارانەی خۆی(كاك ئەحمەد) لە پێشتردا باسی كرد، بۆیە دەبینیت كاتێك پرسیاری ئەوەی لێدەكەن، (ئەگەر دەوڵەت بە خودموختاری ڕازی نەبوو تەكلیفی خەڵكی چییە؟) ئەو زۆر ڕاشكاوانەو لە دوو چاوپێكەوتنی جیاوازدا یەك وەلاّم دەداتەوە، دەڵێت"مرۆڤ موكەلەفە بەوەی ستەم لابەرێت، بەشێوەیەك پێویست دەكات مافی خۆی وەربگرێتەوە و ڕووبەڕووی ببێتەوە. هەتا ئەگەر بەشێوەی جولاّنەوەی چەكدارانەش بێت، بەلاّم ئومێدەوارم پەیوەندی دەوڵەت بە بەڕێوەبردنی سیستەمی یەكسانی ئیسلام ئەوەندە دڵسۆزانە بێت، كەهەرگیز پێویستی بەڕوبەڕو بوونەوە نەبێت"[1].

هەروەها بۆ وەلاّمی هەمان پرسیار لە چاوپێكەوتنێكیدا لەگەڵ ڕۆژنامەی(كیهان) دەڵێت"تەواوی خەڵكی(ئێران) بەیەكڕیز و هاوكارییەوە بەژداریانكرد لەم شەڕە درێژخایەنە(ئینقلاب) بەهیوای دروستبوونو بەدەستهێنانی یەك حوكومەتی ئیسلامی، مــوسوڵمانان لەوانەش(كــورد) بێگومان بوو لـەدەوڵـەتی ئـیسلامیدا ئامانجو داواكانیان دابیندەكرێت، بۆیە بەدوور دەزانرێت ئەم حوكومەتە لەبەرامبەر

[1]) گفتوگو به علامه موفتی زاده ، روزنامه(تهران مصور) ١٣٥٨/٤/٣١، بەهزادی خۆشحالی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو كوردستان، روزهای بحران ٤.

خەڵکی موسوڵمان کەمتەرخەم بێت و ڕێگەی نامەشروع و ناڕەوا بگرێتەبەر! ئەگەر ئەم بۆچوونە دوورە هاتەدی بێگومان هیچ میللەتێك بۆی نییە لەماف و لە(حەق)ی خۆی چاوپۆشی بکات، بۆیە لەئیسلامدا هەر ستەم لێکراوێك مل بۆ ستەمکار پان دەکات و ڕازییە بەستەمەکەی، لەستەم کارەکە نەفرین لێکراوترە"[1].

قسەکردن لەسەر کۆششەکانی(کاك ئەحمەدی موفتی زادە) بۆ نەتەوەکەی یەکێکە لەو باسانەی، نوسەرو توێژەرەوەکان بەتەواوەتی ناتوانن مافی خۆی پێبدەن، ئەگەر بەهەر هەوڵ و جوڵەیەکی ووردو قوڵ مامەڵە نەکەن، بۆ نمونە ئەو هەوڵە مەدەنیانەی(کاك ئەحمەد) داویەتی لەم بابەتەدا، واتە ئەو هەولانەی لە ڕێگەی بنەماکانی کۆمەڵگایەکی مەدەنییەوە کاری بۆ کردووە خۆی بۆخۆی یەکێکە لەو باسانەی دەکرێت توێژینەوەی فراوانی لەسەر ئەنجام بدرێت و توێژەرێت لە ڕێگەی چالاکیە مەدەنییەکانەوە(کاك ئەحمەد) بخوێنێتەوەو قسەی لەسەر بکات.

بۆیە ئێمە لێرەدا کۆتایی بەنوسین دەهێنین دەربارەی موفتی زادەو چالاکیەکانی بۆ بەدەستهێنانی خودموختاری کوردەکان، گومانیشمان لەوەدا نییە زۆر بابەت و وتەو ڕووداوی گرنگ لەکۆنفرانسی(بیستی خرداد)دا ڕویداوەو ئێمە لێی ئاگادارنەبووین و نەمانتوانیوە خوێنەری پێ ئاشنابکەین، بەلاّم دڵنیای دەدەینە خوێنەر، کەکارو خەباتی(کاك ئەحمەد) زۆر لەوە زیاترە لێرەدا خوێندویەتیەوە، ئەمە تەنها بەناونیشانی دەروازەیەك بۆ خەباتێکی نەناسراو پێشکەشدەکەین پشت بەخوا ئەم نوسینە دەبێتە دەلاقەیەك بۆ کرانەوە بەڕووی بیرو بۆچوون و وتارو نوسینەکانی(کاك ئەحمەد)دا.

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

# ژیاننامەی شەهید كاك فاروقی فەرصاد

شەهید فاروق فەرصاد لەساڵی(١٣٤٠)ی شەمسی، لەشاری سەقزی سەر بە پارێزگای سنە چاوی بەدنیاهەڵهێناوە، خوێندی سەرەتایی و ناوەندی لە سەقز تەواوكردووە، پاشان بەهۆی ئەوەی باوكی شوێنی ئیشكردنەكەی گۆڕیوە، لە سەقزەوە چونەتە سنەو خوێندنی دواناوەندی لە سنە تەواوكردووە.

كاتێك(كاك ئەحمەدی موفتی زادە) مەدرەسەی قورئانی كردەوە، فاروقی لاویش بوویە ئەندامی ئەو مەدرەسەیەو لەساڵی (١٣٥٧) بەڵێی كرد بۆ ئەو پەیام و بانگەوازەی كاك ئەحمەد، بەهۆی لێهاتوییی و پەیوەندی زۆرەوە زۆر بەزوویی شارەزای نهێنی و رۆحی بانگەوازەكەیان بوو.

ساڵی(١٣٥٧)كاتێك كە شۆڕش لە ئێران شێوەیەكی تازەی بەخۆوە بینی، فەرصادی بەدڵ بەشداریكرد، و پاشانیش لەپایزی ساڵی(١٣٥٨)، لەگەڵ كاك ئەحمەد سنەیان بەجێهێشت و بەرەو كرماشان بەڕێكەوتن.

لەتەواوی ئەم هەموو نارەحەتیانە، فاروق لە تەنیشت رابەری بانگخواز و خێرخوازو دڵسۆزی خۆی مایەوەو خۆی وەك شاگردێكی لەمبارەو لەكەسایەتی زانستی و هەموو لایەنی كاك ئەحمەد سودمەند بوو، لەماوەیەكی كورتدا خۆی گەیاندە ریزی كەڵەپیاوان و مامۆستایانی قوتابخانەی قورئان، بۆیە بەرپرسیاریەتی هەندێ لە پۆلەكان بە ئەو سپێردرا .





لەساڵی(١٣٦١)كاك ئەحمەدی موفتی زادە و سەدان نەفەر لە قوتابیان گیران بە چەندەها گروپ ڕەوانەی بەندیخانە جیاوازەكانی وولاّت كران، كاك فاروقیش لە (١٣٦١/٥/٢٧) بەرەو بەندیخانەی(سمنان) برا.

ئەم بەشە لە بەندیخانە ماوەی(سێ ساڵ و سێ مانگ)ی خایاند كە بەڕیز بەندی بەندینخانەكانی(سنە، دیزل ئاباد، كرماشان، سنە، سمنان) پاشان سنە، لە گروپی (١٩ نەفەری دانرا). شەهید فاروق لە بەندیخانەدا بەبێ ئیش دا نەنیشت، بەڵكو لە چۆڵی بەندیخانە بۆ بەدەست هێنانی خوێندنی زانستی و عیرفانی سودی وەرگرت لەم ڕێگەو شوێنەدا لە هاوڕێی بەندیخانەكەی كە(كاك حسنی ئەمینی) فێری زانست و زانیاری(مەعارف)ی ئیسلامی بوو.

لەدوای دەربازبوونی لەبەندیخانە، بۆ بەرزكردنەوەو زیاتر پەرەدان و پتەوكردنی ئەو وانە ئیسلامیانەی وەریگرت بوو چووە لای مامۆستای شەهید(ناصری سوبحانی)و كۆچكردوو مامۆستا(بورهانە الدین حەمدی) دەستی كرد بەخوێندن و تەواوكردنی ئەو زانستەی كەهەیبوو.

فاروقی شەهید، لەماوەیەكی نادیارو نەزانراو، بەهۆی هەوڵی زۆرو بیرتیژییەوە، توانی بێتە خاوەنی زانستێكی بەرچاو و بەم هۆیەشەوە لەتەمەنی(٢٨ ساڵی)دا لە لایەن مامۆستا(محەمەد شێخ ئیسلام )كە مامۆستای كۆرسی فقهی شافیعی بوو لە(زانكۆی تاران) و پێوەری زانستی زانایانی ئەهلی سوننە، لەلایەن ئەوەوە دیاری دەكرا، هەروا كاك فاروق بوو بە فەقیە(فی المزاهب) و ئیجازەی پێدرا فتوابدات لە مەزهەبەكانی ئەهلی سوننەدا.





لەساڵی(١٣٦٩)ی شەمسی، لەلایەن(كاك ئەحمەدی موفتی زادە)وە دەستنیشانكرا وەكو یەكێك لەو چوار ئەندامەی فتوا و قەزا، بۆ وەڵام دانەوەی لەبابەتە مەزهەبییەكان، و مەرجەع لەمەزهەبی شافعیدا.

شەهید فاروق فرساد، هاوكات لەگەڵ فێربوون و فێركردنی زانستی دینیدا لە ڕێنومای و گەیاندنی لە نێوان لاواندا، هەوڵێكی بەرچاوی لە خۆی پشاندا، تا ئەو ڕادەیەی كە دەتوانین بڵێین یەكێك بوو لە هۆكارە كاریگەرەكان بۆ پەیوەندی كردنی زۆربەی لاوان بە ئیسلام و قوتابخانەی قورئان.

لەساڵی(١٣٦٨) بۆ جاری دووەم ڕەوانەی بەندیخانە كرایەوە، دوای تێپەڕاندنی چەند مانگێك ڕزگاری بوو لەبەندیخانە، لەدوای ئەم ماوەیەی بەندیخانەیە بەوزەیەكی زیاترەوە هاتەوە ناوساحەی بلاّوكردنەوە و بانگەوازكردن، و ڕۆڵی بەرچاو و دیاری بینی، لەوانە لە بۆنە ئاینی و دەرس و وانە و پۆلەكانی زانستی ئیسلامی، بۆ نمونە، نحو، صرف، بلاغە، اصول فقە، تفسیر و ژیانی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێت)، دڵ وگیانی لەڕێیدا دانا.لە ڕەمەزانی ساڵی(١٣٧١)، بۆ جاری سێیەم ڕەوانەی دادگا كرایەوە، ئەمجارەیان بەیاسای دورخستنەوە دوریان خستەوە لەشارو ماڵەوە و بۆماوەی(٥) ساڵ ڕەوانەی شاری غەریبی تەنهای(اردبیل)كرا. ڕۆح سوكی وخۆشەویستی فاروق لەلای موسڵمانان، بەتایبەتی لاوانی پەیوەست بەدینەوە، وایكرد كە چەندەها جار لە چەندەها شوێنی جیاوازەوە خەڵكی بەرەو(اردبیل) بڕۆن، هەندێكیان بەمەبەستی سودمەندبوون لێی و هەندێكی تریش بە مەبەستی سەردان و بینینی ئەو.

لە تایبەتمەندییەكانی دیاری ئەو بریتیبوو لە گرنگیدان بە پەروەردەی ڕاست و دروستی منداڵان، هەروەك چۆن لە تەنیایی غەریبیدا لە نامەیەكدا بۆ خێزانەكەی

دەنوسێت "لەگەڵ بوونی ئەمانەدا، دیسانەوە، گرنگ خۆمانین، ئەگەر توانیمان خێرو چاکەیەك بەخۆمان بگەیەنین، ئەوا بۆی هەیە بتوانین بیگەیەنین بەکەسانی تریش، بەلاّم ئەگەر خوا نەخواستە خۆمان نەمانتوانی و دەستەوسان ماین، ئەوکاتە ئیتر دەبێت بەپەروەردەی وێنەی و ئاشکرا وەکو ئەدەبی پەیوەندی کردن و تێکەلاّوی کردن، شێوازی دانیشتن و نان خواردن یان ڕۆشتن بۆ میوانی و .... بەناوی پەروەردەوە، دڵخۆش و شادومان بین، لە کاتێکدا خوا دەزانێت ئەوەی کە هیواو ئاواتمە بۆ منداڵەکانمان، نەك ئەم پەروەردە دیارو ئاشکرایە، بەڵکو ڕیشە دانانی ئیمان و تەقواو تایبەتمەندی وەك: چاکە خوازی و خۆشەویستی و دڵسۆزی، ئەمانەت و ڕاستگۆیی و ئازایەتی و سەخاوەتی و دژایەتی ستەم و ناحەق بوون و لە وشەی(موسوڵمان بوون)دایە، لە سۆزی بەردەوامی و ملکەچیم داواکارم کە پشتیوانم بێت، بۆئەوەی خۆم بەم شێوەیە دروستبکەم و ڕابهێنم و پەروەردە بکەم، هەروەها جگەرگۆشە دڵبەندەکانمان، هەروەها ئەوکەسانی تریش کە لەگەڵیاندا هەڵسوکەوت دەکەین".

ماوەی ئەو چەند ساڵەی کەدور خرابوویەوە لە(اردبیل) بوو لەمیوان خانەیەك دانیشتبوو بەناوی(شمشیری) بۆ بەدەستهێنانی خەرجی ژیانی خۆی ماوەیەك بەکرێکارییەوە مەژغوڵ بوو.

خوێن ڕێژ و دڵ کوێرو ئازار دەرەکانی دڵڕەش کەهیچ کاتێك بوونی تێکۆشەرەکان و یەکتاپەرستانیان بە درێژای مێژووی مرۆڤایەتی ڕەوا نەبینیوەو پێیان هەزم نەبووە، وازیان نەهێنا تا لەکۆتایداو لە(مانگی بەهمەنی ساڵی ١٣٧٤ی شەمسی بەرێکەوت لەگەڵ شەوی جومعەی ٢٧ی مانگی پیرۆزی ڕەمەزان) نییەتی گلاّوپیس بۆ لەناو بردنی ئەم نەمامە بەبەرهەم هاتووەی باخی قوتابخانەی قورئان و ئەم





تێكۆشـەرو هەمیشـە زینـدووە، ناپیاوانـە لەوغەریبیـەو تەنیاییـەی ئەردەبیلـدا نییەتەكەیان كردە عەمەلی و جێ بـەجێ كـردن، تـا لاپەڕەیـەكی ڕەشـتر زیادبكـەن لەكارە نەشیاو و پوچەكانیان.

دوای بەریانگ كردنەوە، شەهید فاروق بۆ كڕینی(میسـواك) فلچـەی ددان شـۆردن، لە میوانخانەكە ڕۆشتە دەرەوە، بۆئەو دەرمانخانەیەی نزیكی میوانخانەكـە بـوو، كـە بكوژانی بەفێڵ و تەڵەكە بازی تایبەتی خۆیان دەیڕفێنن و دوری دەخەنەوە لەوێ، و لـەدوای شـەهیدكردنی جەنازەكـەی لـە یـەكێك لـە كۆڵانـە چـۆڵەكانی نزیـك بەمیوانخانەكە بەجێ دەهێڵن.

زۆر ڕوون و ئاشـكرایە كـە ڕاسـتی و دروستی نەبڕاوەیـە، بۆیـە هەرچـەند هـەوڵی زۆریاندا بۆ ئەوەی شەهید كردنی فاروق بە مردنی ئاسایی(جەڵـدەی دڵ) لـە قەڵـەم بدەن، بەڵام بەویستی پەروەردگاری شاراوەبێن، چەند سـاڵێك دواتـر، ئەوكاتـەی كـە باسی كوشتنی یەك لەدوای یەكی پەیدا بوو، بەپێی بەڵگـەی ڕۆشـن كـاتی شـەهید بوونی دەركەوت كە فـاروقی شـەهیدیش یـەكێك بـووە لـەو كەسـانەی دانـراوە كـە لەلایەن ئەو ڕسواو شەڕەنگێزانەی لە كوردستاندا پلانیـان خوێنڕشـتن بـووە شـەهید بكرێت، كە لە لایەن هەندێك لە كەسایەتی و نێراوەكانی مرۆڤ دۆستییەوە ئاشـكرا بوو.

لاشەی پاكی شەهید فاروق فەرساد، لە دوای هێنانـەوەی، لـەڕۆژی(٢٩ بهمـن) لـە نێوان تورەیی و غەم و پەژارەیەكی بێ وێنەدا بە ئامادە بونی دەیان هەزار نەفەر لە خۆشەویستانی، لە مزگەوتی(خالیدی كوری وەلید) شۆردراو لە مەزارگای(ئاساولە) لە شاری(سنە) بەخاك سپێردرا .





كاك فاروقی پەروانە ئاسا عاشقی مامۆستاو ڕابەرەكەی(كاك ئەحمەد) بوو، هەر ئەوە كە بەبۆنەی كۆچی دوای مامۆستاكەیەوە دەڵێت :

"پێدەچێت بۆ زۆرێك جێگەی پرسیار بێت كە حیكمەت چییە لەوەی كە ئەو كەسانەی ژیانی خۆیان دادەنێن بۆ بەرنامەكەی پەروەردگار بەردەوام توشی كۆسپ و تەگەرەو ناڕەحەتی دەبن؟"

ئەگەر سەرنجی ئەم خاڵە بدەین، تێدەگەین حیكمەتی تێدا چییە، ئەم مەسئەلەیە تەنها بەسەر(كاك ئەحمەد)دا نەهاتووە، لەپێش ئەویشەوە بۆ تەواو خۆشەویستانی خوا ڕوویداوە و بەردەوام بووە، لەدوای ئەویش هەم خۆشەویستانی خوا، بەم شێوەیە دەژین و ژیان دەبەنەسەر و بەم گیروگرفتانە تاقی دەكرێنەوە، ئەم خاڵەیە جێگەی تێڕامانە: كەلە دوای ڕۆشتنی پێغەمبەران و گەورە پیاوانی تر، ئەركی شوێن كەوتوانی ئەوان ئەوەیە كە شوێن كەوتەی ڕێگەی ئەوانبن و بە ڕێبازەكەی ئەواندا برۆن، درێژەدان بەڕێگەی ئەو گەورە پیاوانە لە دێر زەمان و لە ئێستاشدا تەنها بەقسەو دروشم نابێت، ئەمە(ئیدعای) گەورەیەو لێپرسینەوەو پێداچونەوەی هەیە.

"أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ " (العنكبوت /٢) .

پێوان و ناڕەحەتی تاقیكردنەوە بەپێوانەو ناڕەحەتی(ئیمان)ەوە پەیوەستە، هەرچەند ترازووی ئیمان پتەوتر بێت، تاقیكردنەوەكان ناڕەحەت تردەبن و چەندە ترازووی ئیمان لاوازو سوكتر بێت، ناڕەحەتی و تاقیكردنەوەكان سوكتر دەبن، لەبەرئەوەی خۆشەویستانی پەروەردگار بانگەشەو دیعایەی ئەوان لەهەموو خەڵكی پتەوتر دیارترە لەئەنجامدا تاقیكردنەوەو ناڕەحەتی ئەوان لەخەڵكی زیاترە.

(ان اشد الناس بلاءً الانبياءُ، ثم الذين يلونهم، ثم الامثل فالامثل)فەرمودە.

خۆشەویست ترینی بەندەکانی پەروەردگار، پێغەمبەران بوون زۆرترین نارەحەتی و بەلآیان بەسەردا هاتووەو خۆڕاگربوون، هەرکەسە شیاو و نارەحەت چێژبێت بەشوێن ئەواندا دێت، نەبوونی بەلآو نارەحەتی بۆ کەسێك، نیشانەی خۆشەویستی ئەو کەسەنییە لای پەروەردگاری، بەڵکو بەپێی دەستوری خوای بەپێچەوانەوەیە.

کاك ئەحمەد و نمونەی وەکو ئەو، لەبەرئەوەی عاشق و شوێن کەوتەی پێغەمبەر بوون(درودی خوای لەسەربێت)، دەبێت خۆڕاگربن لەبەرامبەر ئەم هەمووە نارەحەتیانەدا، بۆئەوەی کۆمەڵگا بەرەو خۆشبەختی ببەن، جا ئەو نارەحەتیانەی کەوا کەم کەس دەتوانێ خۆڕاگربێت لەبەر دەمیاندا(رحم الله امرا عرف قدرة ولم يتعد طورة) فەرمودە.

ئەو شتانەی کە بەجێ ماون لەدوای خۆیان .

١- کۆمەڵە بابەتێك(مەقالات).

٢- زیاتر لە(٥٠)کاسێتی تەوزیح و تەفسیر هی کاك ئەحمەد موفتی زادە(ڕەحمەتی خوای لێبێت).

٣- شەرحی(موستەلحات اربعە)ی ئیمام مەودودی(رحمە الله) لە ٣٢ کاسێتدا.

٤- زیاتر لە(٨٠)شریتی وتاری جۆراو جۆر لەسەر بابەتە جۆراو جۆرە ئیسلامییەکان.

٥- کۆمەڵە هۆنراوە، مەقالات، شریت و نامە.

# زمانی كوردی لای كاك ئەحمەدی موفتی زادە

وەك وترا ئەم باسە لێرەدا دوای كۆمەڵێك باسی دیكە دێتو كاك ئەحمەد دەیەوێت، ئەوە روونبكاتەوە كە نابێت بە هیچ شێوەیەك لە رووی جیاوازی زمانەكانەوە ستەم لە نەتەوەكان بكرێت، ئەو بەكارێكی زۆر بێ عەقلانەی دەزانێن كاتێك كەسێك دێت لەبەرامبەر نەتەوەیەكدا رێگری دادەنێتو ناهێڵێت بەزمانەكەی خۆیان قسە بكەن، هەروەك و چۆن ئەوانەش بە درۆزن دەزانێت زەمەنێك ئامادە نە بوون بە كوردی قسەبكەن، بەلاّم لەكاتی ئینقلابدا هاتوون و خۆیان بە ناسیۆنالیست زانیوە! بۆیە دەبینیت كاك ئەحمەد لەباسی زمانی كوردیدا بەم جۆر دەست پێدەكات:"چەنێك ئەحمەقانەیە بلێیت وەلاّ فارس حەقی نییە بە فارسی قسە بكات! فارس حەقی نییە لە قوتابخانەدا منداڵەكانیان بە فارسی دەرس بخوێنن دەبێت مامۆستا بە كوردی دەرس بلێتەوە.

چەند بیركردنەوەیەكی ئەحمەقانەیە، بلێم مامۆستایەك دەڕواتە لادێیەكی(شیراز) منداڵی قوتابخانە كە هێشتا زمانە(شیرازی)یەكەی خۆی باش فێر نەبووە ئەم مامۆستایە دەبێت بڕوات بە زمانی(كوردی) وانە بە منداڵی شیرازی بلێتەوە هەروەك ئەوەی كە هەیە، مامۆستاكان لە لادێ كوردەوارییەكان بە فارسی وانە دەڵێنەوە، لە كاتێكدا منداڵ گەلی فەقیر هێشتا ووشە سادەكانی كوردی فێر نەبووە مامۆستاكە فرمانی پێدەكرێت كە دەبێت بڕۆیت بە فارسی دەرسی پێ بلێیت-ئەمە ئەوەڵێن دەرس كە نازانێت مامۆستا چی دەڵێت! دەی ئەم بێچارە دەبێت چی لێببێت؟! دەبێت چەندێك نارەحەت بێت هەر لەم سەرەتاوە؟ هەموو

ئەمانە پەیامی ئەوە بە ئێمە دەدەن ئەم بەرنامە واحیدە نێرراوە بۆ ئەوەیە بە وجودی ئەوەی کە بەشەر بە شێوەی نەتەوە دەبێت ژیان بگوزەرێنێ و بەرژەوەندی لەوەدایە، هەر نەتەوەیەك مافی خۆی بەرێزەو هیچ نەتەوەیەك مافی نییە زمانو فەرهەنگ و تایبەتمەندی خۆی بسەپێنێت بەسەر میللەتێکی تردا، هێشتا هەر لازمە ئەمانە ووردە ووردە بەرەو(ئینسیحابی هەم بستەگی) بچن، هەرچی تەمەدون زیاتر دەبێت، هەرچی پێشکەوتنی فکرو گەشەی گشتی مرۆڤ زیاتر دەبێت، ئەو کاتە سنورە دیاری کراوەکە بچوکترە بۆ مرۆڤەکان و بەشی ناکات، پێویستە من لەزانستی(ئەمریکاو ئەوروپاو ئاسیاو ئەفەریقا)...هەرچی لایەنە سود وەربگرم، پێویستە ئەمریکا لە زانست و فەرهەنگ و هەرچی شتی منە سود وەربگرێت، هەروەها کەسەیر دەکەیت زمانی فارسی لە کاتێکدا لەم چەند قەرنا زمانی حاکم بووە سەیری(فەرهەنگستان) بکەن، سەدهاو دەتوانم بڵێم نزیك هەزارو هەزارانیش لە زمانی کوردی براوەو خراوەتە ناو فەرهەنگەکانەوە(قاموس) هەروا بە درێژای مێژوو، سەیری(بورهان لوغە)بکە سەیری هەرکام لەو فەرهەنگە کۆنانەی ئێران دەکەیت هەر لەبەرۆ وشەی کوردیان بردووەو خستویانەتە ناو زمانی فارسیەوە ئەم هاوکاریە باشە! بەلاَم لەلایەکەوە(تەحقیرانیزە)بۆ کورد، کە نالێت مەسەلەن ئەم وشەیە هی زمانی کوردییە، ئا ئەو لایەنە نێگەتیڤەی تێدایە ئەگینا خۆ ئێمە زەرەر ناکەین، باشە زمانێکی گەورەو فراوانمان هەیەو لەهجەی جیاواز و وشەی فراوانی هەیە، هەر نەتەوەیەك دەیەوێت بەسەر چاو وشەی پێ دەدەین با قسە بکات و بیباتە ناو زمانەکەی خۆی، بەلاَم ئینکاری مەوجودییەتی زمانەکەی ئێمەی پێنەکات، بەیانی بە زمانەکەی من خۆی دەوڵەمەند نەکات و بڵێت تۆ زمانت نییە، ئاخر ئێستا لە ئێراندا وا دەڵێن، دەڵێن" لەهجەی کوردی" چەندێك

ئەحمەقانەیە!! ئاخ قسە لە ڕووی حسابی زمان ناسییەوە بکرێت، جا بزانن زمانی فارسی-سەرفی نەزەر لەوەی چەنێك زمانی قەڵەم و عیلمە — مەوجودییەتی چیە بیخاتە ڕوو، زمانی کوردیش لە شاخەی گەورەی هەورامییەوە، کە لەهجەی جیاوازی هەیە(سۆرانی)، کە لەهجەی جیاوازی هەیە(کرمانجی)، کە لەهجەی جیاوازی هەیە، (لوڕی)، کە لەهجەی جیاوازی هەیە، گشتی بهێنێت و بەراوردی بکات بزانێت(فارسی)دەوڵەمەندە یان(کوردی)؟

خۆ من لە ڕووی دەمارگیرییەوە نایڵێم، ووتم ئەمە نێگەتیڤە ئینسان بێت شەڕکات لەگەڵ زمانەکانی دیکەدا. بەخوا لەگەڵ زمانی(ئینگلیزی)شدا بەو بچکۆلەی و بێ ئەرزشییەی هەیەتی شەڕ ناکەم، ئەڵبەتە سەریش سوڕ دەمێنێت بڵێیت زمانی(ئینگلیزی)، ڕاستییەکەی ئەمەیە، بەڵام وجودی دەستەڵاتی سیاسی پەیدا کردووە وا ئەوەندە ماقوڵە، ئەگەر نا بە کەمترینی زمانی کوردیش ناچێت! ئەوندە زمانێکی بچوك و کەم لوغەو زەعیف و کەم ڕیشەیە.

بەڕاستی کەسێك زمانی کوردی بەڵەد بێت دەزانێت دەریایەکە ئەمە زۆر سەیرە! زمانی کوردی لە سەرەتاوە دابەش ناکرێت بەسەر لەهجەکاندا، ئەگەر مرۆڤ لە ڕووی زمان ناسیەوە بیڵێت ناکرێت بڵێیت زمانی کوردی چەند دانە(لەهجە) یەکە، لەسەرەتادا دابەش دەکرێتە چەند نیوە زمانێك، خۆ(سۆرانی)لەهجە نییە(کرمانجی) لەهجە نییە(لوڕی و هەورامی) لەهجە نین، ئەمانە خۆیان کەمینە زمانێکن، ئەوەندەش گەورەن هەر یەکەیان خەریکە بە زمانێکی تەواوی حساب بکرێت، بەڵام لە ڕووی ڕیشەی زمانەوانی و لە ڕووی(صەرف) و ڕستە سازییەوە بە نیوە زمان حساب دەکرێت.

ئەم نیوە زمانانە هەر یەكەیان چەندین لە هجەی تێدایە، ئە ئێستا بۆ نمونە(سۆرانی) سەیر بكە لەهجەی(سنە، قوروە، كامێران، مەریوان، سلێمانی، كەركوك، بۆكان، سابلاخ، سەردەشت، لایجان) ئەمانە گشتی لەهجەی جیاوازی سۆرانییە، دەزانن چەند لەهجەیەو چەنێك زۆرو فراوانە؟! دەتوانیت بلێیت(سنە)یی یەك لەهجەیە، لەهجەیەكە لە(سۆرانی)،(سۆرانی) نیوە زمانە، ناتوانیت بلێت سۆرانی لەهجەیە، هەمووشیان سەر بە زمانی كوردین.

(سابلاغی)یەك لەهجەیە لە(سۆرانی) لە زمانی كوردی، هەر بەو جۆرە نیوە زمانەكانی دیكەش وان و دەبینین.

ئەم زمانە كە ئەم(چوار) ڕیشە گەورەیەی لێ جیا دەبێتەوەو هەر ڕیشەیەكی چەند(لەهجە)ی هەیە،بەمە دەڵێن(لەهجە)، دەی ئەمە گەوجی و حەماقەتە، بێیت بەو شێوەیە(تەحقیری)بوونی خەڵك بكەیت. بۆ تەحقیری دەكەیت؟

ئائەمەیە سڕینەوە، ئەمەیە پوچی مەسخرە لە میللەت، ئەگەر نا، بەڵێ هیچ كێشەیەكی نییە، من وشەی فارسی دەهێنم ئەو وشەی كوردی ببات، ئەو وشەی(ڕوسی) بلێت، ئەو وشەی(ئنگلیزی) بلێت و تێكەڵ بن، زمانەكان گەورە دەبن بەیەكەوە كاتێك هاوكاریان هەبێت پێكەوە، ئەمە لایەنی پۆزەتیڤی بابەتەكەیە.

قورئان ئەمە بە تێمە حاڵی دەكات، لەگەڵ ئەوە پێویستە(هۆز- هۆز) بێت، بۆ ئەمە كۆمەكی و هاوكاریمان ئاسان بێت، پێویستە هەوڵ بدەین بەرەو یەكێتی و یەك ڕیزی، ئەویش لەم زەمانا كە توانای پەیوەندی كردن لە نێوان مرۆڤەكاندا زۆر ترەو زانیاری بچوك و سنوردار بەشی هەموو مرۆڤایەتی ناكات، مرۆڤ پێویستی زیاترە هەیە بە پەیوەست بوون و لەگەڵ یەك بوون، ئەگەر وا بێت جاران لەبەر

کـەمی ڕەوشــی خــەڵکی، بەرژەوەنـدی خــەڵکی پێغەمبــەرانی دەنــارد بــۆ هــۆزە جیاجیاکان لە یەکتر، کاتێـك ئاگـای پەیـدا بـوو بەرژەوەنـدی بەشـەر ئەوەیـە یـەك پێغەمبەر بەیەك بەرنامەی کۆتاییەوە بنێرێت بـۆ تـەواوی بەشـەرییەت، بەڕاسـتی کاتێك مرۆڤ لە سـنوری خـۆی دەچـێتە دەرەوە تێـدەگات چـی ئاسـەوارێك گـەورەی هەیە، ئەم پەیوەست بوونە فیکری و فەرهەنگیە، چۆن دەتوانێت کۆمەکی بکات بە پێشـکەوتنی میللـەتان، چـۆن دەتوانێـت تێگەیشـتن ئاسـان بکاتـەوە لـە نێـوان نەتەوەکاندا.

ماوەیەك لە(عەرەبستانی سعودی) بووم، سەیرم دەکرد لـەو ماوەیـەدا، بـە بۆنـەی ئەوەوە کە موسوڵمانان کەم و زۆرێك لە عــەرەبی شـارەزان، سـەیرم دەکـرد ڕۆژێـك دادەنیشتن لەملامـەوە خـەڵکی(یۆغسـلافیا)یـە ڕۆژێـك دادەنیشـتم سـەیرم دەکـرد خەڵکی(ئینگلستانە)ڕۆژێ سەیرم دەکرد لە موجاهیدینی فەلەستینە لـە(فلیپینـە-ئەمریکایە)، ئەم دینە بوویە هۆکاری ئەوەی ئەم هەموو مەملەکەتە پرش و بلاوانە بەدەوری کورەی زەویدا گشتی بەرەو یەکگرتویی بێت، ئەڵبەتە ئەمە هیچ دینێکە، چونکە دینەکە دەستوری ڕاستی خۆی لەناودا نییەو زۆر لـە ڕێگـە لادراوەو زۆردارو زاڵمــەکان گۆڕاویانــە ئەســەرێکی حەرەکــە پێــدانی گرنگــی نییــە، ئــەم هــەموو کۆبونەوانە.

بەداخـەوە زۆربـەی دەرواتـە(حـەج) و دەگەڕێتـەوە شـتێك حـاڵی نـەبووە-نـا حـاڵی بێخەبەر دەڕۆن و دەگەڕێنەوە، بەلاّم ئەگەر (دین) بەشـێوە واقیعیەکـەی خـۆی کـار بکات و باس بکرێت ئەوکاتە تێدەگەین چی هۆکـار مـەوجودێکـە بـۆ عـەزەمـەت و نەتەوەکان، بۆ ئەوە کـە نەتـەوەکان بتـوانن لـە زانسـت و مەعریفـەی یـەکتری، لـە پێشکەوتنی یەکتری سود وەربگرن لە کاتێکدا، ئەگەر قەرار بێت لە ئێستاشـدا بـۆ

هەر میللەتێك(پێغەمبەرێك بنێرێت، دەبێت ئێستاش وەك چەند هەزار ساڵ لەمەوبەر هۆزەكان بێگانە بن لەیەك، ئەم حازر نەبێت كۆمەكی ئەو بكات، ئەو حازر نەبێت یارمەتی ئەم بدات، لەبەر ئەمە بووە لە دەورانی ڕابردوودا پێشكەوتنی عەجیب لە شوێنێكدا بووە، هەر لەوێدا بووە ئیتر كوژاوەتەوە، بۆ نمونە سەیری(ئەصفەهان) بكە، ئەوە هەندێك لە ئاساری باستانی چەند هەزار ساڵی(دیمەشق)سەیر بكە لە(شام)، بڕۆ سەیری(میسر) بكە...هەروا هەر شوێنێكی دیكە سەیر دەكەیت، ئەمە جگە لەوەی كە زۆرداران بە هەڵە سودیان لێ وەرگرتووە، بەلام پیشانی دەدات كە لە لایەنی زانستیەوە مرۆڤ چی پێشكەوتنێكی بووە، بەلام لەبەرئەوەی( ڕوشتە عمومیەكەی) كەم بووە هەر هۆزێك بەجیا ژیاوەو نەتەوەی جیا بووە لەیەك لەوەو دوا كوژاوەتەوەو فەوتاوە!

بەلام لەگەڵ ئەوەی لە هەندێك شتدا جیاوازین، كە نەتەوەبوون و زمانمانە، ئەگەر لە هەندێك شتدا یەك بین، وەك دینمانە، عەقیدەمانە، فیكرمانە، ئەوە دەبێتە مایەیی ئەوەی هەرچییەكمان هەیە تێكەڵ بێتەوە لەگەڵ یەكترداو هەموومان سود لە یەكتری وەربگرین، بەلام كاتێك ڕوشتی بەشەر گەشتۆتە ئەم شوێنە، ئیتر زەرەرە بۆ مرۆڤایەتی وەك ڕابردوو، وەك سەدەكانی پێشوو بۆ هەر هۆزێك(پێغەمبەرێك) بنێریت، لەبەرئەوە هەر یەك(پێغەمبەری ناردووە بۆ تەواوی مرۆڤایەتی، كە ئیتر ئەم بەشەرە بەم ئاگاییەوە وا هەیەتی بتوانێت كۆمەكی یەكتری بكات و یەكگرتوییەك كە شەئنی ڕیشەی واحیدە، لایەقە لە ڕووی ڕیشەی واحیدەوە پەیدا ببێت بۆ بەشەرییەت تەحەقوق بكات .



# پەیامی مفتی زادەی زانا

زانـای نـاودار (مـوفتی زادە) لـەبارەی پێشـهاتەکانی کۆتـایی بـارودۆخی(هـەرێمی کوردستان) پاش (ئینقلابی ئیسـلامی ئێـران) پـەیامێکی بـۆ میللـەتی ئێران بـەم شێوەیە ڕوونی کردەوە:

## بسم الله الرحمن الرحیم

هاولاتیانی موسولمان! لەکاتێکدا بزوتنەوەی گەورەی شۆڕشی نەتەوەی ئێـران ڕێگایەکی بەئاراسەی لەناوبردنی کۆشـکی سیسـتەمی(٢٥٠٠)سـاڵەی پێکـدادان و نۆکەری ئیمپرالیزم و درێژە پێ نەدان نەتەوە فرۆشانی جاسوس خۆفرۆشانی(سـاواك) بەگشـتی بەشـوێن ڕێگایەکدادەگـەڕان لەوێـدا گیـانی خیانـەت پیشـەیی خۆیـان بەشـێوەی تۆڵـە سـەندنەوە لەمیللـەت وەربگرنـەوە، ناوچـەی کوردسـتان چ لەئازربایجانی خۆرئاوا، چ شارەکانی کوردستان و کرماشان و بەسـەدان کیلۆمـەتر مەرزی کراوە بەڕووی ناوەندی دەسەلاتی ئیمپرالیزم.

بەسـور و ڕەشـەوە ناوچـەیەك بـوون کەخۆفرۆشـان دەیـانتوانی لەوێـدا بگـوزەرێن بەتایبەت ڕژێمی پێشوو، کەبەبیانووی ترس لـە تۆڵـە سـەندنەوەی میللـەتی سـتەم لێکـراو ئـەم ناوچـانەی پڕکردبـوو لـە فەرمانـداران و بـەکرێ گیراوانـی(سـاواکی) کـەدەتوانرێت بوترێـت (سـاواك) یـەك لەسـەر چـواری کـارو خیانـەتی خۆیـان بـۆ کوردستان ناردبوو.

لەکاتی ڕژێمی پێشوو ئەوەی بەهیچ جێگایەك نە دەگەیشت هاوارکردن بوو، بەڵام بەداخەوە دوای قۆناغی یەکەمی پیرۆزی شۆڕش، هەروەها میللەتی ستەم لێکراوی کورد چەندجار لە کۆنگرەکانی هێزی دژ بە مرۆڤی(تەزویر) هاواریکرد، بەڵام دیسان دەنگی نەگەیشتە هیچ لایەك.

هاوڵاتیانم (هاو نیشتمانانم)، میللەتی موسوڵمانی ئێران، ئەوەی ئێوە براو خوشکەکانی کورد لەماوەی شەش مانگی ڕابردوو، پاش پیرۆزی سەرکەوتن ئارامتان لەسەر گرتووە زۆر باشترو کاریگەرتر بووە لەوەی کە لە ڕۆژنامەکاندا باسکراوە، ئەگەر بزانن ئێوە لە هەموو جێگەیەکی ئێران لەجەژن و سرودی لەناو بردنی ڕژێمی پاشایەتی بوون، بەڵام لە کوردستان ئەم شادی و سرودەی خەلکی زیاتر لە چەند ڕۆژێك بەردەوام نەبوو.

دەست بەجێ پاش ماوەی ڕژێم بە لەبەرکردنی ماسکی(قیناع)ی شۆڕشەوە و بەسود وەرگرتن لەسستی پاش شۆڕش دەستیانکرد بەئازاردان و کوشتنی موسوڵمامان لە کوردستان.

ئێوە هەمووتان نارەحەت بوون بەوەی، کەبۆچی لە بەرامبەر هەموو هێرشەکانی تاوانبارانی ئێرانی بۆ کوردستان میللەتی موسوڵمان و شۆڕشی ئیسلامی ئێران ئەوانەی فەرامۆش کردووە؟ لەم کۆتاییەی باڵا دەستیەدا تاوانی بەکرێگیراوان تەنها کاری کوشتنی گەنجان و لاوانی(قوتابخانەی قورئانی مەریوان).و هێرش بۆ کوشتنی موسوڵمانان بووە.

ڕژێمی پاشایی بەهۆی کرێگیراوانی ناوخۆیی و دەرەکی کەلە ماقوڵانی خێلەکانی(پەهلەویی و وەیسی و پالیزیای) فەرمانیان وەردەگرت دەنگی هاواری موسوڵمانانی کوردیان بەرزترکردەوە، بەڕاستی ئەوەی کەمیللەتی موسوڵمانانی

ئێـــران بـــۆ ڕزگـــاركردنی گیـــان و ناموســـی موســـوڵمانانی كوردنیشـــانیدا بەپێشكەشكردنی باشترین شەهیدانێك و داواكاری ملیۆنەها موسوڵمان بۆ شـەهید بوون لە ڕێگەی ڕزگاری مـیللەتی كورد لـەدەست چووەكانی پێشووی هەمووی لـەیاد بردینەوە.

خۆشەویستان و موسوڵمانانی ئێران، ئەوەی كەبراو خوشكە موسوڵمانە كوردەكـانی ئێوەی نیگەراندەكرد سـتەم و كوشـتاری بـێ بەزەییانـەی بـە كـرێگیراوان بـوو نـەك لەدەست مـاڵ و سامان، لەبەرئەوە سوپاس و پێزانینیان هەیە بۆهانـا هاتنـەوەكانی ئێوە بەگشتیو لەو كۆمەكە گشتیەكانتان بۆ خەڵكی(سنە)و برسی و تینـوی(پـاوە) كەئەوانیان تەنانەت لەخواردنەوەی ئاو قەدەغە كرد بوو، لەبەرئـەوە لـە خـوای بـاڵا دەسـت داواكـارم (شۆڕشـی ئیسـلامی) بەگـەورەیی ئێـران بەڕابـەری بـاڵا(ئیمـام خومـەینی) ڕێگەی بە ڕووی ڕزگاری سـتەم لێكـراوان و هـاوارداران بەسـەركەوتووی درێژە پێ بدات.

وسلام و علیكم و رحمەت الله و بركاة

۵۸/۵/۲۵ براتان احمەدی موفتی زادە

ڕۆژنامەی (كیهان )۳۰/ ۱۳۵۸/۵



# فاکسی عەللامە ئەحمەدی موفتی زادە بۆ ئیمام خومەینی لە (سنە)وە بۆ (قوم)

عەلامە(ئەحمەدی موفتی زادە) لە درێژەی فاکسەکەیدا کە بـــۆ(ئیمام خومەینی) لـە (قـوم) نـاردبووی، سـەبارەت بـە هەڵبـژاردنی مەزهـەبی سـەرەکی وڵات لـە ڕەشنووسی (یاسای بنەڕەتی) نوێدا ڕەخنەی هەبوو.

قوم..

**ڕەهبەری ئینقلابی ئیسلامی( ئیمام خومەینی )....**

سەبارەت بە(ئێران)، چـەندەها جـار بـەبێ واسـتە و ڕاسـتەوخۆ، چ لەسـەردەمێ کـە لە(نەجەف) بوویت، چ لەسەردەمێکدا کەگەڕایتەوە بۆ ئێـران گفتوگۆمـان هـەبووە. یەکێ لە پایەکانی هەمیشەی گفتوگۆکانمان ئەوەبووە، کە(شیعە و سوننە) لەدانانی یاسادا و ئیشـەکانی جێبـەجێکردن و لایەنـە سـەرەکیەکان دەبێـت یەکسـان بـن، و جیاوازی و پشکی ئێمە لەبەینی ئەم دوو مەزهەبەدا نەبێت.

شـریتێك لـە گفتوگۆکـانی(١٦ی بەهمـەن)ی ڕابـردوو هەیـە، کـە(ئیمـام) ئـەم بۆچوونەی-کەیەکێك لە داواکاریە ئەساسیەکان بووە- پشتیوانی لێکردووەو تەئیدی کردووە، لەم کۆتاییانەدا ڕەشنوسێك لەیاسای بنـەڕەتی بـڵاو بوویـەوەو لـە(مـادەی سـیانزە)ی ئـەو یاسـایەدا، وەکـو تەفرەقـە نانـەوە دانـراوە، کەتـەنها مەزهـەبی(جەعفـەری) بـەڕەسمی ناسـێنراوە. داواکـاری ئـەم ماددەیـە بێجگـە لـەم

ڕستەیە، لەگەڵ ئەو ڕێكەوتنانەدا و ئەمەی كەدەوڵەتی ئێران ئیسلامیە نەك مەزهەبی ناگونجێت.

ئێستا لەم قۆناغە ناسكی و مێژووسازەی ئێمەدا، نەك تەنها لەبەرامبەر جیهانی ئیسلامی و مرۆڤایەتی و مێژووی ئاینـدە بەرپرسیارێتیمان هەیە،-مـن كێشەكانی(ئیمـام) هەسـت پێدەكـەم و دەشـزانم گروپێـك هـەن كـە دەیانـەوێت ئیمتیازێـك بدەنـە مەزهـەبی جەعفـەری،و ئەمـە بەبەڵگـە دەهێننـەوە، كەئەڵێن"زۆربەی موسوڵمانانی ئێران جەعفەرە"، لەگەڵ ئەوەشدا مەلاكانی ئەهلی سوننە لە ڕێگەی ئیسلامدا دژی زاڵمان تێكۆشاون، بەڵام گروپێك بەناوی زانایانی ئەهلی سوننەت هەر لەو ساڵانەدا پاڵپشتیان لە ڕژێم كردووەو هەندێ بەڵگەی تری، وەكو ئەمانە دەهێننەوە، بەڵام ئیمام پێویستە ئەم برادەرانە ئاگادار بكاتەوە كە:

**یەكەم:** جیهاد، بریتیە لە هەوڵدان و لە خۆبوردەیی، نەك وەرگرتنی ئیمتیاز.

**دووەم:** ئیسلام، ناوێكە خواییە و(سوننەو شیعە) دروستكراوی خۆمانن‌و ئەگەر شانازییەك هەبێت لەناوی خوایە، نەك لە سوننە و شیعە.

**سێیەم:** جێگیر بوونی(شاهەنشای ئەمەوی)و جیاوازی ئەوان بەگرتنی دەسەڵاتی شورا و كۆكردنەوەی هێزی حوكمەت و دەوڵەتی دەسەڵاتدار، یەكەم هۆكاری جیاوازی بوو. ئەم جیاوازی نا نەوەیە چەندەها سەدەیە موسوڵمانانی بەرداوەتە گیانی یەكتری، و برا بەدەستی برا، چ لە ئێران لەسەردەمی سەفەویدا و لەچ سەردەمی ستەمكارانی تر لە ئێران و چەندەها شوێنی تر كوشتاری بەكۆمەڵ ڕوویداوە،-جابۆیە- ئێستا سەرەی ئێمەیە ڕێرەوی لادانی مێژوو ڕاستبكەینەوەو لەو جیاوازییە كە دوژمنایەتی دروستدەكات بەرەو یەك ڕیزی و برایەتی





بگەڕێنەوە، ئەمەش گەورەترین پشگیری برایەتیە، كەلیمەیەكە كە ڕەمزی سەركەوتن بووە و(ئیمام) هەموو كاتێك جەختی لەسەر كردۆتەوە.

**چوارەم:** سوپاكانی شەڕی(ئەهریمەن) شكست خواردوی داگیركەر، چ لەناوەوە، و چ لەدەرەوە، هەمیشە لە هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگەی جیاوازی نانەوەدابوو تا بەسەر شۆڕشی ئێمەدا زاڵبن و دەسەلاتی خۆیان بدۆزنەوە، بۆیە ئەم ئیمتیازی مەزهەبیە لە ڕاستیدا تیشكێكی زۆر خەتەرناكە بەدەست ئەم سوپانەوە دراوە، بۆ موسوڵمانان، چ شیعەو چ سوننی كەمترین ئەهمییەتی زانستی نییە.

**پێنجەم:** ئەگەر خەڵكی ئێران زۆربەیان ئەهلی شیعەن لە ولاتە ئیسلامیەكانی تردا ئەهلی شیعە یا ئەصڵەن نین، و هەڵسانی(شۆڕشی ئیسلامی ئێران) لەسەر پەیوەندی ئیسلامی موسوڵمانانی تردەبێت و بەپێدانی پشكی سەرەكی بوونی(مەزهەبی جەعفەری) لە ئێراندا موسوڵمانان لە ولاتانی تردا بەردەداتە گیانی یەكتری، دووبارە ئاگری دوژمنایەتی و براكوژی بۆ چەندەها سەدەی تر دادەگیرسێنێ.

لێخۆشبوون لەم پشكە سەرمەشقێكە بۆ بەدەستگرتن و پەیوەندی برایەتی ئیسلامی لە هەموو شوێنێكدا، و شانازییەكی مێژووییە، كەبەناوی(شۆڕشی ئیسلامی ئێران)ەوە بنوسرێت و پاداشت لەوەدایە كەدەست دەكەوێت.

هیوادارم ڕابەری شۆڕش بتوانێت ئەم ڕاستیانە كەبەتەئكید زۆربەی برادەرانی شارەزای دڵسۆزی شیعە پشتیان لەمەكردووەو(ئاگایان لەمە نییە)، یا بەكەم سەیریان كردووە، تێبگەنرێن تا(ئەهلی ئەهلییەت كەسایەتی) خۆیان لەبەرامبەر خودا بەباشترین شێوە بگەیەننە كۆتایی، ئەگەر بێجگە لەمە شتێكی تر بكەن بێگومان نە لە ئێران قابلی قبوڵ نەبێ و نە لە عالەمی ئیسلامیش لەبەرامبەریا





بیٚ هەڵوێست دەبێت. هەر شتێك ڕوویدا بەرپرسیارێتی خەتەرناکی ئەو لەئەستۆی کەسانێکدایە کەجیاوازی و کینە قبوڵدەکەن، و ئەم بەرپرسیارێتیە خەتەرەو ئەو کەسەی پێی هەڵەسیٚ ئەبیٚ قارەمانیکی بەهێز و بیٚ باك بێت.

والسلام و علیکم

ئەحمەد موفتی زادە- سنندج

۱۳۵۸/۳/۲۸

ڕۆژنامەی ( **اطلاعات**) ۱۳۵۸/۳/۲۹

# گفتوگۆیەك لەگەڵ عەللامە ( موفتی زادە )

خستنەگەڕی سیستەمی یەكسانی ئیسلامی، پێویستی بە كێشمەكێشو دووبەرەكی و دژایەتی نییە.

چەند دێڕێك لەبارەی( ئەحمەدی موفتی زادەوە):
خوێندنی خۆی لە كتێبخانەو قوتابخانە ئیسلامیەكانی كوردستانی ئێرانو عێراق تا ئەو پەڕی هەوڵ و ماندوبوون تەواوی كردووە.
لەساڵی(١٣٢٨) چۆتە ناو ململانێ سیاسییەكانەوە و لەسەرەتای ئەو ململانێیەدا بەیارمەتی هاوڕێكانی ڕۆژنامەی بە دەستنووسی بلاّوكردەوە.
لەساڵی(١٣٣٠-١٣٣٢) لە(سنە) بەردەوام بووە لەسەر ئەم ململانێیە و لە ساڵی(١٣٣٦) هاتۆتە(تاران) لەبەرنامەی كوردی(ڕادیۆی ئێرن)ی ڕێكخستووە، و لە(زانكۆی تاران)، وەك وانەبێژ لەبەشەكانی(ئیلاهیات، حقوق، فەلسەفە، مەزهەبی ئیسلامی) وانەی وتۆتەوە.
پاشان(ڕۆژنامەی كوردستان)ی بلاّوكردۆتەوە. هەرلەو كاتەدا لەلایەن دەزگای (ساواك)دەگیرێت و لەزیندانی (قزڵ قلقە) زیندانی كراوە، پاش ئازادكردنی ململانێكانی خۆی لە كوردستان بەشێوەی وتار و ڕێنمای خەڵكی تا ئەوكاتە بەردەوام بووە...

- خەڵكی باوەڕیان وایە، لەسەر ڕابەری ململانێكانی كوردستان لە نێوان تۆ و (سەید عیزالدین حسێنی) جیاوازی هەبووە؟

+ موفتی زادە: ئەو شتەی هەرگیز لەلای من جێگەی بایەخ نەبووە، نازناو و تانەو تەشەری جۆراو جۆری خەڵكی بووە. من بەوپەڕی هێزەوە بوونی هەر جۆرە جیاوازیەك ڕەت دەكەمەوەو بەدرۆشی دەخەمەوە. من نازناوی ڕابەری لە خۆم نانێمەوە، ڕازیش نیم پێی، بەڵام بەداخەوە ئەوانی دی خەڵكی تۆمەتبار دەكەن و دەستكیسەی بۆ دروست دەكەن ئەم بابەتانە سەراو ژوور دەكەن...

- دەڵێن ساڵانێكە تۆ لەگەڵ(ئیمام خومەینی) لە پەیوەندیدایت ئەم پەیوەندیانە چۆن چۆنی بووە؟

+ من بە هۆكاری(ئیمام) بۆ عێراق هات پەیوەندیم دروست بوو، لەگەڵ ئیمامدا لە پەیوەندیدا بووم لە ڕێنمونی و ڕێنماییەكانی ئەو ئاگادار بووم.

- هەندێك لە گەنجانی كورد، تۆیان بە ئاژاوەگێڕو و هۆكاری دوو بەرەكی ناوزەد كردووە، و پڕوپاگەندە لە دژت بلاو دەكەنەوە، تۆ لەبارەی ئەمانەوە چ دەڵێیت؟

+ دەربارەی ئەو پڕوپاگەندانەی لەم پێنج تا شەش مانگی كۆتایدا دەربارەی من بلاوكرایەوە پڕوپاگەندانێكی تر هەن كەڕۆشنگەرو دڵخۆشكەرن بۆ من، سەرەڕای ئەوەش هەوڵ و كۆششی ڕابردو و ئێستای من هەمیشە بۆ جولاندنی خەڵكی و -نەهێشتنی-جیاوازی نێوانیان بووە.

- تۆ نامەیەكت بۆ(موهەندیس بازرگان) نوسیووە، كە ڕكەبەرەكانت ئەوەیان داوەتەوە پاڵت گوایا تۆ مانگانە(٢٠)ملیۆن تمەنت داواكردووە، ئەو پارەیە بۆ ئاوەدانكردنەوەی كوردستان بە خەرج بدەیت، باشتر لەوەی بۆ دژایەتی كردنی گروپە جیاوازەكان؟

+ ئەو نامەیە کە بەهەمان شێوە، لە کۆتایی ئەوەی خۆم ئاماژەم پێدا بوو، بۆم زیادکردووە، بەلاّم گروپە جیاوازەکان لە دژی مـن ئـەو ڕێزە ناپەسـەندەیان نواندووە کەلەبلاّوکردنەوەی چاپی زیاتر لەو نامەیەیان بەچاپ گەیاندووە و سەرەڕای ئەوەش بێ ڕێزی ئەوان لێکدانەوەی بێ ویژدانانەی خۆیان بۆ نامەکە زیاد کردنێکی ترە....

بابەتی ئەم نامەیە یەك لەو بابەتانەیە لەکاتی گەشتێکی بەڕێز (ئایەتوڵلاّ تاڵقانی) بۆ(سنە) بوو، کەلە پێش چاوی ڕۆحانییەکان خرایە ڕوو، پاشان(ئایەتوڵلاّ کرمانی) لە لایەن(ئیمام خومەینی)ەوە بۆ ئەم بابەتە نێردرا بوو، واتە هاتنە دەرەوەی دین و بارودۆخی دین لەلایەن(شاهەنشاوە) و ئەو نامەیەم لە دەرەنجامی یادخستنەوەیەك لەگەڵ ئەو نامەیەدا کە پێشتر نوسیبووم یاداشتم کردووە کە نرخی (١٥-٢٠ میلیۆن تمەن) نرخی کۆتایی بۆ ئاوەدان کردنەوەی کێشەو گرفتە دینییەکان لەو ناوچەیەدا تەنها بەس نییە، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت ئاگاداری بارودۆخی مەلاکان و حافیزانی قورئان و بانگ بێژان و خزمەتگوزارانی مزگەوت بین، بەبێ گومان بڕێکی باشتر لەوەی پێویستە کەدیاریتانکردووە، بەلاّم ئەوەی کە بڕێکی ئاوەها بۆ ئاوەدانکردنەوەی ناوچەیەکی دیاریکراو ئەمە هەڵەیەکە بەو واتایەی کە ئەم دوو داواکارییە، واتە چاککردنی گوزەرانی ڕۆحانییەکان و ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکە لەگەڵ یەکتردا دژی یەکتر ناوەستن و هەر بەو پێیەش هەر کاتێك لەگەڵ(ئیمام خومەینی) و بەرپرسانی تر وتوێژم کردبێت هەمیشە لەسەر بابەتی سەرەکی جەختم کردۆتەوەو لێدوانم داوە، جگە لەوەش بە بۆچوونی من مرۆڤ لە بەها مەعنەویەکانەوە دەتوانێت مرۆڤ بێت، نەك تەنها چاککردنی



بارو دۆخی مادی، دەتوانرێت بۆ دڵنیا بوون و دەرك کردن بەم ڕاستیە کۆمەڵگەی(سور پێستانی ئەمریکی) و کۆمەڵگەی خۆشگوزەرانانی(سپی پێستی ئەمریکی) بەراورد بکەن.

- تۆ بەوپێیەی لەگەڵ گەنجان و ڕێکخراوە پێشکەوتووەکان دانیشتن ئەنجام نادەیت، بەڵکو داواکاریشت لە دژی ئەوان هەیە، وا پێدەچێت لەبارەی(چەپگەران)ەوەتوندوتیژی دەکەیت؟

+ چەپگەران، یەك بەش لەهاولاتیان و یەك ڕاستی پێش چاوە،و نکوڵی لێناکرێت، دەربارەی لایەنگیری کردن ئەم بابەتە شایەنی لێکۆڵینەوەیە، کە هەر زەمانێك بەپێی گونجاوی هۆکاری دژە نەتەوەی شێوازێك لە ململانێ سەر هەڵدەدات، و ئەم تۆمەتی دژایەتیە لەکاتی دەسەڵاتی ڕژێمیشدا بۆ منیان هەر دەکرد، لەبەرئەوەی هەر گیز ئامادە نەبووم لەگەڵ ئاینی ساختەو دینی مرۆڤاندا کۆببمەوە و بچمە پاڵیان.

ئەمڕۆش کە حوکمەتێکی دژە دین نییە ململانێ و دژایەتی شتێکی ئاساییە، هەروەك چۆن لە پێشترو چەند جارێك وتوومە ئامادەی ئەوەم تێدایە لەهەر کەش و هەوایەکی پڕ خۆش و لێکگەیشتن لەگەڵ هەر کەسێکدا دەربارەی هەر شتێك گفتوگۆ بکەم.

بەتایبەت دەزانم پشت هەڵکردنی هەندێك لەگەنجانی ئێمە لە ئیسلام، لە ئەنجامی بەهەڵە گەیاندنی دینەوەیە لەلایەن پێشوو ترەوەو ناشیرینکردنی لەلایەن گەنجان، لەبەرئەوەی من گەنجان کەمتر بەکەم و کورت دەزانم...





- شتێکی ئاشکرایە ئێوە لە کاتێکدا لەگەڵ کەسانی بەرپرسدا لەپەیوەندیدان و یارمەتیان دەدەن لەبەرامبەر ئەوەشدا چەکدارانی ئەوان لەخزمەت ئێوادەبن و دەتانپارێزن.

+ ئەم بلاوکراوەیە بێ بناغەیە، هەر لە یەکەمین دیدارمەوە، لەگەڵ (ئیمام حوسێنی) هەوڵمداوە کە لەگەڵ (جەلال تاڵەبانی) (سەرۆکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان) مۆڵەتی سەردانی بدرێت بۆ ئێران پاش ئەوەی کە(ئیمام) بەم بابەتە پەیوەندیدار بوو، بابەتەکەم لە چاوپێکەوتنێکدا بۆ ڕۆژنامەی(کەیهان) ڕوونکردەوە. لە هاوڕێکانم داواکرد کەرێگەی یەك سەردان لە نێوان منالانی(مەلا مصتەفای بەرزانی (ڕابەری سەرۆکایەتی کاتی) و (جەلال تاڵەبانی) برەخسێنن تا جیاوازیەکانی خۆیان چارەسەر بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کەسەی کەخەسارەتمەندی ئەم بارودۆخە دەبێت گەلی کوردەو ئەو کەسەیش کە سود دەبینێت دوژمنانی کوردە.

- دەربارەی ئەو پروپاگەندەیەی کە دەربارەی(سەید عزالدین) بلاوکراوەتەوە چی دەڵێیت ؟

+ بەگشتی من دەربارەی بلاو کردنەوەی ئەم پروپاگەندەیە ئاگادار نیم و تا گوێ بیستی بووم لە(کرماشان و سنە) بلاو بووبوویەوە، بەهۆی هاوڕێکانی خۆیەوە، ئەوانەم کۆکردەوە و من بەکرێگیراوانی بلاوکردنەوەی پروپاگەندە تۆمەتبار دەکەم.

- ڕوون و ئاشکرایە، کە جموجوڵێك لە سنورەکانی ئێران لە لایەن ڕژێمی پێشوەوە ئەنجام دەدرێت ئایا ڕاستی هەیە؟

+ بەڵێ ڕاستی هەیەو زۆریش ترسناکە .

- ڕەوشی ئینقلابی ئێران و ئایندەی کوردستان چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟

+ ئەگەر بێت و دەوڵەت لەپیادەكردنی ڕێچكەی سیاسی و كۆمەڵایەتی و ئاینی و ئابوری ئیسلامی دابڕێت بەدڵنیاییەوە هیچ هیوایەك بۆ بەرهەم هێنانی نایەتەكایەوە و سیستەمی كۆماری ئێران جێگر نابێت، و بەرەوپێش چونی جدی(كارا) لەبواری جێبەجێ كردنی خستنەگەڕی(٣مادە)ی ڕابەرانی دینی ئەهلی سونەت كەسودی تێدایە بۆمان ئەوانیش:

**یەكەم: لابردنی زۆر و ستەمی مەزهەبی دروستكراو، كە لە زەمانی صەفەوییەوە بەردەوامەو هەیە.**

**دووەم : دابینكردنی سیستەمی خۆبەڕێوەبردن( خودموختاری )، كە بە یاساكانی ئیسلام شارەزابێت.**

**سێ یەم: سیاسەتی هەڵگرتنی ستەمی ماددی و مەعنەوی و چینایەتی پێشبینی كراوە.**

- ئەگەر دەوڵەت بەسیستەمی خۆبەڕێوەبردن(خودموختاری) ڕازی نەبێت چارەنوسی خەڵكی چ دەبێت؟

+ مرۆڤ پێوستە لەسەری بۆ لابردنی هەرستەم و وەرگرتنی حەقێك بەهەر شێوەیەك پێویست بكات بجەنگێت، تەنانەت ئەگەر بەشێوەی چەكدارانەیش بێت. بەڵام هیوادارم پەیوەندی دەوڵەت بۆ جێبەجێكردنی سیستەمی یەكسانی ئیسلامی زۆر ڕێك و ڕاست بێت و هیچ پێویستی بەجەنگ نەبێت.

- ئایا بەسیستەمی ئابووری سۆسیالیزم باوەڕت هەیە؟

+ ئەگەر بمانەوێت وەك زەحمەتكێشان ستەم ڕەوابێت بەڵێ، بەڵام ئابوری ئیسلام لەبەرامبەر هەڵگرتن و لابردن سودو قازانجی زۆر زۆر پێشكەوتووە، هەروەها سەركەوتوو ترە لەسیستەمی ئابووری سۆسیالیستی، لەبەرئەوە ئیسلام لە سۆسیالیزم بێ منەتە(كاری پێ ناكات).

- لەحاڵەتی بەڕێوەبردندا پایتەختی ویلایەتی کوردستان کوێ دەبێت؟

+ مـن حەزدەکـەم شـاری قارەمـانی(کرماشـان) بەسیفەتی پایتـەختو ناوەنـدی ویلایەتی خۆبەڕێوەبردن(خودمەختار)ی کوردستان هەڵبژێرێت. لەبەرهـەمان بابـەت لـەخاوەن دەسـەڵاتدرانی کـورد داوامـانکردووە، کـەبۆ ئامادەکـاری پێشـنیاری خۆبــەڕێوەبردن لــە(کرماشــان)دا کۆبوونــەوەکان ئەنجامبــدەن. کــوردانی ناوچەی(کرماشـان) لـە ڕوی جۆش و خرۆشـی نەتەوەییـەوە زۆر بـەهێزو هاوکـاری یەکن، بەڵام ئەوان پەیڕەوی(مەزهەبی شیعە) دەکەن هەر لەبەرئەوەش بەشـداری نـە کردنییان لە ڕیفراندۆمی ناوچەکان لە کوردستان. مـن هەوڵـدەدەم و هەوڵیشـم داوە ئەم ئازاردانە دابڕێت و ڕۆحی پێکەوە بەستنی میللی و مەزهـەب لـە پـێش هـەر تازەکردنەوەو بەهێزکردنەوەیەکەوە بێت.

- بۆچوونت چیە، دەربارەی سانسۆری سەر(ڕادیۆو تەلەفزیۆن و چـاپکردن) ئـەویش بەبیانوی چاککردن و ڕێنمای کردن؟

+ لەبارەی سانسۆرەوە و گونجاندنی ئەو لەگەڵ سیسـتەم و ڕێچـکەی قورئـان هـیچ کاتێك ناتوانم سانسۆر قبوڵبکـەم، بـەلآم سیسـتەمێك بەتایبـەتی لـە هەلومـەرجی ئینقلابدا پێویسـتە، بۆئـەوەی سـاڵی(٣٢)و ئینقلابـی (مشـروتیەت)و (سیسـتەمی دارستان) دووبارە تازە نەکەینەوە.

- چ پەیامێکت بۆ میللەتی ئێران هەیە؟

+ گرنگترین پەیامی مـن بـۆ میللـەتی ئێـران، ئەوەیـە بـە وورياييـەكی تـەواوەوە لەهەلومەرجی ناوچەییو هەوڵدان بۆ بەدەست هێنانی جوجوڵی نێودەوڵـەتی ڕێگـە نەدەن، ئەگەر وانەکەین ئەمانە جارێکی تـر وادەکـەن ئینقلابـی ئێمـە بـێ بەرهـەم بێتو بە تەنگژەیی و خنکاوی بمێنێتەوە ڕابردووەکان تازە ببنەوە.



# پەیامی عەللامەئەحمەد موفتی زادە

# ڕابەری مەزهەبی کوردستان:

## بەپیلانی سەرشۆڕەکانی ڕژێمی پێشوو هەڵنەخەڵەتێن

(علامە ئەحمەد موفتی زادە ) لە ڕابەرانی یەکەمی کوردستان هۆشداری دایە خەڵك کە بەپیلانە جۆراو جۆرەکانی دوژمن هەڵنەخەڵەتێن .لەبەشێکی پەیامەکەدا هاتووە: پێگەی شۆڕشی ئێمە بەبەراورد بە باروودۆخی بەرەو پێش چوونی پلە پلەی(ئینقلاب)شۆڕشێکی زوو پێگەیشت (زوو هات)، چونکە ئەگەر هێزەکانی نیزامی ڕێکخستنەکان زۆر زوو یەکگرتنی خۆیان لەگەڵ میللەتدا ڕانەگەیاندایە ئەوا شەڕێکی ناوخۆیی دوورو درێژ دەهاتە کایەوە . لەبەرامبەردا بەکرێگیراوانی ڕژێمی پێشوو لێرەو لەوێن کە چۆن ژیانی خۆیان بەرەو نابووتی ئەبینن و بە ئامرازو هۆکاری جۆراوجۆر دەیانەوێت کێشە بۆ خەڵك دروست بکەن و بیرکردنەوەکان لە ڕێرەوی ڕاستی شۆڕش لابدەن، یەکێك لەوکەسە بەکرێ گیراوانە کەسێکە بەناوی(شێخ هادی هاشمی)کە چەندین بەڵگەی بەدەست هاتوو لە ساواکی(سنە)وە پیشانی دەدات کە ناوبراو پارەی بێشوماری بۆ لەشکر کێشی بۆ شارەکانو لادێکانی کوردستان بۆ لەناوبردن و سەرکوتکردنی شۆڕش لە ساواکەوە وەرگرتووە ، ئەم کەسە سێ جار بۆسەر(کامیاران) و جارێك لەگەڵ کەسانی بەکرێگیراویدا بۆسەر (پاوە) هێرشی کردووە. بەم دواییانەشدا قەتڵ و عامەکانی(قروە)ی ئەنجامدا بەبیانووی جیاوازی مەزهەبی لەکاتێکدا کە ئەم بیانووە جگە قسەی هەڵیت و پەڵیت هیچی تر نییە و قەلای جەنگی ئەو لەلایەن جەنگاوەرانی(قروە)ڕزگار کراو ئێستاکە لە نەخۆشخانە کەوتوون لە(قروە).

ڕۆژنامەی (ئیتلاعات ١٣٥٧/١٢/٢٨).

*****

**ڕاگەیاندراوی ئاغای "موفتی زادە" لەبارەی وازهێنانی لە دوژمنكارییەكانی ( سنە ) ڕێكەوتننامە سێ مادەییەكەی كە دەربارەی بەرگری كردنە لە كوردستان:**

دوابەدوای بڵاوبوونەوەی ڕاگەیەندراوەكەی ئاغای(موفتی زادە) لەبارەی وازهێنان لە دوژمن كاریەكەی سنە، ئەمڕۆ جارێكی تر بەیاننامەیەك لە لایەن ڕابەرانی مەزهەبی میللی لەدەنگی شۆڕشی ئیسلامی ئێران پەخشكران، دەقی بەیاننامەكان بەمشێوەیە بوو :

## بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

**بەهۆی جیاوازی بیروڕا لە نێوا(ئەحمەد موفتی زادە) و جەنابی ئاغای (سەید عزالدین حسینی)لەبارەی پارچە پارچەكردنی داواكرییەكانی میللەتی موسوڵمان لەگەڵ ڕێكەوتن لەگەڵ ئەسڵی داواكاریەكانی كەسانێك ، پێشبینی بوونی ناكۆكی لە دژی میللەتە.لەپاش نیوەڕۆ ڕۆژی یەكشەممە ٢٧ی ئەسفەندی ١٣٥٧ بە ئامادەی چەند كەسێك لە ڕابەرانی دینی لە ماڵی جەنابی ئاغای (مەلا عبداللە محەمەدی )ئیمام جومعەی(سەقز)بیروڕاكانی خۆمان دەربڕی و لەسەر مەسەلە ئەساسیەكانی میللەت گەیشتینە ڕێكەوتن كە ئەم ڕێكەوتنە بەشێوەی بەیاننامەیەكی سێ مادەیی ئیمزا كراوەو بڵاودەكرێتەوە، بەم پێیە هەردوولا ڕایدەگەیەنین، هیچ كەسێك مافی ئەوەی نییە، هیچ جۆرە ڕاگەیەندراوێك بەناوی هەریەكێك لە ئێمە دژی یەكتر بڵاوبكاتەوە، لەبارەی ئەو ڕووداوانەی كە ئێستا لە(سنە) ڕوودەدات. ڕێكەوتنی خۆمان لەبارەی وازهێنان لە دوژمنایەتی كردن و خۆلادان لە هێرش كردنە سەر پایگاكان ڕادەگەیەنین، لەبەر ئەمە لەم بارودۆخەدا هەر هەوڵێك بۆ چارەسەری كێشەكان دژی كردارە ستەم كارەكانی حوكمەت ڕەتدەكەینەوەو بە دژی بەرژەوەندیەكانی میللەت و جمهوری ئیسلامی ئێرانی**

دادەنێین . لەبەر ئەمە بەتەواوی تەئکیدی دەکەینەوە کە هەموو برادەران لە دەوری پادگانەکانی سنە دوور بکەونەوەو هیچ کارێك نەکەن کە ئەم مەسەلەیەی ئێستامان ئالۆزتر بکات .

ئیمزا کەرەکان

سەید عزالدین حسینی ئیمام جومعەی مەهابادز

ئەحمەد موفتی زادە.

عبداللە محەمەدی ئیمام جومعەی سەقز .

عبداللە رحمان تاهیری.

محەمەد ڕەبیعی.

سەقز ٢٧ ئەسفەند ١٣٥٧(ئیتلاّعات ١٣٥٧/١٢/٢٨)

*****

## موفتی زادە: خەڵکی سنە بە دژی شۆڕش مەزانن

مـوفتی زادە، یەکێکـە لـە ڕابـەرە مەزهەبیـەکان، لـە سـنە دەژی دەڵێـت "هۆکـاری پێکدادانی چەکداریانە لەنێوان خەڵکدا ئەوە بوو، کە سوپا لەکوردستان لـە پێدانی ئـەو ئەنـدازە لەپێداویسـتی و چـەك بەخـەڵك بـۆ پاراسـتنی شـار ڕێگـری کـردووە"، ئـەو ووتی"کەسانی ئەو کۆمیتەیەی کەلـە ژێـر چاودێری ئەودایـە پێشـتر بـۆ وەرگرتنـی ئـەو پێداویسـتیانە سـەردانی بەرپرسـانیان کردبـوو، بـەڵام پێیـان نـە درابـوو"، مـوفتی زادە وتیشی"هەر تانەدانێك لە خەڵکی سنە بەوەی کە دژی شۆڕشن(ئیـنقلاب) ڕەتدەکەینـەوە و ئەم کارە بەتەواوی بۆ جوڵاندنی هەستی خەڵك دەزانین".

ڕۆژنامەی (کیهان ١٣٥٧/١٢/٢٩)

*****

## پەیامی عەلامە موفتی زادە بۆ (ئایەتوڵڵا تاڵەقانی)

### بەهۆی نەزانی هەندێکەوە سەنگەری جیهاد چۆڵ مەکەن.

سنە- علامـە مـوفتی زادە ڕابـەری مـەزهـەبی سـوننە لەپەیامێکـدا بـۆ (ئایـەتوڵڵا تاڵەقانی)، لەگەڵ دەربڕینـی خـەم خـۆری خـۆی و خـەڵکی کوردسـتان لـە ڕووداوی دەسگیر کردنی بووك و منداڵەکانی ئەوان، داوای لە ئایەتوڵڵای تێکۆشـەری گـەورە کرد کە سەنگەری جیهاد بەهۆی نەفامی هەندێکەوە خاڵی نەکەن .

## بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

**تێکۆشەری ماندونەناس (عەللامە ئایەتوڵڵا ئەلعوزما تاڵەقانی).**

ڕووداوی خەمناك و بێئەدەبی نواندن لە لایەن خەڵکانی نییەت پیس، یان نەفام بەرامبەر بەمنداڵانی ئەو پایە بەرزە، خەڵکی کوردستان و هەموو موسوڵمانانی ئێرانی نیگەران کردووەو کاری تێکردوون . میللەتی ئێران هەرگیز دان بەخۆداگرتن و زیندانی و ئەشکەنجەکانی ڕۆح و جیسمی ئەو پایە بەرزە لە ڕێگەی ئیسلامدا کەڕێگەی ئازادی و خۆشبەختیە فەرامۆشی ناکات و بەتایبەتی خەڵکی سەرزەمینی کوردستان یادەوەری سەفەرە پڕ بەرەکەتەکەی ئەو بەڕێزە بۆ سنە هەمیشە بە زیندووی دەی هێڵێتەوە. لە بیریایەتی کە بەو پەڕی نییەت پاکی و ڕاشکاوی بە نوێنەرایەتی لە لایەن (ئیمام خومەینی)مافی مەشروعی خودموختاریەکەی بۆ خەڵکی ئەم ناوچەیە لە کۆبوونەوەیەکی گەورەدا لە(مەیدانی ئازادی) ئەرکی دینی و خودای خۆتان نەك بۆ پایە ئەداکرد. کوردستان و سەرانسەری ئێران ئومێدەوارم کە ئەو موجاهیدە گەورە هەرگیز سەنگەری جیهاد بە هۆی نەفامی هەندێکەوە خاڵی نەکەن، لەبەرئەوەی دوژمنی ئەساسی ئێران کەداگیرکەرانی نێودەوڵەتی هێشتا لە ڕۆژنامە سیاسیەکاندا کەمینیان بۆ داناوین خستنە داوو هەڵخەڵەتاندنی خەڵکانیش لە فراوان بوندایە! بەڕاستی حەیفە خاڵی کردنی سەنگەر لەلایەن پیاوێکەوە کە سەبرو تاقەتی(عمار و بیلال) و تەقواو کاردانو ئازایەتی(عمر و عەلی)لێ چاوەڕواندەکرێت! تاڵەقانی خۆشەویست! بگەڕێرەوە بۆ سەنگەر و ڕێگەی جیهاد، تا کۆتایی لەگەڵ میللەتدابە، کە میللەت لەگەڵ تۆدایە.

سنە ـ ئەحمەدی موفتی زادە

ڕۆژنامەی (ئیتلاعات ۱۳۵۸/۱/۲۰).

# موفتی زادە: شورای شاری سنە یاسایی نییە.

ئەحمەدی موفتی زادە، ڕابەری مەزهەبی و سیاسی و خەڵكی سنە لە چاوپێكەوتنێكدا لەگەڵ پەیامنێری(ئیتلاعات )لە سنە، بیروڕاكانی خۆی دەربارەی بارودۆخی هەستیاری كوردستانو هەڵبژاردنی شورای یانزە نەفەر سنە ڕاگەیاندوە وتیشی كە هەڵبژاردەكانی سنە، بەشێوەیەكی ڕێك و پێك ئەنجام نەدراوە، چونكە هەزران نەفەر بە ڕێپێوان، مانگرتن و گەمارۆدانو داخستنی بازاڕ، ناڕەزای خۆیان لەبارەی ئەو ساختەكاری توندو تیژیانەی لە هەڵبژاردنەكاندا دەربڕی.

ئاغای موفتی زادە لەوەڵامی پەیامنێری ئێمەدا كە پرسی: ئایا ساختەكاریەكان لە هەڵبژاردندا بەهەمان ئەو ڕێژە زۆرەیە كە ئەنجومەنە ئیسلامیەكان دەیڵێن؟ ووتی"بەڵێ، هەتا زۆرتریش لەوە، چونكە ئەوان زانیاریەكانیان سنورداره و تەنها ئەو شتانەی كە بینیویانە ڕایدەگەیەنن، ئێستا ئێمە چەندەها سەرپێچی گەورەمان بەبەڵگەوە لایە، كەچەندەها جۆری ساختەكاری لەم هەڵبژاردنانەدا دەردەخات كە لەلایەن چەپڕەوەكانەوە كراوە، لەكۆمیتە(پێنج) نەفەریەكەی سنەی ئێستا هەیە.

ئەو لەبارەی هەوڵی گروپە چەپڕەوەكان و ناڕەزای گروپە ئیسلامییەكان لەبارەی ساختەكارییەكانی ئەوان، ووتی"گروپە چەپڕەوەكان هەوڵیان داوە ئەنجامی دەنگدان لە بەرژەوەندی یانزە نەفەری گروپی(پیشرو) كۆتایی پێ بێنن، گروپە ئیسلامیەكانش كاتێك كە ئەم ساختەكاریانەیان بینی، دەنگدانەكەیان حەرامكرد و نزیكەی(١٢) هەزار نەفەر لەوانەی كە مافی دەنگدانیان هەبوو، بەژداریان نەكرد.

هەروەها ووتی"جگە لەو ڕووداوە ناشایستانەی بەهۆی گروپەكانەوە ڕوویدا لەكاتی

دەنگداندا، كە من خۆم چەندین كچم بینیوە لەكاتی دەنگداندا لە لایەن چەپرەوەكانەوە تووشی ئیهانەو هەتا لێدان و ئازاردان بوونەتەوە، هەروەها لەمزگەوتی(جامع)، لەنێوان پەنابەراندا، زۆرێك لە ژنان و پیاوانی بەسالاچوانمان بینی كە بەگریانەوە چیرۆكی دڕاندنی ناسنامەكانیان لە لایەن چەپرەوەكانەوە گێرایەوە".

ئاغای موفتی زادە لەبارەی بڕیاری كۆتای (پەنابەران)ووتی"بەهەمان شێوە لە بەیاننامەكەی خۆیاندا ڕایان گەیاندووە، ئەوان لەگەڵ ئەم هەڵبژاردنانەدا كەساختە كاری بوو، ڕازی نین و دەیانەوێت هەڵبژاردنەكان دووبارە بكرێتەوە، چ بۆ ئەوانەی كەدەنگیان داوە، چ ئەوانەشی كەدەنگیان نەداوە، هەموو لایەك كۆكن لەسەر هەڵوەشانەوەی هەڵبژاردنەكان و داواكارن هەڵبژاردنەكان دووبارە بكرێتەوە بەشێوەیەكی ڕێك و پێك و دیمكراسی. ئەنجامەكان ڕوون نین.

پەیامنێری ئێمە پرسیاری كرد: بەڕای ئێوە هەڵبژاردنەكان ئازادانە بووە یان نا؟ ڕابەری مەزهەبی سوننە وەلامی دایەوە

"زاهیری ئازادانە بووە، بەلام لە پشتەوە هەرەشەو تانەدان و ساختەكاری بێشومار كراوە، كەئەمە پێچەوانەی ئازادییە". لەبارەی بەرواری ڕەسمی ڕاگەیاندنی ئەنجامی كۆتایی هەڵبژاردنەكانیشەوە ئەوەی ووت، كە ئەنجام هێشتا ئاشكرانییەو ئەم هیچ هەواڵێكی لەلا نییە.

ئاغای عەللامە موفتی زادە، دەربارەی شورای(پانزە) نەفەری كە بەم شێوەیە هەڵدەبژێرن ووتی"ئاشكرایە ئەگەر نوێنەرانی ڕاستەقینەی خەڵك، وەزیفەی شورا بگرنە ئەستۆ، خەڵكیش هاوكاریان دەكەن و كارەكانی شوراش ئەنجامی دەبێت، بەلام لەبەرئەوەی كە هەڵبژاردنەكان بەشێوەی ڕێك ئەنجام نەدراو ئەوەبوو كە(دوانزە) هەزار نەفەر بەهۆی نارازی بوونیان لە چۆنییەتی بەڕێوە چوونی هەڵبژاردنەكان بەشداریان نەكرد، بەم پێیە ئەم شورایە یاسایی نابێ.

# ئایندەی كوردستان

ئەو دواتر بیروڕای خۆی سەبارەت بە بارودۆخی هەستیاری كوردستانو ئایندەی ئەم ناوچەیە ڕاگەیاند و وتیشی، كە زۆربەی كات لە كوردستانو لە شوێنە جیاوازەكانی ئێرانو تەواوی دونیا بینراوە بەهۆی نارەوایيو دروستكردنی كێشەو گرفتی جیاوازەوە شۆڕشەكان هیچ بەرهەمێكیان نەبووەو بێ ئەنجام ماونەتەوە .

لەئێرانیش ئەگەر میللەت ئەوپەری هۆشیاری خۆیان بەكار نەهێنابێت، ترسی ئەوە هەیە شۆڕشی ئەمجارەش دووچاری چارەنوسەكەی ۲۸مورداد(پوشپەڕ ۱۳۳۲) بێتەوە. بەتایبەتی لە كوردستان ئەگەری ئەوە هەیە كارشكێنيو دوو دەستەی و هەموو بوون و نەبوون و هیواكانی چەندین سەدەی ئەم میللەتە زوڵم لێكراوە كە ئێستا دەتوانرێت بە ئاسانی بەدەست بێت، بە شكست كۆتایی پێ بهێنێ. ئاغای موفتی زادە لە كۆتایدا وتبوی" بێگومان ئەو هەلومەرجی سیاسیەی كە ئێستا هەیە لە مێژووی میللەتی كورد بێ هاوتا بووە،و ئەگەر دووبەرەكیەكان ئەم كەش و هەوا پاك نییەتە تاریك نەكەن، ئایندەی مافەكانی میللەتی كورد ڕۆشنە".

ڕۆژنامەی( ئیتلاعات ۱۳۵۸/۱/۲۵).

*****

# پەیامی عەلامە موفتی زادە

علامە ئەحمەدی موفتی زادە, ڕابەری مەزهەبی خەڵکی سوننە، دوێنێ لەکۆبوونەوەی ڕەخنەگرانی هەڵبژاردنەکانی سنە لە مەیدانی ئازادی بەسترابوو، پەیامێکی نارد. دەقی پەیامەکە بەم شێوەیە بوو:

**هاولاتیانی بەڕێز!** وتراوە کە برادەرانی موسوڵمان داوای پێکهێنانی سەر لە نوێی هەستانەوەی شۆڕش دەکەن و لەبارەی شورا(١١) نەفەرێکەوە ڕەخنەیان هەیەو نارازین، برادەرانی ئازیز! دەبێت ئاگادارین کە هەر ڕێکخستنێکی کۆمەڵایەتی وابەستە بەشوراوە و پەسەندترین جۆری بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا دەهێنێتەوە کایەوە، سەرەنجام ئەوەی دەبێت بیری لێبکرێتەوەو گرنگی پێ بدرێت هەوڵدانە بۆ بەرقەرار کردنی هاوڕێك بوونو ئارامی لەسەر بنەمای یەکسانی کۆمەڵایەتی و چاودێری کردنی بنەماکانی دیموکراسی لە کۆمەڵگادا. منیش هەروەك ئێوە هەر جۆرە کارێکی ساختە لە هەڵبژاردنەکاندا ئیدانە دەکەم و نارازیم. بڕوام وایە هاوڵاتیانی بەڕێز دەبێت هەستی بەرپرسیارێتیان هەبێت لەمەڕ دووبارە کردنەوەی ڕێك و پێکی هەڵبژاردنەکان و بیروڕای خۆیان لەو بارەیەوە دەربڕن و هەموومان قبوڵی کەین، کەمەفهومی حوکمی (وامرهم شورا بینهم ) پەسەندترین نیزامی تەعبیر کردنە لەشورا، چونکە مەبەست لە کۆبوونەوەیە و زانینی ڕێژەی نارەزاییە لە دژی هەڵبژاردنەکانو ئێستا کەکۆمەڵێکی زۆر لە مەیدانی ئازادی کۆبوونەتەوەو توانای ڕای خەڵك ئاشکرا بووە و هەموو لایەك ئەم ڕاستیە دەبینن، منیش بڕوام وایە کە ئیتر پێویست ناکات کۆبوونەوە ڕێك بخرێت، باشتر وایە هەموو لایەك بگەڕێنەوە سەر ماڵ و کارەکانیان.

والسلام و علیکم ورحمە الله

براتان ئەحمەدی موفتی زادە.

کیهان ٢٦/١/ ١٣٥٨.





# سەرپێچی لە هەڵبژاردنەکانی سنە

ئەحمەدی موفتی زادە لە گفتوگۆ لەگەڵ ڕۆژنامەی(ایندەگان) بڕوای وابوو کە ساختەکاری و سەرپێچی ئاشکرا لە هەڵبژاردنەکانی سنە ئەنجام دراوەو شایەت و بەڵگەی بەهێز لەبەردەست دایە، کەلە ژێر دەستی شورای کاتی(٥) نەفەریدایە. ئەحمەدی موفتی زادە لەم گفتوگۆیەدا ڕۆژنامەکانی(ایندەگان و کیهان)ی سەرزەنشت کردوو ووتی"ئەم ڕۆژنامانە ڕاستیەکان دەرناخەن و زیاتر چەپ ڕەوگن، ئەو هەروەها بڕواشی وابوو کە هیچ هەواڵێك نابێت بشارێتەوەو ناکۆکیەکان درێژەی پێ بدەی.

ڕۆژنامەی (ایندەگان ١٣٥٨/١/٢٧)

*****

## عەللامە موفتی زادە، ڕاگەیاندنی جیهاد لەسنە بە درۆ دەخاتەوە.

سنە- علامە ئەحمەدی موفتی زادە، ڕابەری مەزهەبی سوننە — لە پەیوەندیەكی تەلەفۆنیدا لەگەڵ(كیهان) هەرجۆرە ڕاگەیاندنێكی جیهاد لەلایەن ئەمەوە بەتوندی بەدرۆی خستەوە.

هەروەها ووتیشی"پروپاگەندەی هەبوونی ئەفرادی كاتی لە سنە بەڕاست نازانێت، هەروەها داوای لابردنی مەركەزەكانی پێشمەرگەو كۆمەڵەی بەرگری كردن لە ئازادی و شۆڕشم نەكردووەو كاتی دیاری كراو بۆ چۆلكردن بەتەواوی بۆ كەم كردنەوەی ئالۆزی لە شار تا بڕیاردانی دواتر بوو".

علامە ئەحمەدی موفتی زادە لەو گفتوگۆیەدا لەبارەی ڕێپێوانەكەی دوێنێوە ووتی"خەڵك شورای شار بە نایاسای دادەنێن و باوەڕیان وایە لایەنگرانی پێشمەرگە فیدایەكان و كۆمەڵەی بەرگری كردن لە ئازادی، بوونەتە مایەی نائارامی و تێكدانی شار، لەبەرئەوەی خەڵك ناتوانن بوونی ئەوان، لەبەرئەوە دەیانەوێت بنكەكانیان كەلەناو شاردایە لابرێت.

ئەو هەروەها ووتیشی"من هەوڵ دەدەم كەلە ڕوودانی هەرجۆرە ڕووداوێكی خوێناوی پێشگری بكەم. لەلایەكی ترەوە(فواد ڕۆحانی)یەكێك لە نزیكەكانی موفتی زادەو نەفەری یەكەمی شورای هەڵبژێراوی شاری سنە لە گفتوگۆیەكدا بڕوای وابوو"بێچەك كردنی پێشمەرگەكان ڕاست نییە ، ئێمە پێش هەڵبژاردنەكان ڕێكەوتین كەدوای دیاری كردنی ئەندامانی شورای شار، نوسینگەكان چۆڵ بكرێن و لەجێگای ئەواندا پاسدارانی شورای شارو هێزەكانی ئاسایش جێگیربن، ئێستا كە نیگەرانییەكی گشتی سەری هەڵداوە، دوامان لەپێشمەرگەكان و كۆمەڵەی بەرگری كردن لە ئازادی و شۆڕش كرد كە چەند ڕۆژێك زوتر جێبەجێی بكەن.

ڕۆژنامەی (كیهان ١٣٥٨/١/٢٨)

# قبوڵکردنی هەڵبژاردنەکانی سنە باشترە لە دووبارە کردنەوەی

سنە– پەیامنێری ایندەگان: سنە کەلەدوای ڕاگەیاندنی هەڵبژاردنەکانی شورای (١١) نەفەری و بەدوای ئەو هۆشدارییەی کەئەحمەد موفتی زادە بە گروپە ناکۆکەکانیدا، بەوەی کە هەرچی زوترە نوسینگەکانیان چۆڵبکەنو چەکەکانیان بگوازنەوە، وا پێش بینی دەکرا کەتوشی گرفتێکی تازە ببێت، بەلاّم بەسازدانی گفتوگۆی تێروتەسەل و ماوە درێژی شورای کاتی(٥) نەفەری و قایمقامی سنە، لەگەڵ هەر دوو گروپی ئیسلامی و پێشڕەو هێمنی خۆی پاراست،و ئەو ترسو چاوەڕوانییە کەلەلای خەڵك دروست بوو ڕەوییەوە.

ئەحمەدی موفتی زادە، ڕابەری مەزهەبی و سیاسی و گروپی ئیسلامی سنە لەبارەی ئەم هۆشدارییە بۆ(ایندەگان) ووتی: "خەڵك لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکان تورە بوون، چونکە بڕوایان وابوو کە ساختەکاری کراوە، بەم هۆیەوە کاتی ئەنجامی هەڵبژاردنەکان ڕاگەیەندرا ، زۆر تورە بوون".

موفتی زادە بەردەوام بوو ووتی: "من لەگەڵ خەڵك قسەم کردو و پێم ووتن لەباتی ئەوەی هەمووتان بەیەکەوە کاربکەن باشتر وایە چەند کەسێك لە مەلاکانتان بەنوێنەری خۆتان بۆ گفتو گۆکردن بنێرن, و ئەوەی کەدەوترێت من تا کاتژمێر (٨)ی بەیانیم داناوە بۆ گروپە ناکۆکەکان بۆئەوەی چەکەکانیان بگوازنەوەو بنکەکانیان چۆڵ بکەن، ئەڵبەتە ئەمە بڕیاری کۆتایی ئێمە نەبووە لەگەڵ ئەو گروپانەدا،بەڵکو بۆ ڕازیکردنی خەڵكو دامرکاندنەوەی تورەیی ئەوان بووە،

بۆئەوەی كە ئەو هەلەی كەدێتە پێشەوە بتوانین ئەنجامێكی باش و ویستراو بەبێ شەڕ بەدەستی بهێنین.

موفتی زادە لەوەلامی ئەو پرسیارەی، كە ئەگەر بەڵگەكانی ئێوە لەبارەی ساختەكاری لە هەڵبژاردنەكاندا دانی پیا بنرێت و شورا هەڵبژاردنەكان هەڵبوەشێنێتەوە، ئایا ئێوە ڕازین كە ئەم هەڵبژاردنانە ڕەد بكرێتەوە یان نا. ووتی: "من لەمبارەیەوە ڕای خۆمم ڕاگەیاندووە، وتومە كە هەرچەندێكیش ساختەكاری كرابێت، قبوڵ كردنی ئەنجامەكان باشترە لە دووبارە كردنەوەی. ئەو وتیشی: " ئەڵبەتە ئێمە بەڵگەی بەهێزمان لایە كە لە هەڵبژاردنەكاندا ساختەكاری لەلایەن گروپە چەپڕەوەكانەوە كراوە".

سەرۆكی كۆمەڵەی بەرگری كردن لەئازادی و شۆڕش لە سنە بۆ (ئایندگان) ووتی: "ئەڵبەتە لەم هەڵبژاردنانەدا ساختەكاری زۆر كراوە كە ئێمەش بەڵگەی پێویستمان لەبەردەستدایەو خستومانەتە بەر دەستی شورای كاتی (٥)نەفەری، بەلام مەسەلەكە لێرەدا كەمی دەنگەكان نییە، بەڵكو مەبەست ئەوەیە كە شار لەلایەن شوراوە بەڕێوە ببرێت".

لەلایەكی ترەوە نیوەڕۆی پێنج شەممە لە بارودۆخێكدا كە گفتوگۆكانی شورای كاتی پێنج نەفەری، قایمقامو گروپە پێكدادەرەكان لەگەڵ پەنابەرەكانی مزگەوتی(جامع) بەردەوام بوو، نزیكەی(٥٠٠)كەس لە خوێندكاران و گروپەكانی تر بەمەبەستی ناڕەزایی و ڕەخنە گرتن لە نائارامییەكانی سنە لە دادگای ئەم شارەدا دەستیان كرت بە مانگرتن.

دوای نیوەڕۆی دوێنێ، (یونسی)قایمقامی كوردستان، لەگەڵ سەرۆكی دادگاو نوێنەرانی مانگرتوان دەستیان كرد بە گفتوگۆ و داواكارییەكانی ئەوانیان تاوتوێ كرد.

لـەم دانیشـتنەدا کەپـەیامنێری(اینـدگان) نـیش ئامـادەبوو، قایمقـام ووتـی بـەنێردراوی(اینـدگان) "دوێنـێ شـەو(پێـنج شـەممە) مـانگرتنی موسـوڵمانانی مزگەوتی(جامع)بەپێی ئەو ڕێکەوتنانەی کە کراوە شکێنرا".

قایمقام دووپاتی کردەوە ڕێکەوتنەکان زۆر گشگیر بـوو، هـەر دوو گروپەکـە بڕوایـان وابوو کە شار دەبێت ئاسایشی تێدا بێت و هەڕەشە لە خەڵك نەکرێتو خوێنـدکاران و مامۆستایان بە چەکەوە نەچنە پۆلەوە.

یونسـی ووتیشـی"بەدەسـت پێکردنـی کارەکـان شـورای(١١)نەفـەری زۆرێـك لـە کێشەکان کۆتایی پێدێت و ڕێگری دەکرێت لـە کڕین و فرۆشـتنی چەكو ئاسـایش دەگەڕێتەوە شارەکە.

هـەروەها قایمقـام ئامـاژەی بەوەشـکرد، کـە بـەجێگیر بـوونی پۆلیسـی مـەدەنیو شارەوانی(ژاندار ملی) هەموو چەکەکانی گروپـە جیاوازەکـان کۆدەکرێنـەوەو تـەنها چەك لەدەستی پۆلیس و جەندرمەکاندا دەبێت و هەرکەسێك لەو شارەدا بە چەکەوە ببینرێت، چەکەکەی لێدەسەنرێت.

پەیامنێری ئێمە لە کۆتایی ڕاپۆرتەکەی خۆیدا دووپاتی کردەوە کە لە حاڵی حازردا شاری سنە ئارامەو خەڵکی لە دوای نیوەڕۆی(٥) شەممەوە کارەکـانی خۆیـان ئـەنجام دەدەن .

لە هەمان کاتدا لە بەدواداچوونی شکایەتەکانی هەردوولا –گروپە ئیسـلامیەکان و پێشڕەو –لەمڕۆوە(جومعە) دەستی پێکردووەو تا(٧) ڕۆژ بـەردەوام دەبـێ، شـورای کاتی(٥) نەفەری بە هارێیەتی ئەندامانی ئەم کارەی گرتە ئەستۆ.

ڕۆژنامـەی (ایندگان ١٣٥٨/٢/١).

❊❊❊❊❊



# عەللامە ئەحمەدی موفتی زادە:

## لە ڕووی سیاسییەوە ڕووبەڕووی ناکۆکیەکانی سنە ببنەوە

عەللامە ئەحمەد موفتی زادە بەهۆی ناکۆکیەکانی سنەوە لە پەیامێکیدا لە ڕادیۆی سنە، ڕاگەیاندنی جیهادی بە درۆ خستەوە. سەرەڕای بانگهێشت کردنی خەڵك بۆ ئاشتی، داوای لێکردن بە گفتوگۆ ناکۆکیەکان چارەسەر بکەن .

موفتی زادە، لە پەیامەکەی خۆیدا ووتی"کەسانی پەیوەندیدار بە ڕژێمی پێشووەوە کە پلەو پایەکانیان لە دەست داوە لە(سرحدات) بنکەیان دروست کردووەو بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکەیان بەو بودجە زۆرەی کە لە بەردەستیان دایە بەکرێگیراوان دادەمەزرێنن و ئەو دیعایانەشی کە لەشاردایەو بڵاوە هەر لەلایەن ئەمانەوەیە.

ئەو لە بەشێکی تری پەیامەکەیدا ووتی"ئەگەر کەسانێك لە خوێندنگاکان و شاردا کێشە دروست دەکەن بۆ گەنجانی موسوڵمان، دەبێت ئەوانە لە ڕێگەی سیاسیەوە ڕەفتاریان لەگەڵدا بکرێت، نەك بە شەڕ و ناخۆشی.... سەرەڕای ئەوەش دەبێت ئەوەمان لەیاد بێت، کە ژمارەیەکی زۆر لەم کەسانە کە هەڵخەڵەتاون و ڕێی ئیسلام لایانداوەو خۆیان لە پەنای کۆمەڵەو تاقمی تردا حەشار داوە، لەبەرئەوەیە کە ئیسلامی ڕاست یان باشتر بڵێین لەواقیعی ئیسلام تێنەگەیشتوون، نازانن مانای ئیسلام چی یە... دەبێت هەڵێکی تر بدرێت بەوان. مرۆڤ ئەگەر لە کەش و هەوایەکی ئازادا و لەنێو کۆڕو کۆمەڵدا بگەڕێت تا لە مەفهومی ئیسلام تێبگات، ئەوکات دەبینێت کەلە سەد نەفەر دوو نەفەر لە ئیسلام دوور دەکەونەوەو کەنار دەگرن".

علامە ئەحمەد موفتی زادە، لە بەشێکی تری پەیامەکەیدا ئاماجەیکردبە سیاسەتە دینییەکانی شای پێشوو ووتی"گەنجەکان پێشتر وا بیریان دەکردەوە کە کۆمەڵگاکەمان کۆمەڵگایەکی ئیسلامییە، لەبەرئەوە زۆر ڕقیان لە ئیسلام دەبوویەوە، ئێستا کە




دەســەلاَتی شــاه نــەماوە بەتەنکیــدی(لایــەنگری) ئــارەزووی ئیســلامی ڕاســتەقینە لەگەنجەکاندا دروست دەبێت".

ئـەو پاشـان وتـی"هـیچ بەرژەوەندییـەکی تێـدا نییـە، شـەڕی بـرا کـوژی لەشـاردا دەستپێبکات. ئەو جیهادەشی کە من ڕامگەیاندووە بەد مانا دەبێت، جیهـاد بـەمانای هەوڵ و تێکۆشانە بۆ خێرو خۆشبەختی کۆمەڵگا، واتە هەوڵدان بۆ لە ڕیشـە دەرهێنـانی ئەو شتانەی کە درۆیەو خیانەت و زەرەرە بۆ حاڵی کۆمەڵگە،

علامە ئەحمەدی موفتی زادە، هەروەها داوای لـە خـەڵك کـرد کـە دوای ئیحساسـاتەکان نەکەونو لەو خائینانەی گەنجانی باوەڕدار هەڵدەخەڵەتێننو شەڕو ئاژاوە دروسـت دەکـەن پـەیڕەوی نەکـەن"دەزانم زۆرێـك لـە تێـوە ڕەفتـارە نـاڕەوای نـاو خوێنـدنگای لـەکاتی هەڵبژاردنەکاندا بینیووە، بەلاَم ئەمە هۆیەك نییە بۆئەوەی شـەڕو کوشـتار لـەنێو شـاردا دەست پێبکات، دەبێت ئێمە هەوڵ بـدەین بەڕێگایـەکی مـەنتقی هۆکارەکـانی نەخۆشـی موسوڵمانان چارەسەر بکەین.

ئەو لە کۆتاییـدا وتـی"مـەفهومی ڕاسـتی دیموکراسـی ئەوەیـە کەمینـە شـوێنی زۆرینـە بکـەوێت، ئـەوان کـەم کـەم دەرك بـەوە دەکـەن، کـە ڕێگایـەکی هەڵـەیان گرتۆتـە بـەرو تێدەگەن، ئەگەر دیموکراسـی و نیزامـی دیموکراتیـان بووێت ئەمـە ڕاسـت نییـە کەمینـە بەزۆرینەی جامیعە ئیهانە بکاتو بڕیـار بـدات. لەمەسـەلە جـۆراو جۆرەکانـدا چـەندین گفتوگۆ ئەنجامدراوە چارەسەر دۆزراوەتەوە، هەوڵ دەدەین لەشێوە چارەسەرەکاندا بگەینە ئەنجام، ئەگەر نەگەیشتین و هیچ ڕێگایەکی چارەسەر نەمێنێت ئەوکاتە دەبێـت دەسـت و بازوی بۆ هەڵبگرێت".

ئەو جارێکی تر داوای لە خلك کرد، تا زەمانێك کە پێویست بە بەکارهێنانی چەكو بەرەنگار بونەوە نەکات لە مەنتیق و بیرکردنەوەیەکی ڕاست و دروست پەیڕەوی بکەن.

ڕۆژنامـەی (کیهان ١٣٥٨/٢/١٨).

*****

# ڕاگەیەندراوی عەللامە ئەحمەدی موفتی زادە:

سنە- ئەم ئاگادارییە دوێنێ لە لایەن(علامە ئەحمەد موفتی زادە) لە وتەیەکیدا بۆ سەرجەمی ڕۆشنبیرانی مەزهەبی-سیاسی-میللی کەهەرجۆرە ئایدۆلۆژییەكو بیرور باوەڕی سیاسی هەبێت ووتی:

## بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

هاونیشتمانانی ئازیز! ئەو گرفتاریو بێ بەشیانەی(محرومییەت)میللەتی کورد لە زەمانی ڕژێمی ستەم پیشەی شاهەنشاهی لە(کورش) تا (ئاریامەهر) کێشاویەتیو لەم ڕێگایەدا فیداکاریو هەوڵو تێکۆشانی داوە کە لاپەڕە زێڕینەکانی مێژووی بە خوێنی شەهیدەکانی پڕ کردۆتەوە و ئێستاکە هەوڵ و ماندوو بوونەکانی میللەتی موسولمانی ئێران گەیشتۆتە ئەنجام، لەگەڵ کۆماری ئیسلامی نیزامی (نۆتۆ نۆمی) جێگەی ڕژێمی فاشیستو دیکتاتۆری شاهەنشاهی گرتۆتەوە. میللەتی کوردیش هەر وەك سەرجەم میللەتانی ئازادی ئێران دەبێت لە تەواوی مافەکانی میللی، سیاسی، کۆمەڵایەتی،و فەرهەنگی بێ بەش نەبێتو بۆ ئامادەکردنو بێ بەش نە بوونی لەم مافە شەرعیو مرۆییو بەدەستهێنانی خودموختاری لە چوارچێوەی کۆماری ئیسلامی ئێران سەربەخۆ لەگەڵ حاکمیەتی تەواو، کە ئەمە ئەرکێکی قورسی دینی و مەزهەبی و ئینسانی دەخاتە سەر شای یەك بەیەکی هاوولاتیانی تر، کە بۆ ئامادە کاریو ڕێکخستنی بەرنامەی ڕاستو دروست لەو زەمینەیەدا ڕۆژی(٢٠ی خورداد) ئەم مانگە لەسنە کۆببنەوەو بۆ





دیاری کردنی ئەم مافە ئینسانی و کۆمەلایەتی و شەرعییە لەگەڵ یەکدا بیرورا ئاڵوگۆڕ بکەن و تەواوی بیرورِاو دەنگەکانی ڕۆشنبیرانی مەزهەبی و سیاسی و میللی لەبەر نامەیەکی تەواو گشگیردا ڕێك بخەن، لەبەرئەوە جارێکی تر دڵنیای دەکەمەوە کە ئامادە بوونی تەواوی برادەران و هاونیشتمانانی هاوسنورمان(کورد) چونکە ئەم کۆبوونەوەیە زۆر گرنگو چارەنوس سازە، جارێکی تر بۆئەوەی هیچ هەڵەیەك توشی هیچ یەکێك لە جەنگاوەران و (ئەوانەی کە ئەسیر بوون و لە سجن بەربوون) نە بێت دڵنیاتان دەکەینەوە کە ئەم دەعوەت و کۆبوونەوەیە تایبەت نییە بەیەك چینی کۆمەڵگا، یان حیزبێك یان ئایدۆلۆژیایەکی تایبەت، بەڵکو دەبێت تەواوی ڕۆشنبیرانی مەزهەبی و سیاسی و میللی لەم کۆبوونەوەیەدا بەشداری بکەن.

وسلام وعليكم ورحمه الله والبركاته.



# وەڵامی عەللامە موفتی زادە بۆ ئایەتوالله ڕوحانی.

پەیامە گرنگەکەی علامە موفتی زادە:

پیلانی کوشتاری خەڵکی (سنە) هەر لە سەرەتاوە کۆتایی پێهات و فەشەلی هێنا.

علامە ئەحمەد موفتی زادە، دەربارەی ڕووداوەکانی ئەم دواییەی کوردستان و بارودۆخی کوردستان دوای ئینقلابی کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ میللەتی ئێران پەیامێکی نارد، ئەمە دەقەکەیەتی:

## بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

هاونیشتمانیانی موسوڵمان !

زەمانێك کە بزوتنەوەی مەزنی شۆڕشی میللەتی ئێران ڕێگای خۆی بەرەو ڕوخاندنی کۆشکی ستەمی(٢٥٠٠) ساڵەو تێکشکاندنی لانکەکانی پەیوەست بوون نۆکەری ئیمپریالیزم دەست پێکردو و خۆفرۆشانی جاسوس و بەکرێ گیراوانی (ساواك) حەیران و نیگەران بەدوای ڕێیەکدا دەگەڕان لەوێوە هەڵبێن و گیانی خیانەت پیشەیی خۆیان لەدەستی تۆڵە کردنەوەی خەڵك ڕزگار بکەن، ناوچەی کوردستان، چ ئازربایینجانی ڕۆژئاوا، و چ شارۆچکەکانی کوردستان و کرمانشان بە هەبوونی سەدەها(کیلۆمەتر) سنوری کراوە بەرەو ڕووی مەرزەکانی ئیمپریالیزم سور و ڕەش هەلێك بوو بۆ دەرباز بوونی خائینان، بەتایبەتی کە ڕژێمی پێشوو و





بەهۆی ترسانی لە تۆڵەی میللەتی زوڵم لێکرای ئەم ناوچەیەیی پڕکردبوو لە ئەندامان و بەکرێ گیراوانی(ساواك). لەوانەیە بوترێت کە ساواك نزیکەی ١/٤ لە کۆی ئەندامانی خیانەت کاری بۆ کوردستان ناردووە، لە زەمانی ڕژێمی پێشووەوە ئەوەی کە ئەڵبەتە نە دەگەیشتە هیچ شوێنێك هاواری خەڵك بوو، بەلاّم بەداخەوە دوای قۆناغی یەکەمی سەرکەوتنی شۆڕشیش میللەتی ستەم لێکراو چەندەها جار لە کۆبوونەوەی هێزەکانی(دژ خەلق) بەکرێ گیراو لە کوردستان هاواری لێبەرز بوویەوە، بەلاّم ئەو هاوارەشی نەگەیشتە ئەنجام.

هاونیشتمانیانم! میللەتی موسوڵمانی ئێران! ئەوەی برایان و خوشکانی ئێوە لە ماوەی(٦) مانگی ڕابردوودا دوای سەرکەوتن تەحەمولی کردووە، زۆر زیاترە لەوەی لەماوەی ڕووبەڕوو بوونەوە ناودەبرێت یان باسدەکرێت، کاریگەر دەبێت، ئەگەر بزانیت کە ئێوە لە هەموو شوێنێکی ئێران خەریکی ئاهەنگ گێران و جەژن بوون بەبۆنەی لەناوچونی ڕژێمی شاهەنشاهی، بەلاّم لە کوردستان ئەم کەیف و شادییەی خەڵك چەند ڕۆژێك زیاتر نەبوو، یەکسەر پاشماوەکانی ڕژێم بە داپۆشینی ماسکی ئینقلابیو بە سود وەرگرتن لە خاڵە لاوازەکانی دوای شۆڕش دەستیان کرد بە ئازاردانو کوشتاری موسوڵمانان لە کوردستان، خوشکان و برایانی موسوڵمان ئێوە لەوە دەچێ سەرتان سوڕ بمێنێ لەوەی کە بۆچی لە ڕابەری هێرشەکانی هەموو جنایەتکارانی ئێران بۆ کوردستان میللەتی موسوڵمان و شۆڕشی ئیسلامی ئێران ئەوانی فەرامۆش کردووە. لەم دواییانەدا کە جنایەتی بەکرێ گیراوانی وەکو کوشتاری نەوجەوانانو گەنجانی قوتابخانەی قورئانی مەریوان و هێرشی بۆ کوشتاری موسوڵمانانی دژی ڕژێمی شاهەنشاهی کە لەلایەن بەکرێ گیراوانی داخلی و خاریجی کەلە خانەدانەکانی پەهلەوی و ئاویس و پالیزبان فەرمانیان وەردەگرت

گەیشتە ئەو پەڕی و هاواری موسوڵمانانی کوردی گەیاندە ئەنجام، و ئەو ڕاستییەی پیشاندا کە میللەتی موسوڵمانی ئێران لە هەموو شارەکان بۆ ڕزگار کردنی گیان و ناموسی موسوڵمانانی کورد هەوڵیداوە و بەپێشکەش کردنی باشترین شەهید و بانگەواز کردنی میلیۆنەها موسوڵمان بۆ شەهید بوون لە ڕێگەی ڕزگار کردنی خەڵکی کوردستان کە ئەمە بووە هۆی سارێژ کردنی برینەکانی پێشووی میللەتی کورد.

ئەزیزانم، موسوڵمانانی ئێران!

ئەوەی خوشکان و برایانی موسوڵمانی کوردی نیگەران کردبوو(ساواك) و کوشتاری بێ ڕەحمانەی بەکرێ گیراوان بوو، نەك لەدەست دانی ماڵ، لەبەرئەوە بە سوپاس و ڕێزلێنان لە بەدەنگەوە هاتنەکانی ئێوە وەك کۆکردنەوەی پێداویستی بۆ خەڵکی سنەو خەڵکی تینوو برسی(پاوە) ئەوانیشیان لە خواردنەوەی ناو بێبەش کردبوو، پێتان ڕادەگەیەنم کە پیلانی کوشتاری سنە هەر لەسەرەتاوە کۆتای پێهات، لەبەرئەوە لەم شارەدا کورت هێنانی پێداویستیەکان زۆر هەستی پێناکرێت، لە خوای گەورە داواکارین کەشۆڕشی ئیسلامی ئێران بە ڕابەری پایەبەرز (ئیمام خومەینی) ڕێگای خۆی بەرەو ڕزگار کردنی ستەم لێکراوان و هەڵخەڵەتاوان بە تێپەڕ بوونی کات بگرێتەوە.

والسلام علیکم رحمە اللە و برکاتە

(براتان ئەحمەدی موفتی زادە) (کۆماری ئیسلامی ۱۳۵۸/۵/۳۰)

*****

# چاوپێكەوتنی(كاك ئەحمەدی موفتی زادە)

ڕۆژنامەی كیهان (١٣٥٨/٣/٢٥)

## پارەمان نەڕژاندووە

ئەحمەدی موفتی زادە، دوای خوێندنەوەی بەڵگەنامەی كۆنفرانسی سەنەندەج ووتی"لەو ڕووەوە كەئێمە پارەمان ڕژاندووە تا خەڵك لە كۆنفرانسەكەدا بەژداری بكەن ڕاست نییە، ئەمانە چەند بوختانێكی نابەجێن. خۆشبەختانە ئەم ڕاستیەمان سەلماندوە" بەكۆششی خۆی كۆنفرانسەكەی ڕێكخستووەو شەو و ڕۆژ هەوڵی داوە. ووتیشی"هەتا دەوڵەتیش هیچ یارمەتییەكی نەداوین، یارمەتی تەنها لەلایەن خەڵكی(سنە)و كوردەكانی ترەوە بووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە لە فەرمانگەكان داوای یارمەتیمان كردووە، بەڵام ئەما لەگەڵ ئێمەدا هاوڕێك نەبوون. هەتا سەرۆكی شارەوانی ووتویەتی، كەلە(تاران)ەوە پێمان ووتراوە بەهیچ جۆرە هاوكارییەكتان نەكەین".

*****



# یاسای بنچینەیی لە ژوورێکی دەرگا داخراودا

(هادی مورادی) ئەندامی شورای شار، وتەی کەسێکی تر لەئەندامانی شورای شار کەلە بەرنامەی(ئایندەگان) بلآوبۆتەوە بەبێ (عەلامە موفتی زادە) لە ڕادیۆو تەلەفزیۆنی سەنەندج بە درۆزانیو ووتی" تەصەور ناکرێت کەسێك لە ئەندامانی شورای شار پەیوەندی بە(ئایندەگان)ەوە کردبێت لەم بارەیەوە، ئەگەر شتێك هەبێت ئەوە ئێمە لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەین".

ئەحمەدی موفتی زادە، لەبارەی یاسای بنچینەییەوە ووتی"تەرحێك بۆ یاسای بنچنەی کرابێت بەبێ ئامادەبوونی نوێنەرانی ڕاستەقینەی کورد، یان لە ژوورێکی داخراودا بەنهێنی بنوسرێت و ئەو کاتە پیشانی خەڵکی عام بدرێت، ڕەفزە و قبوڵ نەکراوە".

❊❊❊❊❊

## عەلامـــە مـــوفتی زادە لـــە چـــاوپێكەوتنێكی تایبەتیـــدا لەگـــەڵ ڕۆژنامەی( كیهان ):

## "هەدەف لە ئابوری( تەوحیدی ) یەكگرتوو، لە ناوبردنی جیاوازی چینایەتییە"

**پ/** ئەوەی ئێستا لەناو(تاران)دایت هۆیەكی تایبەتی هەیە؟

**و/** مەرحەلـەی هەڵبـژاردنی(ڕەئـی دان) یاسـای بنچـنەیی جمهـوری ئیسـلامی لـە گرنگترین مەرحەلەكانی دوای ئینقلاب دەژمێردرێت، پەیوەندی ڕاستەخۆ و نزیكـی بە داهاتووی ئێرانەوە هەیە، پێش هەڵبژاردن هەندێك لە گروپەكان بـەبێ ئاگـاداری منیان دیاریكردووە وەك نوێنەری(مجلیسی خبرگان)، بـەڵام بـەهۆی لێكۆڵینـەوەمان لە بـارودۆخی كۆمـەڵگاو گشـت نوێنـەرانی گروپـەكانی تـر، قـازانجم لـەوەدا بینـی لەهەڵبژاردنەكەدا بەژداری نەكەم، پێش ئینقلاب هەمیشە كێشەكانی دوای ڕزگاری لەنێوان شەخسیەتە ئینقلابیەكاندا باسكراوە، هەر بۆیـە هەنـدێ لـەو شـەخسـیەتانە ئاشنـای تەواوین هەبووە لەگەڵ بابەت و كێشەكانی دوای ئینقلابی ئیسلامی، هـەر لەبارەی ئەم بابەتەوە بەرەزامەندی نوێنەرەكان، لەلایەن(ایـت اللـە مونتـەزیری) بـۆ یارمەتی(كۆمسیۆنی حەوتەم)كە مەسەلەی ئابووری دەخستە ڕوو بانگهێشت كـرام، بەهۆی هەستیاری بابەتەكەوەو گۆڕانی ئابووری تاغوتی، كەبەشـێك بـوو لـەنیزامی تێكەڵاو لە شیركی تاغوتییە بۆ ئابوری یەكگرتوو(تەوحیدی) كەهەدەفی لەناوبـدنی بۆشاییە كۆمەڵایەتیەكانە، ئەم بانگهێشتەم قبوڵكرد.

**پ/** ڕازیت لەو بابەتانەی تائێستا لە(مەجلسی خبرگان) خراوەتە ژێر باس و لێكۆڵینەوەوە؟

**و/** هەندێك لە بنەماكان زۆر باشن و هەندێكیان كەم و كوڕییان هەیە و هەندێكی تریشیان دژی ئیسلامەو كۆنەپەرستیە، وەك بەكار هێنانی وشەی ڕەسمی بۆ مەزهەبی(سوننی)، یان (اصلی پێنج) كە پەیوەندی بە(ویلایەتی فەقیهەوە) هەیە، كەدەڵێت "ویلایەت لە ئەستۆی فەقیهدا دەبێت"، بەبێ ئەوەی ئاماژە بە هیچ ڕوونكردنەوەیەكی تر بكرێت. لەبارەی ئەم بابەتەوە تۆزێك ناڕوونی پێوە دیارە، ئەگەر(ویلایەتی فەقیه) هۆشیارانەو بەو شێوەیەی قورئان فەرموویەتی هەڵبژێرێت جێگای گومانی تێدا نییە، قورئان دەفەرموێت:"كۆمەڵگاكان دەبێت بە نیزامی شورا ببرێن بەڕێوە". شوراكان (ئولول ئەمرن)، كەسانێكن شارەزاییان لەبارەی دین و مەسەلەكانی تری ڕۆژگارەوە هەیە. لە(ئەصلی شەش)دا باسی بەڕێوەبردنی كۆمەڵگە دەكات بەهۆی شوراوە، بەلام بەهۆی ئەوەی لەسەرەتای ڕێگەداین و زۆرینەی خەڵك زانیاری تەواو پێویستیان لەبارەی مەسەلە دینییەكانەوە نییە، ئەگەر لە(مادەی شەش)دا ئاماژە بەوە دەكرا كەلەلایەن كەسێكەوە ئیدارە بكرێت زانیاری لەبارەی مەسەلە دینییەكانەوە هەیە كێشەی نەدەبوو، بەلام ئێستا زۆر كەس وا بیردەكاتەوە، كەمەبەست لە(پێنج ئەصل) دامەزراندی حوكومەتە لەلایەن(ئاخوندەكان-مەلاكان-)ەوە، ئەم ڕەشبینییە لەلایەن خەڵكەوە وا دەكات كەئینقلاب ئاسانتر ڕێچكەی خۆی نەگرێتەبەر، هەر بەو شێوەیەی(ئیمام) تەئكیدی كردۆتەوە دەبێت دوور كەوینەوە لە ناكۆكی نێوان(ڕۆحانی و خوێندەوارەكان)، بۆئەوەی نەبێتە هۆی ڕێگری لەبەرەرو پێشچوونی كارەكان.

**پ/** بەبۆچوونی ئێوە مەرجەكانی (ویلایەتی فەقیه ) چییە؟





**و/** بەبۆچوونی من وشەی(فەقیە) بۆ ڕۆشنبیرێكی ئیسلامی هەندێك بچوكە، ئەوەی قورئان ئاماژەی بۆ دەكات ئەو ڕۆشنبیرە ئیسلامیانەن كە بە وشەی(ئولول ئەمر) ناویان دەبات، ئەوەش كەسێكە لەهەموو زانستەكانی(فیقە، دەرونزانی، زانست و بابەتەكانی تری ئیسلامی) بەشێوەیەكی هەمە لایەنە زانیاری هەبێت، هەربۆیە دەڵێم كەسێك تەنها (زانستی فیقە) شارە زابێت بە ڕۆشنبیری ئیسلامی دانانرێت.

**پ/** بەوشێوەیەی ئێوە پێناسەی(ئولول ئەمر)تانكرد، لەگەڵ ئەوەی فەقیهێكی(ویلایەتی فەقیە) ئاماژەی بۆ دەكات كەمێك جیاوازی هەیە، ئایا وا بیرناكەنەوە ئەمە كەم و كوڕییەكە لەتەعبیركردندا؟

**و/** ئەگەر بەو شێوەیەش بێت وەك بنەمایەك دەرنەكەوتووە، بیركردنەوەو ئازایەتی و زانیاری بۆ بابەتەكانی ڕۆژ بەس نییە، بۆئەوەی ببیتە ڕۆشنبیرێكی ئیسلامی، بەڵكو بوونی میللەتێكی هۆشیاری ئیسلامی ئەوەی كە چەند نەفەرێك كۆمەڵگا بەشێوەی شورا بەڕێوەبەرن بۆخۆی بنەمایەكی سەربەخۆی هەیە، ئەو كەسەی كەئەندامی شورایە پێویستە ئەم سیفەتانەی هەبێت، مەگەر كاتێك كۆمەڵگا لە حاڵەتی قات و قڕیدا بێت، ئێستا لەم وڵاتەی ئێمەدا كۆمەڵگازان و ئابوری زانی وا هەیە كە زانیاریان بۆ ئیسلام كەمەو زۆر لە ئاستی خوارەوەدایە، لەگەڵ هەموو ئەم كێشانەدا دەبێت ئەوانە لە شورادا سودیان لێ وەربگیرێت، بەڵام لەگەڵ تێپەڕ بوونی كاتدا هۆشیاریان بۆ ئیسلام زیاددەكات و دەبێت شورا خاوەنی بڕیار بێت، یەكێك لە كەموكوڕیەكانی(قانونی ئەساسی) ئەوەیە هەندێك لە بابەتەكانی لە قورئانەوە وەرنەگیراون، بەڵام هەوڵدراوە لەگەڵ قورئاندا یەكانگیر بكرێت، لە كاتێكدا قانونی ئەساسی ئەوكاتە ئیسلامییە كە هەموو بنەماكانی لە ئیسلامەوە وەربگیرێت .

**پ/** ئەگەر لادانێك لە شورادا ڕوویدات، بەبڕوای ئێوە دەبێت چ هێزێك لەگەڵ ئەوەدا ڕووبەڕوو بێتەوەو ئەو لادانە نەهێڵێت؟

**و/** ئەگەر لە شورادا لادانێك ڕوویدات و ئەویش پەیوەندی بەدوای ئینقلابەوە هەبێت، کەسێك کەجێگای باوەڕی خەڵکە دەبێت بڕیار بدات، ئەگەر ئەم صەلاحییەتیەی نییە، ئیتر چ حەقێکی هەیە لەوەی کە ئەندامێکی شوراکەیە؟!

**پ/** بەبۆچوونی ئێوە ڕەنگدانەوەی ڕێکخستنەوە، چۆن دەبێت، لەبەرئەوەی ڕوانینی خەڵك زۆرتر بەرەو سوننەتی ئیسلامییە، ئەگەر پێوانەکاری تەنها پشت بە ئەفکاری گشتی ببەستێت ئێمە ڕووبەڕووی کێشە دەبینەوە، لێکدانەوەتان بۆ ئەمە چییە؟

**و/** ئەوەی کەکۆمەڵگا هێشتا ئیسلامی تەواو نەبووە قسەیەکی مەنتیقییە، بەداخەوە لەبەرئەوەی ئینقلاب زوو گەیشت، بووە هۆی ئەوەی خەڵك زانیاری تەواو لەسەر ئیسلام بەدەست نە هێنن، ئەگەر زەمان(کاتی ڕوودانی ئینقلاب) درێژتر دەبوو بارودۆخمان لەمەی ئێستا باشتر بوو، لەکاتی ئێستادا ئەرکی هەر تاکێکی هۆشیار ئەوەیە، تا ئەوپەڕی توان هەوڵبدات ئینقلاب لە ڕێڕەوی خۆی دەر نەچێت، بەلاّم بەداخەوە کاری(نادروستی) هەندێك لە ڕۆحانییەکان بووە هۆی دڵ ساردی بەشێك لە ڕۆشنبیرەکان و لەدەستدانی کارەکەیان. نە گەیشتن بەئەنجامی ڕاستەقینەی ئینقلاب یەکسانە بەپێشێل کردنی خوێنی هەزاران شەهید، هەروەها ئەو کلاّوڕۆژنەی ئومێدی خەڵکی بێ بەشی(جیهانی سێیەم)، کە بۆ ئینقلابی ئیسلامی هەیانە دادەخرێت، ئەمەش ڕووخانی مەکتەبەو خەتاکەی لە ئیسلامەوە نییە، بەڵکو لەلایەن موسوڵمانانەوەیە، هەر ئێستا ڕۆشنبیرانێك هەن صەلاحەتیان لەمانەی ئێستا چەندجار زۆر ترە، هەر بۆیە دەبێت بۆ ئەو خەڵکەی دووچاری ڕەنج

و زامگەلێكی زۆر بوون بكرێت و هۆی ئەم كێشانە بخرێتە ڕوو، هەولبدەن ئەم كێشانە چارەسەر بكرێت، بەجیابوونەوەو گۆشەگیری هیچ كێشەیەك چارەسەر ناكرێت، هەربۆیە جگە لەم كارە دۆڕان مسۆگەرە.

**پ**/ دەڵێن گەورەترین زەمینە بۆ ئەم كەم و كوڕیانە ناشارەزای خەڵك بووە، كەپێش ئینقلاب و دوای ئینقلاب وجودی هەبووە. كۆمەڵێك لەپشت پەردەوە بوون و هەن، زۆر بابەتی(ضد ئینقلاب)ی دەپارێزن و بۆ وروژاندنی خەڵك لە زۆر بابەت سود وەردەگرن، بەتایبەت لەو ڕووەوە كەدەڵێن حوكومەت ئیسلامی نییەو یاساكان بە هەڵبژاردن دانەنراون، بەمشێوەیە ئەم كارەساتەی كوردستانیان نایەوە، ئەمە تەنها بۆ كوردستان نییە، بەڵكو بۆ بارودۆخی تارانیش كاریگەر هەیە.

**پ**/ ئایا بەبڕوای ئێوە هۆكاركانی ئیمپریالیزم لە كارەساتی كوردستاندا بەژدار بووە؟

**و**/ بەدڵنیاییەوە بەوشێوەیەی ئینقلاب، واتە مەرگی ئیمپریالیزم و خاوەن هێزە گەورەكان كەئیمتیازاتێكی زۆریان لە دەستداوە، بەبێ دەنگ دانانیشن و هەموو ڕۆژێك بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵك لەكەسایەتی جۆراوجۆر سود وەردەگرن، خەڵكی بەرەو ڕێڕەوی(ضد ئینقلاب) ئاراستە دەكەن .

**پ**/ هەڵوێستی ئێوە بەرامبەر حیزبی دیموكرات چییە؟

**و**/ هەڵوێستی من لە ساڵانی پێشەوە، تەنانەت پێش ساڵی(١٣٤٢) ڕوون بووە، هەموو هەوڵێكی من بۆ ژیانەوەی ئیسلامی ڕاستەقینە بووە لەناو ئێران و تەنانەت لە دەرەوەیشی. بەئەندازەی هێزی خۆم تێكۆشاوم، ئەو كاتانەی كەئینقلاب گەیشتبوویە لوتكە ڕژێمی پێشوو هەوڵی دروستكردنی شەڕی ناوخۆی دەدا، ئێمە هەمیشە هەوڵماندەدا خەڵكی ئاگادار بكەینەوە كە بەڕژێمی پێشوو فریو نەخۆن،و

هۆشیارمان دەكردنەوە كەلە حوكومەتی ئیسلامیدا جیاوازی چینایەتی هیچ مانایكی نییە، ئێستاش كاری ئێمە هەر ئەوەیە، كەبۆچوونەكانی مەكتەبی ئیسلامی بەتەواوەتی پەیڕەو بكەین، بەلاّم بەداخەوە ڕێڕەوی كارەكان بەشێوەیەكن نەك هەر لەڕووی ئیشەكەوە، بەڵكو لە ڕووی شێوەی ئیشكردنەوە بە جۆرێكە خەڵك بەرەو نائومێدی دەبات، مەگەر خەڵك چەندەهاجار نەیانبیستووە لە(ئیمام) كە ئەوكەسانێكی بەنەعلەت كردووە لەنێوان مەزهەبەكاندا جیاوازی دروستدەكەن؟ باشە ئێمە چۆن(اصلی دوانزە) كەلە نێوان(شیعەو سونن)ی جیاوازی دروستكردووە بۆ خەڵكی ڕوون بكەینەوە؟ كاردانەوەی خەڵك چۆن دەبێت، جگە لە نائومێدی؟ ئالێرەدا ووتەكانمان لەگەڵ كاركانماندا پێچەوانە دەبنەوەو هاوڕێك نین!! من خۆم تا ئەوەی بتوانم هەوڵ دەدەم كۆمەڵ ئاراستە بكەم، ئێستا كارەكان كەمێك ئیسلامی نین، بەلاّم دەبێت هەر هەوڵبدرێت تا كەم و كوڕییەكان لابرێت.

**پ**/ بەڕای ئێوە سەركردەكای حیزبی دیموكرت چ جۆرە كەسانێكن؟

**و**/ چەندەهاجار بیستووتانە، گروپە چەپەكان تەنانەت(ساواكیەكان) گەورەترین ڕۆڵ لە ناوچەكەدا دەبینن. حیزبی دیموكرات جۆرێك لە پەیوەندی لە نێوان كارەكانی ئیمپریالیزمدا دروستكردووە، ئەمە لەلایەن منەوە زۆر ئاشكرایە، هەر كارێك ئەنجام بدرێت و بخرێتە پاڵ دیموكرات هەڵەیە. بەڕوونی دەبینین كە پێچەوانەی ئەمەیە، ڕۆڵی حیزبی دیموكرت لەبەرامبەر(چریكە فیداییەكان) زۆر بچوكە، كاتێك شەیتانی وەك(اویسی) و (پالیزبان)هەن كە هۆكاری ئیفلیج بوونی حیزبی دیموكرات بوون، ڕاستی لەوەدایە لەكاتی بڕیاردانەدا ئەو گروپانە كە ناویان هەمیشە كاریگەرییان هەیە، بەلاّم بەهۆی بوونی بڕیاری سەركردەكانەوە هەمیشە ئاراستەی ڕووداوەكان بە جۆرێك بووە كەحیزبی دیموكرات خاوەنی هەموو كارەكان بووە.



**پ**/بەبڕوای ئێوە لەئەندامانی سەرکردایەتی حیزبی دیموکراتدا ڕاستگۆ هەیە؟

**و**/ نەخێر، ئەوان لە بنەماکان لایانداوە، ئەم حیزبە لەسەردەمی(ڕەزا شا)وە لە تێکۆشاندا بوون، بەڵام لە ڕووی بنەماوە هەمیشە لایانداوە، هەرچەندە لەنێوانیاندا هەندێك کەسی مەزهەبی هەیە. لەناو حیزبی دیموکراتدا دوو خیانەت هەیە:

**یەکەم:** دیموکراتیان کردووە بە(مارکسی) تەواو.

**دووەم:** لەگەڵ هەموو گروپە ئیسلامیەکاندا(لەهەموو جۆرێك) هاوکاری دەکەن.

خەڵك سەبارەت بەم بابەتە بێئاگان، بەڵام ئێمە تا شوێنێك بتوانین بۆ بەئاگابوونی خەڵك لەم مەسەلانا هەوڵ دەدەین.

**پ**/ بەبۆچوونی ئێوە چی بکرێت بۆ ڕێگری لەو ڕوداوانەی لەکوردستان ڕوو دەدەن؟

**و**/بەبۆچوونی من هێزی ئاسایش، بەداخەوە نابەرپرسیارێتی ترین هێزن. لەکوردستان هێزی ئاسایش بوونی هەیە، بەڵام هەروەك لەناو خەڵکدا بڵاوە سوپا دژی خەڵکە، یەکەم هێزی سیاسی(سوپا، هێزی ابادی و بازی سازی و هێزی چاودێر)ییە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ(ضد ئینقلابی)ەکاندا، بەڵام ئێستا هێزی ئاسایش لە دیدگای خەڵکدا هێزێکی بێگانەیەو هیچ پشتیوانییەکی سیاسی نییە.

ئامانج لەوتەی بەناوبانگی (هاوژیانی ئاشتیانەو ئیمپریالیزمی شەرق و غەرب) تالانکردنی جیهان و پەکخستنی ئیرادەی میلەت.

# چاوپێکەوتنێك لەگەڵ عەللامە ئەحمەد مفتی زادە

پەیامنێری کۆماری ئیسلامی: دوێنێ عەلامە ئەحمەد مفتی زادە لە چاوپێکەوتنێکی تایبەتدا لەگەڵ پەیامنێری ئێمە لەسنە کەوتەگفتوگۆ.

دەقی چاوپێکەوتنەکە بەم شێوەیە بوو:

**پرسیار/** ئایا ئەو ڕوداوانەی کە ئێستا لە کوردستاندا ڕوئەدات بەهۆی چ حاڵەتێکەوەیە، و چ کەسانێك زیاتر لە هەموو لایەك لە دروستکردنی ئەم کێشەیەدا بەشدارن؟

**وەڵام/** لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا بەبێ تاوتوێکردن و خوێندنەوەی وردی تایبەتمەندییەکانی شۆڕشی ئیسلامی ئێران وەڵامەکەی کەموکورت دەبێت، لەم سەدەیەی کۆتاییدا چەندین شۆڕشی گەورەو بچوك لە خاڵە جیاوازەکانی دنیا سەریان هەڵداوە، تایبەتمەندییەك کە لەهەموو ئەم شۆڕشانەدا بەشێوەیەکی هاوبەش هەیە تایبەتمەندی پشت بەستنە بە هێزی جیهانی ڕۆژئاوا و دووەمیان (ئیمپریالیسمی ڕۆژهەلات)، ئەم دوو دەسەڵاتە کە پەیڕەوی دەقی (پێکەوە ژیانی ئاشتیانە) دەکەن کە مەفهومی ئەمە جگە لە ڕێکەوتنی هەردوولا بۆ تالانکردنی جیهان و لەناوبردنی ئیرادەی میللەتان هیچی تر نییە، لە هەرشوێنێك کە هێزەکانی ناوخۆی یان میللەتان لە ڕابەری حوکمەتدا هەڵدەستنەوە بەشێوەیەکی ئاسایی بە درێژای بەرەنگاربونەوەکانیان ناچاربوون بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ پشتیان پێببەستن و ئاساییە کە ڕێگای بزوتنەوەی شۆڕش گێڕی بەهۆی یەکێك لەم دوولایەنە ئایندەی شۆڕشەکە خراپ دەکات، واتە کاتێك

بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی بەیارمەتی یەکێك لەم دوو هێزە سەردەکەوێت لە ئایندەشدا هەر پشت بەو هێزە دەبەستێت، ئەوەی کەلە شۆڕشی ئیسلامی ئێراندا بۆ یەکەم جار لە مێژوودا بینراوە ئەم مەسەلەیە جیایی دەکاتەوە لە شۆڕشەکانی تر، ئەم شۆڕشە کەمترین یارمەتی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی وەرنەگرتوە، دەستپێکردنی بزوتنەوەکە لە بەهاری (١٣٤٣) سەریهەڵدا بەدرێژایی (١٥) ساڵ کە هەندێ جار زۆر بەتوندی دەردەکەوت هەندێ جاریش دەنگی نەدەدەما.

لەساڵی(١٣٥٧) بزوتنەوەی شۆڕشی گەیشتە لوتکە و لە ماوەی کەمتر لەیەك ساڵدا تەواوی هێزەکان و چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگای لەدەوری خۆی کۆکردەوە تا گەیشتن بە سەرکەوتن، ئەم بزوتنەوەیە بۆ دابین کردنی بچوکترین پێدویستی لە هیچ هێزێکی بێگانە یارمەتی وەرنەگرتووە، هەرچیەك کە هەبووەتەنیا ئیمان ئیرادەی میللەت خۆی بووە، ئەم تایبەتمەندیە کەلەم بزوتنەوە شۆڕشگێڕیەدا بەشێوەیەکی جیاواز دەرکەوتوە، بۆنەوەی لە دەستی داگیرکەرانی جیهان دوربێت لەبەرئەوە ترس و ڕقیان لەم بزوتنەوەیە دەبێتەوە.

ڕاستی ئەوەیە، ئەگەر بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی ئێران هەروەك سەرجەم شۆڕشەکانی تر لەماوەی خەبات کردنیدا پشت بەیەکێك لەم دوو هێزە دەبەستێت، دوای سەرکەوتنیشیان ئەو هێزە لەپاڵ بزوتنەوەکەدا دەمێنێتەوە پشتیوانی لێدەکەن، بەڵام سەربەخۆی ئێران لە شۆڕشکردندا و پشت نەبەستن بەهیچ لایەنێك  وای کردووە کە هەردوو هێزەکە لە تایبەتمەندیەکانی ئەم بزوتنەوەیە بکۆڵنەوە، لەلایەکی ترەوە ئێران کەلە ڕوی سیاسی و ئابورییەوە ناوچەیەکی زۆر هەستیارو پڕ ئەهمیەتە کە ئەمە زۆر گرنگ بوو بۆ هەردولا، دوای ساڵها گفتوگۆی سیاسی ئەم دوو هێزە دنیا خۆرانە توانی بویان بگەنە هاوسەنگیەك لەبارەی ئەم ناوچەیەوە،

واتە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كە ئەم دوو هێزە سامانی ئەم ولاٚتەیان لە نێوان خۆیاندا دابەشكرد بوو و لەڕوی ستراتیژیشەوە بتوانن ئیمتیازاتەكان و زەرەرەكانی هەردوو سیاسەتەكە لە ناوچەكەدا كۆنترۆڵبكەن، بەم بوونی پێشینە ئاساییە كە هەر بزوتنەوەیەك لە ئێران دژی ئەم ڕێككەوتنە سەرهەڵبدا بۆ دوو هێزە دنیا خۆرەكە گران كۆتایی پێدێ و بینیمان كە بزوتنەوەی ئینقیلاب تا كاتێك كە گەیشتە لوتكەی دەسەلاٚتی خۆی ڕژێمی تەفروتونا كرد تەنها یەك جاریش لە كەناڵێكی ڕاگەیاندنی ئەمریكا و سۆڤیەت و هەتا هێزە نوێ كانی ناو جیهان داگیركەران ناوی ئەم شەڕەیان نەبرد، لەڕاستیدا نەتەنها ئێران بوو بووە هۆی خاڵی پێگەیشتنی هەردوولا یان پێدانەوەی مافی هەردوولا بۆ گەیشتنە ڕێككەوتنێك، بەڵكو بەهۆی هیمەت و فەزل و بەخشینی بێ حەق و حساب هێزی بەكرێ گیراو و ڕامكراو، مەیدانی چاوچنۆكیش بۆ ئەم تازە پێگەیشتوانەش كرایەوە، ئاساییەكە لەناوچونی ئەم ڕژێمە دەبێتە هۆی نیگەرانی قوڵی هێزە داگیركەرەكان، بەلاٚم بەهەرحاڵ ئەم شۆڕشە شۆڕشێكی جیاواز بوو، چونكە پشتی بەهێزی ئیمان و ئیرادەی میللەت بەستبوو، سەرەڕای هەموو ئەو پێوەرانەی كە هەبوو بۆ هەڵسەنگاندنی بزوتنەوە شۆڕشگێڕیەكان گەیشتە سەركەوتن و دەبێت پێشهاتی ئەوە بكەین كە دوای سەركەوتنیش كە ئەم هێزە ئیمپریالیستانە ئەوپەڕی ئیمكانات و دەسەلاٚتی خۆیان بۆ دروستكردنی ڕێگری لەبەردەم ئینقلابدا دەخەنە كار، لە ڕاستیدا هێزە داگیركەرەكان زوو تێگەیشتون كە ناتوانن بە ڕوبەڕوبونەوەی ڕاشكاو ڕوبەڕو كارێك ئەنجامبدەن لەبەرئەوە لەگەڵ تەواوی ئێراندا ڕوبەڕو دەبنەوە، بەم پێیە تەنیا ڕێگایەك كە بۆ ئەم هێزانە دەمێنێتەوە ئەوە بوو كە لەڕێگەی پیلانو دەسیسەكردنی ڕێگای پێشكەوتن بەرەو ئامانجە كۆتاییەكان دابخەن و بتوانن

ڕووداوەكـەی سـاڵی (١٣٣٢) دووبارەبكەنـەوە، بـەو لەیەكچـونەی كـە هێـزە داگیركەركان لە بارودۆخی سیاسی و ئابوری و جوگرافیـای ئێـران هـەیان بـوو دوای تاوتوێكردنی زانیارییەكان و بارودۆخە جۆراوجۆرەكانی سـتراتیژی خۆیـان لـە چـوار هێڵدا دژی شۆڕشدا جێگیركرد، ئەم چـوار هێڵـە كەگـەمارۆی شۆڕشـیان دابـوو بـەم شێوەیە نەخشەی بۆ دانرابوو كە سەرەتای دەستپێكردنی بزوتنەوەی دژە شۆڕش لـە كوردستانەوە بەرەو خوزستان دەسـت پێبكـات، هێڵـی دووەم لـە كوردسـتانەوە بـۆ بیابانی توركمان(توركمە صحرا)، هێڵی سێیەم لە بیابانی توركمانەوە بۆ سیستان و بەلوجستان، هێڵی چوارەم لەسیستان و بەلوجسـتانەوە بـۆ خوزسـتان، بـەم شـێوەیە دەیتوانی بزوتنەوەكە لە هەموو لایەكەوە گەمارۆبدات و ڕێگـای پێشـڕەوی شـۆڕش بەرەو ئامانجەكانی ئاینـدەی شـۆڕش دابخـات، هۆكـاری وەرگرتنـی ئـەم سـتراتیژییە پەككەوتوە هەمان بارودۆخی سیاسی و جوگرافیە. دەزانن كـە كوردسـتان سـەدەها (كیلۆمەتر) لەگەڵ عێراق و توركیادا سنوری هەیـە، هـەروەها عێـراق و توركیـاش خۆیان كێشەی كوردیان هەیـە و بەنیسـبەت بەرژەونـدی كـوردەوە هەسـتیارییەكی فراوانیـان هەیـە، و عێـراق و توركیـاش مەیـدانێكی گـەورەی هاتنـە نـاوەوەی ئیمپریالیستن، زیاد لەمانـەش ئاسـاییەكە لـە هـەر شـوێنێكدا سـتەم زیـاتر بێـت، جولانـەوەش ئەگـەری زیـاترە، خـەڵكی كوردسـتان لـەدەورانی شاهەنشـاه سـتەمی زۆریـان قبـوڵكردووە، هـەم لـەڕوی مەزهـەبی و هـەرم لـەڕوی میللیـو ئـابوری و فەرهەنگیشەوە...، یەكێك لە زوڵمە گەورەكان بێ بەش كردنی میللەتی كوردە لـە كەمترین خوێنـدەواری و وەرگرتنـی زانیـاری، بەشـێوەیەك دەتـوانین بڵـێین نزیكـەی (٩٠٪)ی خـەڵك لــە خوێندنـەوەو نوسـین بێبەشـن، ئـەم هۆكـارەش لـەپاڵ مەحرومیەتیەكانی تر و ستەمەكانی تـر بەشـێوەیەكی ئاسـایی ئـەو كاریگەرییـەی





دەبێ کە ئەم خەڵکە زۆر زوو هەڵبخەڵەتێن بە دەسیسە و پیلانەکان، ئەم بارودۆخە زۆر گونجاو بوو لەگەڵ ئەو حساباتەی کەکۆمەڵەی زەردی شۆڕش کردبوویان، خاڵێکی باشیان هەڵبژارد بوو بۆ دەستپێکردن، و هۆکاری ئەوەی کە هێڵی یەکەمیان لە کوردستانەوە بۆ خوزستانیان دانابوو بەهۆی ئەو بارودۆخ و سنورەبوو کە لەناوچەکەدا بونی هەیە، بینەری ئەو ستراتیژیە ئیمپرالیستیە داواکاری زۆر زیاترییان هەبوو، لە ڕاگەیەندراوەکان و چاپەمەنییەکان و لە پێکدادانەکانی گروپەکانی دژی ئیسلام لەماوەی (٦) مانگدا و هەتا زیاتر بیستومانە و خوێندومانەتەوە. لەچاپەمەنییەکاندا بینیومانە بۆ نمونە فلاَن ڕێکخراو یان گروپی مارکسیتی وتویەتی دەبێت کوردستان بە مافە میللی و سیاسی فەرهەنگیو کۆمەلاَیەتی خۆی بگات، ئاساییە فلاَن گروپی مارکسیتی هیچ بنەمایەکی بۆ ئەم کێشانە نییە، تەنها خاڵێك کەهەیە ئەوەیە زۆرێك لە خەڵکی کورد لەم گروپانەیان بیستوەو منیش هەروەها بیستومە کە ڕۆژی ١٤/ئیسفەند کەلە(ئەحمەد ئاباد) بوین کەسێك لە(فیدایانی خەلق) کە جلەکەی منی بینی و زانی کوردم بەگەرمی پێشوازی لێکردم و بەڕاشکاوی وتی" هەموو ئومێدێکی ئێمە لە کوردستان ئێوەن، هەموو چاوەڕوانییەکانی ئێمە لەسەر زەمینی ئێوەیە کە خزمەتی ئەم سەرزەمینە بکەن،و یارمەتی ئەم خەڵکە بدەن نەك بێن لێرە ئەرکە گلاَوەکانی خۆیان پیادە بکەن، بزوتنەوەی دژی شۆڕش دەستپێبکەن هەرچەندە بە نابودی خەڵکی ئەم سەرزەمینە تەواو بێت لەماوەی ئەم (٦)مانگەدا ئێمە دەبینین کە هەموو ئەو هێزە دژە ئیسلامانە چۆن پێکەوە بوون بەیەك، تەنها ئەم گروپانە نییە، بە زاهیری گروپی(ئایدۆلۆژین)، بەلکو ئەم گروپانە لەگەڵ خراپترین هەلگەڕاوەکان و بەکێگیراوەکان یەکیان گرتووە، دەزانین لەکاتی بڕیارداندا لەزۆرێك لەم گروپانە





لەگەڵ خراپترین كەسانی ساواكدان، ڕاگەیاندراوە لەڕووداوەكانی سنەو مەریوان لە هەموو شوێنێك لە پاڵ ئەم گروپانەدا كە بەزاهیری ئایدۆلۆژیك كەسانێك لەبە كرێگیراوان و ناسراوەكانی ڕژێمی پێشوو لە كارمەندانی ساواك -سەرمایەداران- زەوی داگیركەران- قاچاخچییەكان چالاكیان هەبووە، وەبە ڕاستی ئەو دروشمانەی گروپی(ماركسیست)ەكان بەرزیان كردوەتەوە تێیدا سەركەوتوبون، ئەڵبەتە تەنها لە دوو قۆناغیدا یەكگرتن و شەڕكردن، دەستی یەكگرتنیان خستە ناو دەستی تەواوی هێزە بەكرێگیراوەكان و زدی میللەت شەڕیان دژی شۆڕشی ئیسلامی ئێران و دژی تەواوی میللەتی ئێران و بەتایبەتی كورد دەستپێكرد، بەڵام دڵنیاین ئەگەر میللەت بەهۆشیاری بكەونە دوای شۆڕش، ئەوا ئەو ئەنجامەی كە دەگەڕێتەوە بۆ ئەم یەكگرتنە شەیتانییە شتێك نییە جگە لەنابودی، بە هەرحاڵ ئەو ڕاستیەی لە كوردستاندا تێدەپەڕی ئەم یەكگرتنە هەموو هێزەكانی دژی ئیسلامە نەك لە خەڵكی كورد، بەڵكو لە تەواوی ناوچەكانی ئێران و هەتا لە دەرەوەی ئێرانیش ئەو پەڕی ئیمكاناتیان هەیە بۆیان دابین دەكرێت لەلایەن هێزە داگیركەرەكانەوە، ئەو هەواڵەتان بیستوە لەنێوان گیراوەكانی ئەم ماوەیەدا كەسانێك هەبوون بەجل و بەرگی كوردییەوە، بەڵام لە ئەسڵدا فارس، عەرەب، تورك، بلوج ونەژادی تر بوون و یان هەتا عێراقی و میسری، یان هەواڵتان هەیە كە(٤)جاسوسی ئیسرائیلی گیراون، هەروەها سەرهەنگێكی بیانیش، بەم پێیە زۆر جێگای داخە ئەم مەسەلە مایەی نەنگە (دەدەنە پاڵ مەسەلەی كورد) لە كاتێكدا ئەم میللەتە لە ڕابردوودا هەمیشە ژێردەستەو ستەم دیدە بووە، دووبارە هێزەكانی دژی شۆڕش ئەم سەرزەمینەیان كردوە بە ناوچەی ئاودانی خۆیان و زۆرن ئەو كەسانەی كە هەڵخەڵەتاون قسەكانی دوژمن كاری تێكردون و بەڕاستی و دڵسۆزی لەبەرامبەر

شۆڕشدا وەستاون بەخەیاڵی ئەوەی ڕەوبەڕووی دوژمن دەبنەوە، هەروەها كەسانێك بە دەسیسەی ئەم هێزە بەكرێ گیراوانە گیانی خۆیان لەدەستداوە، لەگەڵ ئەم هەموو ناخۆشیە كە ئەم میللەتە مەحرومە تا ئێستا چەشتویەتی و لەگەڵ ئەوەی سەرزەمینەكەیان مەیدانی تاودانی دوژمنانی میللەت بووە، بەو ڕونكردنەوەی لەسەرەوە دراوە. تێدەگەین ئەندامان یان كەسانێك زۆر ڕۆڵیان نەبینیوە، بەڵكو گروپەكان بوون كەبەیەكگرتنی خۆیان كاری جەنگاوەریان دژی ئینقیلابی ئیسلامی دەستپێكردووە، ئەگەر كەسانێك زیاتر ناوی ئەوان بەرچاودەكەوێت تەنها بۆ داپۆشینی دەسیسەكانە، هەتا كەسانێك نەك ئەندامێكی كەدەبینن حزبی دیموكراتی كوردستان ناوی دەبرێت بۆ ئەوەی كەبەم هۆیەوە قیافەی حزبی تودە، پێشمەرگەكانی فیدائی خەلق كۆمەڵەی بەرگریكردن لە ئازادی و شۆڕش و تەواوی گروپەكانی تر بە پەنهانی بمێنێتەوە، ئەم نیشانەی(حماقت)ی سەرانی حزبی دیموكراتە، ئەگەرچی خۆی خیانەتەكان دەستیان هەیە، بەلآم قبوڵیان كردووە هەموو خیانەتەكان لەلایەن ئەمانەوە بووەو ئامانج لەم كارەشیان(هێزی یەكگرتوو) دژی شۆڕشە ئەوەیە كەخۆیان واپیشانبدەن شەڕی نێوان میللەتی كورد و دەوڵەت لەبەر خاتری ئامانجی سیاسی میللەتی كوردە، بەم دەسیسە ڕوبەڕوی دەوڵەتی شۆڕش میللەتی ئێران ببنەوە، بەداخەوە سەرانی بەرپرس بەم تەڵە(فڕوفێڵ)یان نەزانیوە تەنها ناوی حیزبی دیموكراتی بەسەر زمانەوەیە.

**پرسیار/** چەند هەواڵێك ئیسپاتی ئەوە دەكەن تەداخولی دراوسێكانی باكوری ئێرانو ولآتی عێراق، و هەروەها هەندێك لە كوردانی توركیا لە ڕووداوەكانی كوردستانی ئێران دەستیان هەیە ڕای جەنابتان لەو بارەیەوە چیە؟





**وەلام/** ئەوەی جێی گومان نییە، ئەوەیە کەتەنها هێزەکانی دژی شۆڕشی ئێران نییە. کێ لەڕوداوەکانی کوردستان دەستیا هەیە؟ چەکی یەکێتی و پارەی ولاتانی جیاواز کەلەنەفەرەکان وەردەگیرێن بەلگەیە لەسەر تەداخولکردنی ئەم هێزانەو هەروەها گرتنی جاسوسی بیانی.

**پرسیار/** ئایا باوەرتان وایە کە دژە شۆڕشەکان ڕوبکەنە کاری پارتیزانی؟

**وەلام/** ئەگەر دەولەت لەڕووی سیاسی و هەم لەڕووی نیزامیەوە لەگەل دژی شۆڕشەکان نەجەنگێت بێگومان گرفتاری ئەم ئاشوبە دەبێت.

**پرسیار/** بەڕای ئێوە چارەسەری مەنتقی لەبەرامبەر ئەم روداوانە هەر ئەو رەفتارەیە کە دەولەت لەکاتی شۆڕش پیادەی دەکات؟

**وەلام/** بەداخەوە نەخێر، رەفتارێك کە ئەم دەولەتە هەیەتی لەڕووی سیاسی و تەبلیغاتی تەقریبەن ڕێگەپێدراوە، سەرەتا ڕاستیەکان بەتەواوی پیشان نادرێت، هەروەها لەپیشاندانی ڕاستیەکان لە هۆکارێك سود وەردەگرێت کە خەلك هۆشیار بکەنەوە، کەخەلك زانیان ڕاستیەکان چۆنە زۆر زوو بێدار دەبنەوە و دووەمیش لە چاودێریکردنی هێزەکانی دژی شۆڕش جۆرێك ئاسانکاری هەیە کە کەمتر بۆ دەستگیرکردنی ئەوان هەول دەدەن، سێیەمینیش کاتێك کەسێك لەمانە دەستگیردەکرێت تێدەگەن کە کوردنین یان کوردن.

**پرسیار/** پرسیارێك دێتە پێشەوە کە دەگونجێت لەگەل ئەم مەسەلانەدا پەیوەندی نەبێت، بەلام لێرەدا پێویستە بوترێت کەزۆریش بێ پەیوەندی نییە، ئەویش ئەوەیە چ هۆکارێك زیاتر لە هەموشتێك هۆکاربووە کە گەنجانی کوردستان ڕوو لەقوتابخانەکانی نامەزهەبی و مادی بکەن؟

**وەلام/** سەرەتا دەبێت ڕونكردنەوەیەك بدەم، كە سوپاس بۆ خوا بەو جۆرەش نییە، كەگەنجانی كوردستان دووچاری ئەم لادانە فیكرییە بوبنەوە، لەڕاستیدا چەند دەرسەدێكی گەنجان هەن گرفتاری ئەم لادانە بوون، بەلاّم هەر دەنگویاس لەم بارەیەوە زیادبوو بەو شێوەیە ناسران كە هەن ئەم گروپە ماركسیستانە لە ڕاستیدا تەنها هۆكاری پێشڕەوی خۆیان و پروپاگەندەو درۆ و خەڵەتاندن ئەناسان و نەكاری جدیو ڕاستو كەڕۆشن فیكری و نەگەڕان و بانگكردنی خەڵكی بە پاكی، هۆكاری ئەوەی كە بۆچی زیاتر لەهەموو ناوچەكانی ئێران گەنجانی توشی ئەم ئەفكارە مادیو دژی ئەخلاقیە دەبنەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو لە خاتردانەدا هەیە كە كوردستان چ زروفێكی هەبووە نزیكەی (١٪) خەڵك جاسوسی ڕژێمی ڕابردوو بوونو (٩٩٪) كە دەمایەوە بێلایەن بوون و ژێردەستەی ئەو (١٪) بوون، چونكە ڕژێمی ڕابردوو تەواوی دەسەلاّت و پێداویستی و ئیمتیازاتەكانی خستبوە ژێردەستی ئەم (١٪) ئەوانی كەش جگە لە ژێردەستەی ئەمانە چارەیەكی كەیان نەبوو لە ناو ئەم(٩٩٪) یەدا مرۆڤی بەئیمانی زۆری تێدابوو هەتا زۆرینەشیان بەڕاستی ئیماندار بوون، هەروەها كەسانی خوێندەواریشی بەشێوەیەكی ڕێژەیی لەناویاندا بوو، بەلاّم هەتا دەسەلاّتی سەربەرزكردنەوەو هەتا ئازادانە بیركردنەوەیان لەبەرامبەر دەسەلاّتی ئەم (١٪) و دەسەلاّتی ڕژێمدا نەبوو. لەیادتان هەیە كەساڵەها(مەلاكان) یان (پیاوانی ئاینی) بەڕاگەیاندنە جۆراوجۆرەكانیان ئێمەیان خستبووە ژێر ڕكێفی خۆیان كە هەتا گەنجانی خوێندكاریش نیگەران بوون لەوەی هاتوچۆیان هەبێت، چونكە وتەی مەلاكان ئەم قسەی بەهەموو كۆمەڵگا قبوڵ كردبوو، كە فلاّنی مورتەدە(هەڵگەڕاوە)، دووڕوە، كافرە و شتی لەم بابەتانە، هەتا ئەو گەنجانەی كەلەم سالاّنەی ڕابردودا لەگەڵ من ئاشنا بوون لەخێزانەكانیان ڕقیان

هەڵگرتبوو لەلایەن خێزانەكانیانەوە تورەكرابوون و بەگشتی هێزە جۆراوجۆرەكانی دژی شۆڕشی ڕژێمی پێشوو سەرەڕای ڕاگەیاندنە خراپەكانیان دژی پیاوانی ئاینی كوردستان كەنەمان توانی بەهەموو گەنجانی كۆمەڵگا خۆمان بەئیسلامێكی شۆڕش گێڕ بناسێنین، ئاساییە كەگەنجی دەرس خوێن كاتێك ئیسلامی ڕاستی ناناسێت دەبێت لەو ئیسلامەی كە مەلاكان دەیبەستنەوە بە دەزگایەكی تایبەت ڕقی لێبێتەوە.

**پرسیار/** ئیمام خومەینی چەندجار ڕایان گەیاندووە لەنێوان مەزهەبە ئیسلامییەكاندا هیچ جیاوازییەك نییە، و هەتا وتویەتی هەر كەسێك پێچەوانەی ئەمە ڕابگەیەنێت دوژمنی ئیسلام و ئێرانە. بەپێی وتەكانی ئیمامی خومەینی ئایا قانونی ئەساسی ئایندەی ئێران لەسەر ئیمتیازاتەكان و بەش بەش كردنەكان هێڵی هەڵوەشاندنەوە دەكێشێت؟

**وەڵام/** بەداخەوە پیاوانی ئاینی دنیای شیعە گرفتاری دەردێكن، كەپیاوانی ئاینی كوردستانیش توشی بوون. لە بەرامبەری بەرەی شۆڕشی ئیسلامی ئیمامی خومەینی بەرەی نا ئینقلابی و هەڵگەڕاوەكانیش هەن، وەڵامی ئەم پرسیارە پەیوەندی بەوەوە هەیە، بەگشتی ئەم هێزە كۆبووەوانە لە مەجلیسی(خبرگان) تاچ ئەندازەیەك شەهامەتی ئەوەیان تێدابێت لەزیندوكردنەوەی ئیسلامی ڕاستەقینەو كێشانی خەت بەسەر جودابونەوەدا سەربكەوێت.

# دەقی بەلاغی كۆتایی شورای مەركەزیی سوننەت( شمس )*

**یەكەم:** بەپێی ناوەڕۆكی ناوخۆی كاتی (شورای ناوخۆی سوننەت-شمس)، یەكەم كاری بریتییە لە هەوڵدان بۆ زیندوكردنەوەی ئومەتی یەكگرتووی ئیسلامی، و وەلانانی دیمەن و دیاردەكانی دووبەرەكی لەنێوان ئەم ئومەتەدا.

**دووەم:** هەوڵدان بۆ یەكڕیزكردنەوەی ئەهلی سوننەتی ئێران بەرەو یەكبوونی ئیسلامی.

**سێیەم:** پێكهێنانی شوراگەلی سەر بەشورای مەركەزی سوننەت لەشارو ناوچە سوننی نشینەكاندا، لەكەسانی مەرجدار، تاببنە ئەلقەی پەیوەندی نێوان خەڵكی و شورای مەركەز.

**چوارەم:** هەوڵدانی بەردەوام و سەرەمڕ بۆ هەڵگرتنی ستەمی مەزهەبیو نەتەوایەتیو چینایەتی لە سەرانسەری ئێراندا لەسەر ئەهلی سەننەت، بەهۆی چاكسازی لە بینەما جۆراوجۆرەكانی یاسای بنەڕەتیدا، بەتایبەت بنەمای دووانزەهەم.

---

*) عەبدولا عەبدول عەزیز عەبدی: ژیاننامەی زانای گەورەی كوردستان مامۆستا ناصری سوبحانی، چاپی یەكەم، ل٩٤-٩٥




**پێنجەم:** كۆششكردن بۆ دامەزراندنی مەركەزێك لەتاران- وەك مزگەوتێك- بۆ كۆبوونەوەو ڕێكخستنی بۆنەكان و خزمەتە ئاینییەكان، وەك نوێژی هەینی و جەماعەت و وتارخوێندن.

**شەشەم:** هەوڵدان بۆ دامەزراندن و بەهێزكردنی قوتابخانە ئاینییەكان لە تەواوی ناچە سوننی نشینەكان، هەروەها كردنەوەی خولی كارگێڕی بۆ مامۆستایانی تەعلیمی ئایینی.

**حەوتەم:** پێكهێنانی دەستەو گروپی جۆراوجۆر، لە كەسانی بڕوادارو مەلتەزیم بەئاگایی و زانیاری گونجاوەوە، بەمەبەستی كاری تەبلیغات لەتەواوی ناوچەكانی ئەهلی سوننەتدا.

**هەشتەم:** ڕێكخستنی دەستەیەكی تایبەتی بەتوانا بۆ نوسینەوەی تەعلیماتی ئایینی قوتابخانەكانی ئەهلی سوننەت لەئێراندا.

**نۆیەم:** هەوڵدان بۆ ڕێكخستنی بلاّوكراوەیەكی هەمیشەیی، كە ڕەنگدانەوەی داواو ئاواتەكانی كۆمەڵگای ئەهلی سوننەت بێت.

**دەیەم:** هەنگاونان بۆ بەربەست دانان لەبەردەم سوكایەتی و جنێودان بە گەورەكانی ئیسلام،و گونجاندنی لە یاسایی بنەڕەتیدا.

**یازدەهەم:** هەوڵدان بۆ تایبەتكردنی چەند كاتژمێرێك لە شەو و ڕۆژدا، لەكاتی پەخشی ڕادیۆو تەلەفزیۆنی سەرانسەری و خۆجێیی، بۆ بەرنامەی تەبلیغاتی ئاینی ئەهلی سوننەت، لەژێر چاودێری ئەم شورایەدا.

**دوازدەهەم:** دامەزراندنی پێشنوێژانی هەینی و حاكم شەرعییەكانی تەواوی ناوچە سوننییەكان، دەبێ بەپێیی ڕای خەڵكی ناوچەكە، و پەسەندكردنی ئەم شورایە بێت.

**سێزدەهەم:** هەوڵدان بۆ كۆكۆدنەوە و خستنەگەڕی سامان و داهاتی موسوڵمانانی ئەهلی سوننەت، لەبواری وەبەرهێنان و خزمەتی ناوچەكانیان، بەمەبەستی بەرەو پێشبردنی ئامانجە ئیسلامییەكان.

**چواردەهەم:** هەوڵدان بۆ پەیوەندیكردن بەتەواوی موسوڵمانانی تری ئێران و جیهانەوە، بەمەبەستی تۆكمەكردنی بناغەی یەكبوون و برایەتی ئیسلامی، بەتایبەت سود وەرگرتن لە هاوكاری كەسانی ئاروزوومەند بەبەرنامەی كاری شورای مەركەزی سوننەت.

**پازدەهەم:** هەوڵدان بۆ ناردنی كەسانی بەتوانا بۆ ناوەند ئیسلامییە جیهانییەكان، بەمەبەستی وەرگرتن و فێربوونی زانست و زانیارییە ئیسلامییەكان.

**شازدەهەم:** بەپێی پێشنیارو پشتگیری تەواوی بەشدارانی ئەم كۆبوونەوەیە، بڕیارەكانی شورای مەركەزی سوننە، دەبێ لەژێر چاودێری و بە ڕەزامەندنی جەنابی زانای بەتوانا ئەحمەدی موفتی زادەو جەنابی مەولەوی عەبدولعەزیز(ڕەهبەرانی ئەهلی سوننەتی ئێران و دامەزرێنەرانی شورای مەركەزیی سوننەت)دا واژۆ بكرێن.

**والسلام علیكم ورحمة الله**

دەستەی بەڕێوەبردنی كۆبوونەوەی

(مراجع) و زانایانی ئەهلی سوننەتی ئێران

*****





كاك ئەحمەدی موفتی زادە     كاك فاروقی فەرصاد







ئارامگای خوالێخۆشبوو سەركردەی شەهید(كاك ئەحمەد)لە سنە

## ئەو سەرچاوانەی سودیان لێ وەرگیراوە:

* **قورئانی پیرۆز.**

١. ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شیعری(دیاریێ بۆ یاران)، چاپی یەكەم، زستانی ١٣٨٦.

٢. ابن قیم الجوزی: ئاوێنەی دڵ((الفوائد))، و.فەرمان عەزیز نەجار، چاپی یەكەم، بەیروت، ٢٠٠٨.

٣. بارام صەفی زادە: ئیخوانەكانی ئێران گرەو لە دیموكراتو كۆمەڵەو ئەوانی تر دەبەنەوە؟! گۆڤاری(ئیسلام پۆست)، ژ.٧، ئایاری ٢٠٠٩.

٤. بهزادی خۆشحاڵی: علامە احمد موفتی زادەو كردستان،(روزهای كردستان بحرا٤).

٥. بورهان محمد ئەمین: كاك ئەحمەدی موفتی زادە(دڵسۆزی كوردو كوردستان)، گۆڤاری(پەیامی ڕاستی)، ژ.٧٩، بەهاری ٢٠٠٧.

٦. ئەحسین حەمەغەریب: دواینەكان، چاپی یەكەم، ٢٠٠٧، چاپخانەی یاد، سلێمانی.

٧. دەزگای بەرهەم بۆ بلاوكردنەوەی بەهەمەكانی سوبحانی: شەهیدی ئازادی بیروڕا(مامۆستا ناصری سوبحانی)، كتێبی یەكەم، چاپی یەكەم، ٢٠٠٦.

٨. سیلینا بلیدوسكا، جوتاسان بلوتش: جەنگی هەواڵ گیری نێوان دەزگای هەواڵگیری ئەمەریكاو ڕوسیا(جەنگی ساردیCIA-KGB)، و.هێرش هەورامی، بەرگی یەكەم، چاپی یەكەم، ٢٠٠٩، بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان.

٩. شعبا نعلی لامعی: حیکایت های از زندگی دکتر علی شریعتی، چاپی پنجم، ١٣٨٤، مرکز پخش، موئسەی گسترش، تهران.

١٠.چاوپێکەوتن لەگەڵ (مامۆستا بورهانی حاجی هادی)، هاوڕێی(مامۆستا ناصری سوبحانی)، ١٠/١/٢٠٠٩، کوردستان/عێراق، سلێمانی.

١١.چاوپێکەوتن لەگەڵ(کاك حەسەنی ئەمینی)، عضوی مکتب کردستان، مانگی ٨ی ٢٠٠٨، ئێران، سنە.

١٢.چاوپێکەوتن لەگەڵ(مامۆستا بورهانی ئەمینی)، هاوڕێی (کاك ئەحمەدی موفتی زادە)، مانگی ٢/٩/٢٠٠٩، کوردستان/عێراق، سلێمانی.

١٣.چوپێکەوتن لەگەڵ (مامۆستا سیف الله)، هاوڕێی نزیکی (شەهید مامۆستا ناصری سوبحانی)،٢٩/٨/٢٠٠٨، ئێران، جوانڕۆ.

١٤.گۆڤاری راه ما، بلاْوکراوەی ناوخۆی(مکتب قران کردستان)، ژمارەکانی(١ تـــا ١٠).

١٥.گۆڤاری لڤین: چاوپێکەتن لەگەڵ(سەلاحەدینی موهتەدی)، ژمارە، ٨٠.

١٦.عبدالله عبدالعزیز عەبدی: ژیاننامەی زانای گەورەی کوردستان(مامۆستاا ناصری سوبحانی)، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨.

١٧.کاك ئەحمەدی موفتی زادە: یەکبوونی ئیسلامی، و.یاسین حەمەسەعید، گۆڤاری هەژان، ژ.١٧و١٨، ,٢٠٠٥

١٨. مامۆستا ناصری سوبحانی:تەفسیری سورەتی یونس، چاپی یەکەم، ٢٠٠٩.

١٩.مامۆستا ناصری سوبحانی: لادانەکانی بەشەرییەتەو ژیانی موئمینانمە. سەروەت عەبدولاّ، چاپی یەکەم، ٢٠١١، چاپخانەی سیما

٢٠.مامۆستا هەژار: چێشتی مجێور، نووسیار، ماجد مەرەدۆخ رۆحانی، چاپی سێیەم، ٢٠٠٩، بلاّوکراوەی کتێبی میهرگان.

## كاسێتەكانی كاك ئەحمەدی موفتی زادە:

١.كاسێتی ژمارە (٧)،سخنرانی در مسجد(پیر محەمەد)(٨٠)،A.

٢. كاسێتی ژمارە(٦)، سخنرانی بۆكان، (٤٥)B.

٣. كاسێتی ژمارە(٦)، سخنرانی بۆكان، (٤٥)B

٤. كاسێتی ژ.(١٣)-(٢١٢)(چە زمانی با حكومتهای غیر ئسلامی جنگ ٥. مسلحانە لازم است)-A

٦. كاسێتی ژ.(٢).(١٧)، زبانی كوردی،B

٧. كاسێتی ژمارە(٧)،دربارە انقلاب فرهنگی،(٦٦)A

٨. كاسێتی ژمارو(٦)، حوكمەتی ئیسلامی، (٥٨)، A

٩. كاسێتی ژمارە(٢).درمورد چگونەگی حملە اعراب بە ایران.(١٩).A

١٠. كاسێتی ژمارە(٧)، وەزیفەی ئینسان لە مصیری تاریخەوە،(٧٢)B.

١١. كاسێتی ژمارە(١٧)،بحث وطن دۆستی و دلایل مانع كار سیاسی(ویدیو١٠)،(٢٥٨)B.

١٢. كاسێتی ژمارە(١٧)،مراسم مولودو سخنرانی:نفی امتیازات و منع هر گونە لقب وامتیازی برا خود، (٢٥٤)A.

١٣. كاسێتی ژمارە(١٦)،دیداری عمومی،(٢٤٧)-٢،B.

١٤. كاسێتی ژمارە(١٣)، راگە زن و شوهر، زمان ازدواج، حزب سازی وجودای از مردم.(٢١٧).B.

## پێگە ئینتەرنێتییەکان:

١. دەریا کاك ئەحمەد:

www.esmaeelyeh.blofa.com/post-١٠٠.aspx

٢.یوسف نداو: www.wikipedia.org

٣.جماعه الدعوه و الاصلاح فی ایران:www.wikipedia.org

٤.احمد منصور: شاهد علی العصر العلاقات الدولیه اخوان کما یرا یوسف نداو، الجزیره، حلقه الاول و الپانی ٢٠٠٨/٨

www.al-jeezira.net (google search)

٥. عیسا پژمان: من شۆڕشم هەڵگیرساند، خۆشم کوژاندمەوە. سامان حاجی کەریم، بەڵگەنامە، ٢٠١٠/٢/٥ پێگەی (www.kurdistanpost.net).

٦. لە پێگەی(ناجی کورد) سود وەرگیراوە بۆ دەستکەوتنی چەند دانەیەك لەوێنەکانی بەشی پاشکۆ.

تەنها بەناوی خوای گەورەو کاربەجێ

بۆ برەودان و خزمەتکردنی زیاتر بە ڕەوتی ڕۆشنبیری و هەست کردن بەو بۆشاییەی کە لە کتێبخانەی کوردیدا لە بواری ناساندنی گەورە پیاوان و بیریارانی مسوڵمانی کوردەوە هەیە, بیرمان لە پرۆژەیەکی لەو جۆرە کردەوەو بڕیارماندا ئەگەر تەنها هەوڵێکیش بوو لەو بوارەدا پرۆژەی (٥٠) کتێب لەسەر گەورە پیاوانی کوردو ئیسلام و خاوەن مەکتەب و هزرو بیریارو سیاسەتمەدارو خاوەن قوربانی و هەڵوێستی بەرزو ناوازە کارێك بکەین, هەر بۆیە پرۆژەکەشمان ناونا((**پرۆژەی ناساندنی گەورە پیاوانی کوردی مسوڵمان**)),لێرەشەوە ڕایدەگەیەنین هەر بەرێزێك دەتوانێ نوسینەکەی (بەرهەم)ەکەی بنێرێت بۆمان , ئەوا بەپێی ڕێکەوتنێك لە نێوانماندا لێی وەردەگرین وپاش پەسەندکردنی دەخرێتە پرۆژەکەوە . ئەو گەورەپیاوانەش کە لەبەر چاومان گرتوون لە دەستپێکی کارماندا(کاك ئەحمەدی موفتی زادە- کاك ناصری سوبحانی-مامۆستا سەعیدی نورسی-مەلای گەورە – مامۆستا شێخ محمد خاڵ-شێخ ئەحمەد زەهاوی-مامۆستا محمدی شارەزووری...هتد)),وە هەرزاتێکی دیکە کەلەو بوارانەدا پەرێزیان دیارە و خزمەتیان کردووە.

خوای گەورە گشت لایەك موفەق بکات

پرۆژەی ((ناساندنی گەورە پیاوانی کوردی مسوڵمان))

خاوەنی پرۆژە/ سەروەت عەبدوڵڵا — کاوە پێنجوێنی

٢٠١٤/٣/٨ — ٢٠١٤/٣/٨



برا ئێرانییەکان، خوشکە ئێرانبیەکان!
هاودەردین شوکور بۆ خودا هیچکاممان لەویترمان جێنەماوە. هەموو
لە ئەم زەمان و حەیات و جولـەیەدا زەجر و ئێش قبوڵ دەکەین و تەحەمول دەکەین، بەڵام برا ئێرانییەکان لـەبیرتان دێت ئێوەش زوڵمتان کێشاوە لـەم مێژووە نەنگینەدا و ئێمەش زوڵممان کێشاوە، ئەگەر بە ئومێدی خودا ئەو دەورانی زوڵم و ستەمە لە بەین چوو و نابوت بوو، ئەم تاغوت و ئیستیبدادانە روخان و وێران بوون شەراکەتەکەتان لـەبیر نەچێتەوە، میلـلـەتی کوردستانتان لـەبیر نەچێتەوە. میلـلـەتی کورد هەروا هاو دەردی ئێوەیە لـە هەموو دەردەکانتاندا، ئا ئەو دەردە گەورەیەشی هەیە، کە دەردی مەحرومیەتە لـە مافی نەتەوەیی خۆی.

لە وتەکانی کاك ئەحمەد







ژمارەی سپاردنی ( ١١٢٥ ) ساڵی ( ٢٠١٠ ) ی پێدراوە.